**پێشکەشە..**

**بە دایکم.. ئەو دایکەی کە بێزوی بە کوڕێنی منەوە کرد و منیش بووم بە باعیسی سووتانی ئەو.**

**بە کانی.. ئەو کانییەی دونیامی پڕکرد لە جوانی.**

## (منداڵێك لە مەملەكەتی باوكەكاندا)

ئەمشەو چاوەكانم چاوی پشكێنەرێك بوون بە وردیی (منداڵێك لە مەملەكەتی باوكەكانـدا)م پێخوێندەوە، وشە بە وشە، دێڕ بە دێڕ و ستوون بە ستوون سەرەن و كەو و تەتەڵـەم كـرد، دوایـی هەرچۆن دایكێك پاش نۆ مـانگ و نـۆ رۆژ، هـەڵگرتنی كۆرپەكـەی لـە منداڵدانیـدا، لـەناكاودا باریكەژانێك دەیگرێت و بەرەبەرە ژانەكە قورس و قورستر دەبێت، ئینجا بە چەند قـەوەتكردنێكی پڕوكێنەر منداڵەكەی لێجیادەبێتەوە، هەر خۆیشی دەبێتە مامان و بە لەتە موسێكی تیـژ نـاوكی دەبڕێت و بە ئەوپەڕی شێنەییەوە قوماتی دەكات و گۆی مەمكی دەنێتـە دەمـی تـا تێـر ژەكـی دەكات، كە دڵنیا دەبێت لە ساغ و سەلامەتی مەلۆتكەكـەی، بـە سـەر كەلـە بێژنگێكـەوە، بـە تەنیشت خۆیەوە دەیخەوێنێت و خۆیشی بەدەم وردە ژانەوە رادەكشێ و خـەوی لێدەكـەوێ، منـیش رێك وەك ئەو دایكە زەیسانەم كرد، دوای شەونخونیی و ژان و خۆخواردنەوە، كە لێبوومەوە وشەی (تەواو)م خستە نێو جووت كەوانێكی مەحكەمەوە، ئینجا نووسینەكەم پێچایە فایلێكی نوێـوە و لە ژوور سەرمەوە دامنا، ئیتر هەر ئەوەندە خۆش بوو سەرم خستە سەر سەرینەكە و پێم راكێـشا، ناسودەییەكی بە لەززەت وەك پارچە ئاوریشمێكی نەرم و نۆڵ و تەنكی بەهار رەنگ خۆی كێشا بە سەر رۆحمدا و ئەسپی خەیاڵ هاوێـشتمیە سـەر پـشتی خـۆی و بەهـەوراز و نـشێوی رۆژگـارێكی پڕمەینەت و مەحەبەتتدا بردمییەوە.



دەمەو ئێوارە بوو دەوروبەر تاریك داهات، شەو لەناو بێدەنگییەكی قووڵدا تەواو رەشی پۆشی، هەستێرەكان لە قووڵایی ئاسمانـدا برێكیـان وەك پـشكۆی دار بـەرووی نـاو كوانـووی رەشماڵێكی كۆچـەریی ئـەو بنـارە، كـە كزەبایـەك دەیگەشـێنێتەوە ئاوەهـا دەگەشـانەوە، برێكیـشیان دوور دەبریسكانەوە و لەچاو ون دەبوون، ون بوونێـك دەتگـوت چـاوی هـەزاران هـەزار مرۆڤـی دیلـە و لەبیابانێكی دوور دوورەوە، مەگەر هەر خودای خاوەن هێز و توانا رێـی تێبردبێـت و خەمـساردانە لێیڕوانیبێتن و بەبێ ئەوەی هیچ كاردانەوەیەكی هەبووبێت بۆ رزگاركردنیان، لەكاتێكـدا ئەومرۆڤـە بەخسیرانە دەركیان بە ئەو حەقیقەتە كردبێت و تەسلیم بەو واقیعە بووبێتن، كە ئیتر رزگاربوونیـان مەحاڵە، مرۆڤگەلێك ئێستا یا تاوێكی تر وەكو گەڵای پاییز بەدەم رەشەبایەكەوە هەڵدەوەرێنە سەر زەوی و دەرژێنە ناو كەند و ئاودرەكان و دوور لە چاوی ئازیزانیان دەبـن بـەژێر لمـەوە. لـەژێر ئـەو

ئاسمانە سامالەدا کە دەتگوت ڕێوییەکی زلە و زەبەلاحی خورافیی بە زمانی لووس و تەڕی تیلماسکە هەورەکانی ئەو ڕۆژەی لستووەتەوە، لەناو ئەو کپی و بێدەنگییەدا، گرمەیەك ژوورەکەم دەلەرێنێتەوە، گورج دەردەپەڕمە دەرەوە و سەردەکەومە سەربانی ماڵە دوورە شارەکەم. بەسووره سەردەکەومە سەر ئەو کەلاوەیە کە خەڵکانێك دەیانگوت: (ئەو کابرایە شێت بووە لەو دەشتەدا کۆڵێك منداڵی ڕەش و ڕووتی ئاخنیوەتە نێو ئەو چوار دیوارەوە، نە لە دز و دەخەڵ دەترسێ، نە لە ئەو تۆپەڵە مێشوولەیە کە ئێواران وەك دووکەڵی چڕی دەم تەنوور بەرەو ئاسمان لوول دەخوات و بە تەوژم شۆڕدەبێتەوە بۆناو کەلاوەکە و تا بەیانی دەم لە خوێنی ئەو منداڵانە دەژەنێت. ئاخر ئەو پیاوە خۆ دەیتوانی وەك خەڵکانی تر، خانووی ڕەفیق حیزبییەك، یا جاشێکی داگیر بکردایە، ئەی نازانم بۆ نەیکرد ؟؟!! کەسی تریش هەبوو دەیگوت: (وەڵڵا من لە جیاتی ئەو بوایەم نیوەی شاری "کەلار"م داگیر دەکرد. (دەچمە سەر بانی ئەو تاکە ژوورە کە لە ناو حەوشەیەکی گەورەی تێلبەنکراودا قوت کراوەتەوە، ئەو حەوشەیە، کە بە کەرەوز و تەڕەتوورە و کەوەر دەیچێنم و چەن ڕۆژ جارێك دەیدوورمەوە و دەسك دەسکی دەکەم و لە بازاڕدا بە چەن دینارێك دەیفرۆشم تا یەك دوو کیلۆ شەکەر، یان کەمێ گلاّ چای پێدەکرم و دەیدەمە دەم میوانە ناوەختەکانمەوە، کە دێن بۆ سەردانیم، دەچمە ئەو سەربانە و دەڕوانم ناو جەرگەی شار گڕی گرتووە، وردەوردە کۆڵان و شەقامەکان پڕ دەبن لە هەلاّ و بیگرە و بەردە، ماڵ لەدوای ماڵ دەشڵەژێت، تۆ کە گوێت لە ئەو هەرا و زڵەزڵە بوایە هەقت بوو بیرت بۆ سەردەمی عوسمانلیی و عەقڵییەتی خێلەکی ئەو سەردەمە بڕۆیشتایە، بیرت بۆ ئەو شەوە بچووبایە کە کەسوکاری (حەبیبە) لە فەرمانی سوڵتانی (ئەستانە) و خەلیفەی ئیسلام خۆ دەدزنەوە و سەرقاڵی شاردنەوەی ئەو شاجوانەی عەشیرەتی (جاف)ن تا بەر دەس جەندرمەکانی سوڵتان نەکەوێت و مەلا ڕیش ماش و برنجییە عاشقەکەی (خاکوخۆڵ)ی پێشاد نەبێت. ئەو شەوە فیشەکە شێتەیەکی ژەنگاوی بەدەست و پەنجەی عەقڵێکی ئفلیج و بە شارنامۆ دەتەقێتەوە، هەر ئەو تەقەیە بوو شاری تووشی فێیەکی کوشندەکرد. بۆنی باڕووت و دووکەڵ ئاسمان دەتەنێتەوە و منیش وەك شار دەشڵەژێم و بیرکردنەوەم پەرت دەبێت، دوای ئەختێك ددان بەخۆدا گرتن دەچمە ژوورەوە و خۆم دەپێچمەوە، ئاخر لەو شارە بێحاکمەدا کێ دەڵێت نەفامێکی کورتبین بەردێك ناهاوێتە کەلاوەی بێحەوشەی منیشەوە؟ لەم بیرکردنەوە و تاوتوێکردنەدا بووم یەکێ لە ئاسیاوە دڵسۆزەکانم خۆی گەیاندە لام، (کێ دەڵێت ئەم گۆڵمەزە پای تۆش ناگرێتەوە؟ هەڵسە با بڕۆین بۆ ماڵی ئێمە، لەوێ تەکبیرێك دەکەین)، ئەو وای گوت و منیش سەری ڕەزامەندیم بۆ لەقاند.

ماڵی ئەوان بۆ من حەشارگەیەکی دوور لە گومان و ئەمین بوو، لەوێ بۆ ماوەی زیاد لە هەفتەیەك (حەمەدۆك)ی یەشار کەمال هاوڕێی گیانی بەگیانیم بوو، لێمدانەبڕا، شەوانەش هاوڕێی خانەخوێی شەکەت و ماندووم بە تەنیشتمەوە، هەر ئەوەندە خۆش بوو سەرینەکەی دەخستە ژێر سەری و پێی رادەکێشا، وەك ئەوەی خەو لەمشتیدا بێت، لەپی دەکردەوە و خەو دەیبردەوە. ئەو رۆژانە بەلای (رێوان)ی تەمەن سێ چوار ساڵییەوە (مــن) بوونــەوەرێکی ســەیر و سەرسوڕهێنەری نامۆ بووم، چونکە ژوورێکم داگیرکردبوو، کە جێگەمەی رۆژانەی ئەو بوو ئێستە لێی قەدەغە کراوە و دەرگاکەی لە ژوورەوە دادەخرێت و ئەویش وڕکی لای ئەو غەریبە دەگرێت، کە دەڵێن کەسی لێ نییە دەست بۆ پێڵاوەکانم رادەکێشێت و دەیانکات بە شایەتی بوونم لەو ژوورەدا. جارێك بە نیازی هەڵخەڵەتاندنی، لەگەڵ چوونە ژوورەوەمدا پێڵاوەکانم گرت بە دەستەوە و بەدەم خواحافیزییەوە دەستم بۆ پەنجەرەکە راکێشا و وتم: ( رێوان گیان ها ئێستا لە ئەو پەنجەرەوە دەردەچمە دەرەوە و دەڕۆم، خواحافیز).. رێوان بەچاوە گەش و زیتەکانی تێمدەڕوانێت، لەناو تەماشاکردنەکەیدا بێباوەڕییەکی گەورە دەخوێنمەوە، وەکو ئەوەی بڵێت: ئەگەر لە هاتنی ناوەخت و مانەوەی درێژخایەنی تۆ لەم ماڵەدا هیچ حاڵیی نەبم و نەتوانم گرێ کوێرەی ئەو نهێنییە بکەمەوە، ئەوا ئەوەندە دەزانم ئەو پەنجەرە بوونەوەرێکی زلی وەك تۆ ناکێشێت، هەی درۆزن..! ئەگەر ژوورەکەم بۆ چۆڵ ناکەیت وەرە ببە بەهاوڕێم و گەمەم لەگەڵدا بکە. دوور لەخواستی رێوان دەچمە ژوورەوە، هەر ئەوەندە خۆشە تا دەرگاکە لە خۆم دادەخەم، ئیتر ئەو منداڵە راستگۆ و بێفرت و فێڵە وەکو چۆلەکەیەك هێلانەکەی رەشمارێك داگیری کردبێت و لە ژوورەوە بفیشکێنێت، چۆلەکەکەیش لە حەپەتدا دەس دەکاتە باڵە تەپێ و جریواندن، رێوانیش ناوا دەیقیژاند و وڕکی لای منی دەگرت، جاری وابوو ململانێیەکی سەختی دەس پێدەکرد و کۆڵی نەئەدا، دەرگاکەی ئەدایە بەر مشت و پێلەقە، دەرئەنجامیش سەردەکەوت و ئێمەش چۆکمان بۆ خواستەکانی دائەدا، ئەوە حاڵی من و رێوان و حەمەدۆك بوو تا شەوێ مرۆڤێکی پاك و بێگوناە و رۆح سووك یەکەم قیژەی دایە بای گوێمدا و ئێمە هەردووکمان بووین بەدوو میوان، (هێلین) خانی شەنگ بوو بە میوانێکی هەمیشەیی ماڵ، ئیتر من خۆم بە میوانێکی بارگران و مانەوەیشم بە بێمانا دەهاتە بەرچاو و دەبوایە خۆم بەلایەکدا ساغ بکەمەوە، بۆیە دوور لە خواستی خانەخوێکەم ماڵئاواییم کرد و خۆم دایە دەست قەدەرەوە.



دەمەو بەیان، دونیا تاریك و ڕۆشن بوو، لە ماڵ دەرچووین بە کۆڵانە باریك و تەسکەکانی شاردا، هێمن هاوڕێی چاوساغم کەوتە پێشەوە و سواری یەکەم پاسی سلێمانی بووین، پاش دوو سەعات ڕێگا برین پاسەکەمان ڕاگرت و دابەزین، لەوێشەوە کاتژمێرێك ڕێمان بڕی تا گەیشتینە سەر دەریاچەیەکی پڕ شەپۆلی نوستوو، بەسەر ڕۆخی نیمچە ئارامییەوە دانیشتم و خۆی گەڕایەوە. یەکەم شەو لەو نویٚ مەنزڵەدا و لەناو پێخەفی خەوتنمدا تا دەمەوبەیان بە ئەمدیو و ئەودیودا هەڵپلامەوە و خەو نەچووە چاوم، بۆیە لەناو جێگاکە دەرپەڕیمە دەرەوە و ڕۆیشتم کەمێك ئەولاتر بەسەر بەرزاییەکەوە دانیشتم، ئەگەر ئەزموونت نەکردووە، پێش مەلابانگدانی بەیانیان، بەرلەوەی ڕۆژ قۆڵی خۆی هەڵبماڵێت و لەپی سپیی درێژ بکات لە ئاسۆوە ڕەشایی ئاسمان ڕابماڵێت، لەناو پێخەفەکەت دەربچۆ و بە گوێچکەی ڕۆح، گوێ لەدەنگەکانی ناو کپیی دەور و بەرت بگرە، ئەگەر هاژەیەکی بەسامت بیست، بزانە ئەوە دەنگی فوارەی خوێنە لەشوێنێکدا دەڕژێت و جەلادەکانی نایبسێت، بۆ دوورتر گوێ هەڵبخە، هەناسەی گۆی زەوی دەبیستیت پشووی سوارە و وا خەریکە دیسان خۆی ڕێك دەخاتەوە.. بەچاوی ڕۆح تەماشاکە هەزاران ڕۆح دەبینیت ئالوودەی تاریکین و بە تیلماسکێك تیشکی لاواز کوێر دەبن.. دوورتر بڕوانە لەم تاوسانەی لای ئێمەوە زۆر دوور بڕوانە دەبینیت، لەسووچێکی نادیارەوە گەواڵ گەواڵ هەور کۆدەبێتەوە و دادەکاتە باران و پەڵە ئەدات، ئەوەتا من بۆنی باران و خاکی تەڕ و تامی ژیانێکی تازە دەکەم! من ئێستە بەقەد دووریی ڕێگای باپیرانم بۆ حەج دوورم لە سنووری ئارامیی، ئەوەندەی عەشقی (نالی) بۆ تەوافی کەعبەی ئەولای کانیی حەیای (حەبیبە) شەیدای دیتنی وەرزێکی بەهارم تا لەوێدا ڕۆحی ماندووم تێکەڵ بە ڕۆحی شەکەتی قەرەجانەی کوردەواریی بکەم، بەڵام بروسکەی خەیاڵم خۆی بە تاشەبەردەکانی سوورێنا دەکێشێ و شریخە لە بناری عەقڵم هەڵدەستێ، ئەوساکە بە خۆم دەڵێم، (وای چ ساویلکەیت! تەماشاکە چ مەرگەساتێك بەڕێوەیە، هاااهااا سەیرکە، لەو کارەساتە بڕوانە دەڵێیت گەلە گورگە لەناو ئەو تۆفانەدا بۆنی خوێنی کردووە و دەقروسکێنی) ئەوەتا هالاوی گەرمی گڕەکی سووتێنەر بەسەر ڕۆحمدا دێت و نازانم کام دارستان لە سووچێکی ئەم زەوییە گڕی گرتووە؟ نانا دوور مەڕۆ ئەوەتا لەپێش دەممدا، هێشتا بۆنی هەڵقرچانی جەرگ و دڵی ئەو شارە دەبیستم، بۆنی سیر دێ، بۆنی گۆگرد، هەتا ئەمڕۆش سەرتاپا جەستەی ئەو شارە بۆنی سێوی لێهەڵدەستێ، لەم لایشەوە، پاش ئەوەی شار وەکو قەقنەس لەناو خۆڵەمێشی خۆیدا هەڵسایەوە و خۆی لە تەپوتۆزی ڕەش و شینباو تەکاند، دوێنێ بوو ئەمبینی و بە خۆم دەگوت: ئاها سەیرکە، ئەو هەزاران کەسە چۆن بەناو یەکدا دێن و دەچن، بەسەر شەقامەکەدا سەر بەرەو ژوور دەڕۆن، کەچی یەکێك هۆی ئەم

کۆچەی خۆی ناپرسێت.. نازانێت قەدەر بەرەو کوێ پەلکێشی دەکات؟ کەس نایزانێت!! بە هەزاران مرۆڤ روخساریان هەمان روخساری پشتاوپشتیانە و شان لەشانی یەك دەسون و کەس مەرحەبایەکی گەرمی کەسێك ناکات! منداڵێکی تۆقیو ئەوەتا بەدوای دایکیدا هەڵدێت و پڕ بە گەرووی دەقیژێنێت، کەچی دایکی بە ئاستەم گوێی لێیەتی، گەورە پیاوێك بەرلەوەی گیان بسپێرێت، لەو لاڕێیەدا بەپێش چاویەوە گۆڕێکی بۆ لێدەدەن، ژنێکی دووگیان لەبرسانا لاکەی دڵی دێت و دەکڕووزێتەوە و داوای پارچەیەك نان دەکات، کەچی خورجێکی لێوانلێو لە کولیچەی چەور بەلایدا تێدەپەڕێت و ئاوڕیشی لێناداتەوە!! منیش لێرە کەس نامبیسێت، هاوار دەکەم کەس ناژنەوێت، لە کونی گوێی ئەم بنیادەمەوە خۆمی پیادادەکەم و لە ئەودیوەوە دەرئەچم، کەچی ئەو کەمێك گوێی راستی دەخورێنێت و نووکی پەنجە تووتەی دەکاتە کونی گوێی چەپیدا و تەکان ئەدات. لەناکاودا گرمەیەك و شریخەیەك بەدوایدا، خەلکەکە هەموو پێکەوە رادەچڵەکێن و بەناویەکدا دێن و دەچن، یەکێك دەپرسێت: مەدفەع بوو یا تەیارە؟ زۆر نزیك بوو، لەوانەیە بۆ هەڵبجە هەڵێدابێت، بۆ سەیسایەق؟ هاهاا راکەن راکەن سوپا بەدوامانەوەیە! هەڵێن جەیش هات.

هەموو هەڵدێن بەرەو چیا، چەخماخەیەك و هەورەگرمەیەکی دیکە، پاشان گرمەیەك لەگەواڵە هەورێکی رەشەوە کە سکی لەزەوی دەخشا، هەموو هێور دەکاتەوە. لەناو قوڕ و لیتەکەدا مردوویەك هۆشم گلێر دەکاتەوە، مردوویەکی ورگنی پۆشتە و پەرداغی سەر و سمێڵ بۆیاغ کراو، بەقەراغ ڕێگەکەوە شانی بەسەر ئۆتۆمبیلە تازە مۆدێلەکەیدا داوە و خەڵکێکی لێگلێر بووەتەوە، جگەرەیەکی مارلبۆرۆی بەلالێوەوەیە و دەڵێت: من نایەم، بۆکوێ بڕۆم؟ بەدوای کام درۆی گەورەدا سەرهەڵگرم؟ نانا من دەگەڕێمەوە بۆ شار، کێ لەگەڵمدا دێت با بێت، حوکمەت هەر تفەنگی زۆرە سریەیەك دەکەمەوە، ئەو کەسەی ئامادەیە لەگەڵ مندا بگەڕێتەوە بەخاوخێزانەوە دەیپارێزم، من لە فەوتان رزگارتان دەکەم، دەڕۆمەوە چەك هەڵدەگرم، ئەمریٚ وەلللا دەبم بەجاش.. وردەوردە خەلکەکە لێی دەتەکێتەوە.. منیش چلێ لە دار بەڕووی ئومێد دەگرم بە دەستەوە و دەڕۆم، دەچم نزیك دەریاچەکە بەتەنیایی لێیدادەنیشم تا دەوروبەرم تەواو لێڕۆشن دەبێتەوە، منێکی نابەڵەد بەرلە هەر هەنگاوانێك لەودەڤەرە نامۆیەدا دەبوایە ئەو ژینگە نوێیە بە وردیی بپشکنم، یەکەم جار لە رەنگ و روخساری ئاوی دەریاچەکەم روانی، ئاوەکەی شین شین خۆی دەنواند، هەر دەتگوت کراسی لەخومدراوی بەری ژنە کۆسکەوتووەکانی سەردەمی منداڵیی (کانیماران)مە، وەك نەخۆشێك زەردووی گرتبێت ئاوا تێر تێمڕوانی و هەڵسامە پێ، تەماشایەکی دەوروبەری خۆمم کرد و بەرەو دامێنی دەریاچەکە ملم نا، ئەو دامێنەی سەر بەرەوخوار، کە دەڕژایە کۆشی دەشتێکی

کاکی بەکاکیی، دەشتێکی پڕ لە خڕە بەردی روومەت برژاوی تینووی ناودەم رەش هەڵگەڕاوی وەك پەلاس، لەویێ بەدیقەتتر روانیم، رەنگی ئاوەکە لە رەنگی مردووی کراسی بەر پاشماوەکانی ئەنفال دەچوو، چەردەیەك رامام و دیققەتم دا هەتا ماندووبوونی رۆحم هەر تێمڕوانی، کە بە سەر خۆمدا هاتمەوە، زانیم دەبێت سەر بەرەوژوور ڕێگاکە ببڕم، دیسان بەرەودوا هەڵکشام و هاتمەوە ئەو جێگایەی کە هاوەڵە چاوساغەکەم بەجێی هێشتم.

خۆر تازە هەڵهاتبوو دەورووبەری دەریاچەکە و رووەمەتی شینی ئاوەکەی تیشکباران دەکرد، سێ رەگەز بوون، خۆڵی دەوروبەر بە هێمنی تیشکەکانی دەخواردەوە، ئاوەکە گەمەی لەگەڵ تیشکی زیوینا دەکرد و وەك پۆلەمەل لێکدەئالان و دەیانجریوان، ئاوێکی شینی ورینجەدار، رەنگی لە رەنگی کراسەکەی (کانی) دەچوو، ئەو کراسەی کە نزیکەی ساڵێك بەرلە ئەمڕۆ پۆشیبووی و من وەك نەناسێك لێمدەڕوانی، کەچیی (ئەو) رووبەڕووم هات و زۆر بوێرانە بەیانی باشی لێکردم ئینجا خۆی پێناساندم.. بەڵێ رێك رەنگی ئاوەکە، رەنگی کراسەکەی (کانی) بوو.

نزیك رۆخی لای رۆژهەڵاتی دەریاچەکە، بەسەر گاشە بەردێکەوە، کە شەپۆلی تووڕەی ئاو لاڕوومەتی رووشاندبوو دانیشتبووم، هەردوو قاچم شۆڕکردبووەوە و لە ئاسۆم دەڕوانی، ئاسۆیەك تا ئەمڕۆیش ناتوانم فەرامۆشی بکەم و تاچاوم هێزی تیا مابێت و دڵیشم تروسکاییەك روونـاکی لێیدەڕوانم. تیشکە زیوینەکانی خۆر لوتکەی شاخەکانی ئەمبەری تیشکباران دەکرد و وردە وردە وەك کرێوە، نەرم نەرم وەکو بەفر، داباریبە سەر رووەمەتی دەریاچەکەدا، تیشکەکان زۆر نەرمتر خۆیان لە رووەمەتی نەرم و سفت و سۆڵی ئاوەکە دەسوی، لەڕوانین تێرم نەدەخوارد، روانین لە ئاو، لە سەنگینیی بەرد و شیرینیی خاك، سەرمەرایی تینوێتی دووچاوم بۆ دیتن، جێگام بە خۆم نەدەگرت، پاش رامانێکی کورتخایەن هەستامە سەر پێ و دیسان چاوم گێڕا، خۆ دەبوو بەرەو دواییش ئاوڕێك بدەمەوە، بۆیە چاوم نا بە دووربینی پشوو درێژییەوە، روانیم لە ترۆپکی سەر شاخەکەی پشت سەرمەوە تا دامێنی بە دەوەن و دارەبەن و گوێژە و بەڕوو داپۆشراوە، حەزێکی نادیار، لەوانەیە حەزی بەدواداگەڕانی نهێنییەکان بێت، یان حەزی سەرکەوتن، یا خۆتاقیکردنەوە بێت بۆ گەیشتن بە سنووری توانا، لەوانەشە حەزی خۆدۆزینەوە بووبێت لەتەنیاییدا.. نازانم!! هەرچییەك بێت پاڵی پێوەنام تا بە ئەو شاخە تووش و سەختەدا هەڵبزنێم، کەمێك لێیوردبوومەوە، سەر بەرەوژوور هەڵکشام و بە بێ دوودڵیی و بەتەکانی گورج رووم تێکرد، تا گەیشتمە بنارەکە، هەتا نزیك دەکەوتمەوە شاخەکە سامناکتر خۆی دەنواند، بە باریکە رێگاکەدا چەند هەنگاوێك ملم نا، رێگایەکی بەردەلان بوو تا دەهاتیش پشتەوشکێن، بەلام من هەر لە پێشەوەچووندا بووم تا

گەیشتمە ئەو شوێنەی ئیتر ناشێت پەلەبکەم. چەند هەنگاوێکی تر ڕۆیشتم بەلاّم لە ترسی هەڵخلیسکاندابوو باوەشم کرد بە ناوقەدی یەکەم داربەڕوودا، پاش پشوودانێکی کورت دووبارە هێزێکم دایە بەر خۆم، بەلاّم قەدی دارەکە بە دەم دەستمەوە چەمییەوە، من دەترسام دارەکە بەرگەی ئەو تەوژم و هێزە نەگرێت، کە زاوەتە دەست و مەچەکم، بەلاّم بە وێنەی پڵنگێکی تاقانەی ناو دارستانێکی شێر پاوانکردوو، چنگم لە قەدی گیرکرد و بەرم نەدا، ئاخر لەئەم دەڤەری قەزاوقەدەرەدا تەنها دار بەڕووە بەرگەی ئەو هەموو ڕەشەبا و سووتان و داپاچینی دەستە خۆماڵیانە دەگرێت، بە ورياییەوە پێم لە بەردێکی چەقیو قایم کرد، بەردێك هەر دەتگوت کەللەسەری جەندرمەیەکی داگیرکەری سەردەمانی پاش ئیسلامە، لەوانەیشە کەللەسەری جەنگاوەرێکی تەرەبووی گریکیی بووبێت و (زەینەفوون ) لە دەفتەری یادەوەرییەکانیدا ناوی تۆماری نەکردبێت. گوڕێکی ترم دایە خۆم، وەکو یەکێك سەربەرەوژوور هەڵمکێشێت، یان وەك بێچووە کەوێك تازە باڵی فێری فڕین بووبێ، ئاوا خۆم لە ناوقەدی لێرەوارەکەدا بینییەوە. ئەم هەوڵدانەم سەرەتایەك بوو، ئەزموونێك بوو فێری کردم چۆن بە شوێنە جوان و سەختەکاندا هەڵبزنێم، چۆن ڕێگا دوور و ترسناکەکان قەدبڕ بکەم، ئا لەوێدا حیکایەتەکانی دایە گەورەم هاتەوە یاد، شەوێك لە شەوەکانی زستان بوو، تۆف و کڕێوە و ڕەشەبا لە دەرەوە وەك گەلەگورگ دەیانلووراند، ئێمەی منداڵ بەدەور ئاگردانەکەدا ئاڵقەمان بەستبوو، دانیشتبووین، ترس کنەی لە ڕۆح و دەروونمان دەکرد، کاتێك دایە گەورە کە لە سەرووی ئاگردانەکەوە دانیشتبوو، حیکایەتی بەسەرهات و شەڕی نێوان دوو تیرەی نەیاری بۆ دەکردین، باسی کوڕە ئازاکانی تیرەکەی خۆی دەمێ بنێشتی کوردیی بوو لە دەمیدا هەر دەیجوی و نەدەپڕوسکا، ئەو دەیووت و دەیووتەوە، (کوڕەکانم لە ڕۆژی تەنگانە و لێقەوماندا بۆ ئەوێ زوو قوو بکرێت بە قەوومەاو عەشرەت بخورۆشێنرێت، کوڕی ئازا و چاوئەترس و چاپووکی گەرەکە، کە لە ماڵ دەرچوو ئەوێ ڕێگا قەدبڕیکا، قەدبڕکردنی ڕێگایش هات و نەهاتە یان فریا ئەکەوێ یان ناکەوێ، تەنگپێهەڵچنین و بۆڕدانی دوژمن هەر کوڕی ئازای گەرەکە، یا تیائەچێ، یا وە سەربەرزیی ئەگەڕێتۆ ناو قەوم و هۆزی خۆی. پیاوی ترسنۆکیش خۆی لە قەرەی ڕێگای قەدبڕ نادا. "ئەوانە" وەك کەری ناو جۆگا وان لەمبەر ئەلەوەڕێن و لەوبەریش ئەلەوەڕێن، یان لە ناو ئەلەوەڕێن و لە پەڕ ئەخەون، هەر پیاوی ئازا و وە غیرەتیش قەدر و قیمەتی پیاوی ئازا و چاوئەترس ئەزانێ).

کە گەیشتمە ناوقەدی شاخەکە ڕوانیم هەر وا هێشووە قەزوانە و بە قەد پرچی دارەوەندا شۆڕبۆتەوە، لە کلۆری ناوقەدی گەورە داربەڕووەکانم ڕوانیی، بینیم هەنگوێن چۆڕاوگەی بەستووە و

بە جۆگەڵەیەکی باریکدا لابەلا دەڕوات، بە لێواری جۆگەڵەکەدا بەرەوپێش ملم نا، هەنگاو لە دوای هەنگاو خێراتر تەکانم دا، هەستم دەکرد سێبەری لێرەوارەکە فێنکتر دەبێتەوە، لە ڕۆیشتن و چوونە پێشەوەمدا پێم لە شێلانی شارە مێروولە و قارچکە سەگانییەکان و تەنانەت ئەو مۆرانانەش، کـە قرمیان لە هەڵکۆڵینی شادەماری ئەمامە تازە هەڵچووەکانیش خۆشکردبوو دەپاراست، من تـەنها مافی بەربەست دانانم لەپێشیاندا بە خۆم ئەدا و هەوڵم ئەدا هێڵێکـی سـوور لـە پـێش لووتیانـدا بکێشم، سەرەڕای هەموو ئەو گرفت و لەمپەرانە، کە دەهاتنە ڕێم بەبێ دوودڵیی دەڕۆیشتم و گوێم بەگیزوگازی مێشوولە بێزارکەرەکان نەئەدا. بە ئەو ڕێگایەدا دەڕۆیشتم، کە بـە دڕك تـەنرابوو بـە بێنەوەی دابنەومەوە و چەن دڕکێك لـەو دڕکـە سـەگدانانە کـە قـەپاڵیان لەپووزەوانکـەم گرتبـوو لێبکەمەوە. تا بەرەو پێشەوە دەچووم بۆنە کەسکوونەکانیش خەست و خەسـتتر دەبوونـەوە. بـۆنی قەزوان و بۆنی تورتی بنێشتە تاڵەی دارەوەن و بۆنی گوڵ و گیا و هەنگوین تێکەڵ دەبوون بە بـۆنی گەلا و ساقتی کەڵەگیا ژەهراوییەکان، کـە گەیـشتمە ئـەو مەنزڵـەی ئەشـیا زۆرتـر بیرکەمـەوە، هەستم بەماندوویەتی ڕۆحم دەکرد، شەکەتییەك جارناجارێك بە نووکی پەنجەی پەشـیمانیی تریـەی لە ناوێنەی دڵم هەڵدەسان، تریەیەك وام هەست دەکرد دەورووبەرم گوێی لێیەتی. زۆرکـات شـەوانە بیرم لەئەو سەفەرە دەکردەوە، کە دامە پێش خۆم. ڕاستە گەیشتوومەتە قۆناغێك ئیتر گەڕانـەوەم بۆ سەرەتا نەك هەر ئاسایی نییە، بەڵکو مەحاڵیشە.. بەڵام چۆن بزانم ئەم پشوودانی جەستەیە بـە ئازارێکی قورسی ڕۆحەوە چەند دەخایەنێت؟؟

(تۆ شمشاڵی خۆت فووپیادا دەکەیت و دەمرێنش ئاسا بە دڵ و بە گیان ئاوازی خۆت دەژەنیـت و گیزەی ئەو تۆپەڵە مێشوولەیە، کە بە سەرسـەرتەوەیە و بازەوجارێـك وەك مێزەرەکـەت لەسـەر و گەردنت دەئاڵێن، کەچی تۆسقاڵێك ناشڵەژێیت، ئەو باوەڕ بـەخۆبوون و هێمنییەیـە لـە کەسـانی بێزەوق و کەم سەلیقە جیات دەکاتەوە ). ئەوە قسەی لاوێکی تەماحاوی بوو پێدەچوو لە ئاینـدەدا شوێنێك بۆ خۆی قۆرخ بکات. قسەی جوان زوو جێگای خۆی لەدڵدا دەکاتەوە، سەرەڕای ئـەوەش سێبەری نیگەرانی و دڵەڕاوکە باڵی بەسەر ئەقل و ئاوەزما دەکێشا، بەڵام دەدانم بە خۆمدا دەگرت و خۆم نەئەدایە دەست دێوەزمەی ئائومێدییەوە. زۆرجار کە ئەو دێوەزمە سێبەر قورسە لێمنزیك دەبووەوە، خەریك بوو سواری سەرم دەبوو، کونجی ماڵی لێدەکردم بەزیندان! بۆ ئەوەی خـۆم لەئـەو بارە قورسە دەربازبکەم دەردەچـوومە دەرەوە و رووم دەکـردە ئـەو دەشـتەی کـە لـە دێرزەمانـەوە قەوماوەکان تۆمار دەکات و هەتا ئێستە کەسێك خۆی بەسـاحێبی نـەزانیوە. وەکـو مرۆڤێـك لـە سەرەتای شێتبووندا بێت لەپم ئەدا بە یەکدا و لەبەر خۆمەوە ئەدوام. ئاخر دەورووبەر بوو پاڵی پێوە

دەنام بە گومانەوە لەهەموو بزووتنێك بڕوانم، تاكوتەرا چەند مرۆڤێكی جوانی لێدەركە، ئەگینا هەقم بوو لە هەموو شت، تەنانەت لە سێبەری خۆمیش سڵ بكەمەوە!!

رۆژێك رووم كردە ئەو دارستانەی ئەوبەر، ئەوەی كە دەیگێڕمەوە، چیرۆكێك بوو كردمی بە بنێشتە تاڵەی ژێر ددانی زۆربەی ئەو كەسانەی كە بیستیان و بە هەڵە لێیحاڵیی ببوون، یان بە ئەنقەست و بە هەڵە خوێندیانەوە و بۆ مەبەستێكی گەوجانەی خۆیان دەیانشێواند. من خۆم چەندجارێك ئەو چیرۆكەم بەدەنگی بەرز خوێندەوە و دەیان جاریش دام بە گوێی (با)دا. یەك دوو رەشەبایش كە بیستیانەوە دابوویانە دەس گەردەلوول و ئەویش خۆی كردبووە ماڵی چەند كەسێكی چاوشۆڕدا!!

چیرۆكەكە لەناو هەڵچوون و داچوونی سەفەرێكدا بوو، كە دابوومە بەر خۆم و بارێكی قورسم خستبووە سەرشان. بارێك لەمس قورستر، رێگایەكی پێچاوپێچی پڕ لە گابەرد و تەیمانتەن بە تووترك. لەدوا قۆناغی ئەو سەفەرەدا ماندوویەتیی وەكو زاڵوو دەمی لە رۆحم ژەندبوو. لەو هەوراز و نشێوەدا بێپشوودان و بێناوڕدانەوە تەكانم دا. یەك پارچە جەستەم لەئارەقەدا شڵپەی دەهات. ئارەقە زەنگۆڵ زەنگۆڵ لە تەوقی سەرمەوە بەرەو شانومل و بەرەو خوارتر دادەچۆڕا. تینوویەتی هەر وەخت بوو زمانی دەشكاندم. ئاو دەمم بووبوو بە پەلاس و وێڵی دوای چۆڕێ ئاوی زۆلاڵ و سازگار بووم. وێڵ بووم بە دوای دارێ، بەردێ، دیوارێكدا گوێ بۆ ئازارەكانم شلكا و لێمتێبگا، ئەو رۆژانە مەحوی ئاسا منیش دەمگوت:

بێكەس منم، كەسێ لە زوبانم بگا نییە،

هەمدەم خودا نەناسن و دەم پڕ لە یا خودا

بەیانیانێك شاری نیوەمردووم بەجێهێشت و رووم كردە بناری شیعر. لەوێ، لە سێبەری قەسیدەیەكی پرچ شۆڕدا، كانییەكی كەس نەدیتەی پڕ ئازارم لەخەیاڵدا تەقییەوە. هەمووجارێ كە هەوری رەشی بێزاریی بەسەر سەرمەوە دەیگرماند، دەڕۆیشتم، لەو بنارە داخی دڵم بۆ هەڵدەڕشت. ئەویش چاوی تێدەبڕیم. گوێی هەڵدەخست، بۆم دەگریا، بۆ خۆی فرمێسكی هەڵدەڕشت، كانییەك، پڕ لە هەنگوینی وشەی سپیی، پەلوپۆ و لقی داربەڕوویەكی بە سالاچووی پڕ ماریفەت، كەپرێكی بۆساز كردبوو. كانی بە سەر تاوێرێكی تەقتەقەوە، پڕپڕ لە سیحر و جوانیی، تژی لە زەردەخەنەی لوغزاوی، من كە ئەدوام ئەو تێیدەڕوانیم و دەیبیست. دوادیدار بوو، من ئەدوام ئەو هەر دەیبیست، كە لێبوومەوە هەڵنەستام، ئەو دەڕۆیشت، ئەمەیان دوا تەماشایە، بزە، زەردەخەنە، بزە، یەك دوو تاو نەرمە پێكەنین، دوایش لە جێی ماڵئاوایی گریانێكی گەرم و بەكوڵ، هەم

پێکەنین!! زاری دەچێتە کلیلدا، سام دەمگرێ نازانم بەچ زمانێـك بیهێنمـە گـۆ و بیـدوێنم، لـەو کاتەدا کە من لەکانی دەڕوانم، ماینێکی سپیی چوارپەل خەنەیی لـەقوولایی دەریاچـەی بێزاریـدا سەردەردێنی. چەند شەقاوێك دوور دەوەستێت، لەگەڵ پڕمەیەکدا جەستەی تەڕی بەر تیشکی تـاو، یاڵ و کلك رادەوەشێنێت چوار ناڵە غارنەدا و دەڕوا، دەڕوا تا لە چـاو گـوم دەبێـت، لـەو کاتـەدا ئەسپێکی شیّ لەناو سەرما دەحیلێنیت. ئەسپێك، ئارەقە بە وێنەی کەفی سابوون بـە بنگوێـدا، بەسەر شان و کەفەڵیدا دائەچۆڕێت، سمکۆڵ دەکا و دەفیشکێنێت. شنەبایەکی فێنـك هۆشـم گلێـر دەکاتەوە، هەست دەکەم تینویەتیی خەریکە لەپەلوپۆم دەخات، دەم دەنێمە چاوی کانییەوە، بـەلام تینوێتیم ناشکێنێت.

پەنجەی دۆشاومژەم لە هەنگوینی کلۆری دار بەڕوو وەرئەدەم.. کـانی دەڵێـت: دە لـەو گـشت شانەی هەنگوینە بەشی خۆتی لێببڕە، رێگایەکی دوورت لەپێشە. جا منی غەریبە و نامۆ چوزانم لەسەفەرێکی ئاوا دوور و درێژ و سەختدا شانەی هەنگوینم دێتەڕێ، بۆ دواجار هەڵسامە سـەرپێ. چۆخەکەم لەبەر داکەند و لەبەرپێی کانیدا راخست، پاشان دەستم برد چـەند پارچـە تـوێکڵێکم لـە قەدی دار بەڕووە پیرەکە داماڵی، چۆن شاعیرێکی لێهاتوو بەسەلیقە رووی سپیی پەڕە کاغەزێکی بەر دەستی پڕ دەکات لە وشەی ناسك و بۆنداری شیعر، ئـاوا رووی سفتوسـۆڵی توێکڵـە دارەکـەم پڕکرد لە هەنگوێن و گرتم بـە سـینگمەوە. مـن دەمزانـی ئـەو چـەند گوێلـە هەنگوینـە بەشـی سەفەرێکی درێژترم دەکات، بۆیە لەناو کوولەکەی رۆحمدا هەڵمگرت و گەڕامەوە. هـەتا ئێـستەش هەرچی کاتێك کە پەڕەی دڵ واڵادەکەم تابلۆی حەسرەتی سپیی چاوی کانی داچۆڕا و بەسەر کوڵم و گۆنایدا، تێکەڵ بە رۆحم دەبێت و تام و لەززەتی هەنگوین، هەنگوینی سپیی دەزێتە زارم. کە بـە ئاگادێم دەڕوانم ژوورەکەم سیخناخە لە بۆنی عەتری گوڵە شەوبۆ، ئەو شەوبۆیەی کە هەزاران گوڵـە لووتەوانەی زیوین بە بالایدا شۆڕ بووەتەوە و باوەشی بە (موبەڕیدە)ی بـەر پەنجـەرەی ژوورەکەمـدا کردووە.

***

خۆشترین و چێژبەخشترین کات لەلای منی خەوقورس و خەواڵوو، ئەو بەیانیانەیە کـە زوو لـە خەو هەڵدەستم. ئێستا دونیا تەواو رۆشن بووەتەوە و رووەو (قەلا)، لەبەرهەیوانەکـەدا راوەسـتاوم. شار بەتیشکی زیوینی خۆر دەم و چاوی تازە شۆردووە و پڕ بەسییەکانی هـەوای پـاك و بێگـەردی بەرلە بەکار کەوتنی کارگە و فابریکەی ژینگە پیسکەرەکان هەڵدەمژێت. گوێ بۆ جریوە و جووکەی چۆلەکەکان و گمەی کۆترە باریکە هەڵنیشتووەکانی سـەر تێلـەکان و کـونی هەواکێـشی مووبـەق

هەڵدەخەم. جارناجارێك گوێم لە بینی درێژی کەنارییەکی وەحشییە، کە شێتانە دەچریکێنێت. دەنگی نازك و سیحراویی خانمە گۆرانیبێژی لوبنانی (فەیرووز) دەبیستم، دەڵێت: (شمشاڵەکەم بەریّ و گورانیی بچڕە، گۆرانییە نهێنیی بوون، ناڵەی شمشاڵە دەمێنێ پاش فەنای بوون). دەچمە بەردەرکی حەوشە و دەڕوانم، تاکوتەرا پیاوێك لێرە و یەکێك لەوێ بۆسەر کار دەچن و هەنگاوی بە پەلە دەهاوێژن. پیرە دایکێك گورزەیەك نانی گەرمی بەسەر لەپەوەیە و لەنانەواخانەکەی ئەولاوە بەرەو ماڵ دەگەڕێتەوە. تاوێکی تر رادەمێنم و لەنەو یەك دوو پاسکیل سوارە دەڕوانم کە سنووقێکی دارین، یا فلینێکی سپی پڕ لە سەموون و مەنجەڵێکی نۆکی بە پاشکۆیدا شەتەکداوە و پڕبەگەرووی هاواردەکات (سەموون سەموونی گەرم، شامی نۆك). من سەموون فرۆشێك رادەگرم و چەند سەموونێکی لێدەکڕم، دوایی نازانم چی پاڵم پێوەدەنێت، لێیدەپرسم:

- رۆژی چەن دینار قازانج دەکەیت؟
+ ٢٠- ٢٥ دینار..
- خانووی خۆت هەیە یان کرێچیت؟
+ هەمە.
- ماڵتان لەچ گەڕەکێکە؟
+ تەیراوا..
- چەند منداڵت هەیە؟
+ شەش.
- چەندیان کوڕن و چەندیان کچن؟
+ سێ بە سێ..
- منداڵەکانت لە قوتابخانەن؟
+ چواریان.
- کەسیان کار و کاسبیت بۆ دەکەن؟
+ نەو..
- ئەی خۆت، جگە لە سەموون فرۆشتن، هیچ کەسابەتێکی تر دەکەیت؟
+ کەسابەتی چی؟!
- کچەکانت گەورەن یا کوڕەکانت؟

ئەو تەنها تەماشایەکی پشوو براوانەم دەکات و هیچ نالێت، من درێژە بە پرسیارەکانم دەدەم و دەڵێم:

- ئەی چۆن بە ٢٠- ٢٥ دینار شەش منداڵ دەژێنیت؟

دیاربوو کاکی سەموونفرۆش کڕیاری لەکۆڵانەکەدا نەمابوو تا چاوەڕێی بکات و لە درێژدادڕیی منیش بێزاربببوو بۆیە وتی:

+ مامۆستا جەریدە نووسیت؟

دوا وەڵامی ئەو پیاوە رەنجدەرە پرسیاربوو، بەڵام پرسیارێکی رەخنەئامێز، پاشان سواری پاسکیلەکەی بوو بە تووڕەییەوە، ( دیاربوو من تووڕەم کردبوو)، پایدەرێکی بەهێزی لێدا و پڕ بەگەرووی هاواری کرد: (سەموووووون سەموووووون سەمووونی گەرم، شاااااااااااامی نۆۆك)..

من دەزانم هەر چۆن سەموون فرۆشەکان بۆ دابینکردنی بژێویی خۆیان و ماڵ و خێزانەکانیان، بەیانیان زوو بە جۆرێك لەگەشبینی و برێك قەناعەت بەو کەمە قازانجەوە کە ئەو رۆژە دەستیان دەکەوێت، لە خەو رادەپەڕن، کۆڵان دوای کۆڵان گەز دەکەن و کۆڵەکانیان ساغ دەکەنەوە ئەوجا دەگەڕێنەوە ماڵ.

کەنارییە وەحشییەکە و کۆترە باریکەکە و چۆلەکەکانیش بۆ خۆیان و هاوەڵەکانیان دەخوێنن و گۆرانی دەچڕن، کەچی جۆرێك ئاسوودەیی بە من دەبەخشن و مانایەکی جوانتر بە ژیان دەدەن، لەهەمانکاتدا برێ پرسیاریشم لەلا دروست دەبێت، کە ناتوانم وەڵامیان بدەمەوە.. دەی کێ دەزانێ ئەو چۆلەکەیە، کە هەموو بەیانییەك لەیەك کاتی دیاریکراودا لەخەو هەڵدەسێت و بەئەو جۆش و خرۆشەوە دەجروێنێ، تاوێکی تر بە ئەو هەموو وریایی و لاسارییەی خۆیەوە، بەرلەوەی هاوەڵەکەی لە چینە بگەڕێتەوە بەردی بەردەلاستیکی منداڵێکی چەتوون نایپێکی و بە سەر چڵێکی بەرزی ئەو دار شاتووەوە بە سینگی خوێناوییەوە بەر نابێتەوە سەر زەوی و کۆتایی بە ژیانی نایەت؟ هیچ دوورنییە سەموونفرۆشەکەش بە دەم ژماردنی قازانجی ئەمڕۆیەوە (مەرگی مجافات) نەکات!! یان دووسبەی (لۆتۆ)ی بۆ دەرنەچێت و ڕێڕەوی ژیانی نەگۆڕێ!! ئەی کۆترە باریکەکە، نەختێك بەر لەئێستا بەدەم پشیلەیەکی رەشەوە بینیم، بەڵام چاوە زیت و رەشەکانی هێشتا هەر گەش بوون و دەیانڕوانی..

رۆژێك پرسیارم لە خوێندەوارێکی شێتۆکەی ئەو گەرمیانە کرد: بەلای تۆوە ژیان خۆشە؟ ئەو لە وەڵامدا وتی: بەخوا کەریت!! ئەگەر ژیان لەلای چۆلەکەیەك و کۆترێك و پشیلەیەك و سەگێك و حاجی لەقلەقێك خۆش بێت، کە بە بێئەوان سروشت جوانیی خۆی ئەدۆڕێنێ و لاردسەنگ دەبێت،

لای منی شاعیر بۆ خۆش نەبێت؟ ئاخر تۆ پرسیارەکەت ڕۆشنتر ئاراستە بکە، دەزانیت خۆش بەلای منەوە چی دەگەیەنێت؟ خۆش ئەوەیە تۆ لێمگەڕێیت بە حەز و ئارەزووی خۆم بژیم و چێژ لە ئەم ساتە وەربگرم کە تیادا دەژیم، ئەوەتا تۆ بەئەم ناوەختە ڕێگام لێدەگریت و ژیانم لا تاڵ دەکەیت، من بەر لەوەی شاعیربم مرۆڤم، یان لەوانەیە بەرلەوەی مرۆڤ بم شاعیر بووبێتم، بۆیە هەموو ئەو مەخلوقاتانەم خۆش دەوێت، کە جنس و ڕەگەزی خۆیان قڕناکەن، ژیان بەلای منەوە واخۆشە هەر کەس بۆ خۆی بژیت و هەمووشیان بۆ یەك بژین، بەمەرجێك کەس ئازاری کەس نەدات و خەمیش بۆیەك بخۆن، ئەگەر من دوو سیگارم لەناو پاکەتەکەمدا شاردبووەوە و تۆش بە هۆی بێتووتنییەوە ناو بەچاوەکانتدا داچۆڕا، خۆ دەبێت جگەرەیەکت بدەمێ، بە مەرجێك تۆ ئەو سەخاوەت و دڵ گەورەییەی منت لەبیر بێت، خۆ لەوانەیە منی شاعیر وابیر بکەمەوە.. ( من گورج دەستم کردە باخەڵمدا و جگەرەیەکەم بۆ درێژ کرد)، ئەو پێکەنینێکی ئەوساویی بۆ کرد و گوتی: ئاخۆم کەی داوای سیگارم کردووە؟!

ئاخر ئەوەشت لە یاد نەچێت، کە زۆرێك لە شاعیرەکان تەنها لە کاتی شیعر نووسیندا جوانپەرست و مرۆڤدۆستن، کە لە نووسین بوونەوە دەبن بە مرۆڤگەلێکی بێبەزەیی و بەرژەوەندپەرست. ئەو جۆرە کەسانە ئامادەن نووسینەکانیان بە چەند پێکێك مەی لە یانەیەکی نیوە تاریکدا بگۆڕنەوە. خۆ زۆرێك لەئەو شیعرنووسانە، خوانەکەردان ئەگەر ببن بە ساحێب دەسەلاَت، دەبن بە دڕندە و دیکتاتۆر، ئیتر ببڕای ببڕ توخنی نەك هەر شیعرنووسین ناکەون، بەڵکو نایشیخوێننەوە. مۆسیقاش، ئا..ئا مۆسیقا، گوێی ئەو نەختە مۆسیقایەشیان، کە بەرلە دەسەلاَت گرتنەدەس هەبوویانە، کەڕ دەبێت!! ئەوساکە بە هەردوو چاوی خۆت دەیانبینیت چۆن ژیان لە دەوروبەر تاڵ دەکەن، بەلای منەوە ژیان ئەوەندە خۆشە، کە پارەی پیاڵەیەك چای ڕەشی چایخانە و پاکەتێك سیگاری کەسکوون و تۆپێك مووس بۆ ریش تاشین و دەفتەرێك و دوو قەڵەمم پێهەڵبسوورێت. قەڵەم بۆ وێنەکێشانی کچێکی شۆخ و شەنگ، قەڵەم بۆ شیعر نووسین، نەك بۆ وتاری ماستاو ساردکردنەوە و مامەحەمەیی، قەڵەمێك کە دەسەلاَتە بێشەرمەکان لە جیڕەی نووکی بترسێن، نەك لە پێناو دەرکەوتنت لە شاشەی تەلەفزیونەکانەوە و بە بەر چاوی کامیرا و هەموو بینەری سەر گۆی ئەم زەوییەوە پێت بڵێن: ئەفەنی گەورەمان، باس لە موعاناتی ئێمە دەکات، تۆی بێموعانات مافی ئەوەت نییە بەئەو قات و بۆینباغ و پرچی بریقەدارەتەوە خۆتمان بۆ نمایش بکەیت بڵێیت: من هەم..

ئاخر من لە جیاتی تۆ ئەوەتا شەرم دام دەگرێت.. من شاعیرم و لە خەونیشدا هەر شاعیرم، بۆیە هەرگیز ئامادەنیم نووسینی شەوێکی بە ئازارم بگۆڕمەوە بە هەموو سەروەت و سامانی پیاوە ورگن و چەورە و چەورخۆرەکان. ئەو کەسانەی کە من لەخەونمدا هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکەم، بە زمانی شیعر لە گەڵمدا ئەدوێن و باوەش بە وشەکانمدا دەکەن و پێکەنینەکانیان وەك چەپکەگوڵ دەچنن و فرمێسکەکانیان بە برژانگی چاوی رۆح دەسڕن، ئیتر چۆن ئەو ژیانەی کە من بە شیعر دەیگوزەرێنم شیرین نەبێت بەلامەوە؟! دونیای من دونیای بوونەوەرە گۆرانیبێژەکانە. ئێمە بەزمانی جریوە ئەدوێین و بە باڵی شیعر دەفڕین و لە باوەشی خۆشەویستیدا دەمرین، بۆیە دەڵێم: لە مەرگێك دەترسم تامی مەرگی ئێوە بدات. مەرگی من کۆچێکە لە بە هەشتێکەوە بۆ فیردەوس.

ئەو کە ئەدوا، بەشێوەیەکی وا جیددی دەئاخفت، دەمارەکانی بناگوێی وا شیشیان دەبەست، هەر دەتگوت ئەو قارەمانانەن، کە پاش راپەڕین لە بۆنەیەکدا ئامادە دەبوون و وتاریان ئەدا و بەحەماسەوە دەستیان رادەوەشاند.

پاشان رووی دەمی تێکردم و وتی: ئاخر ئەوەتا تۆ بەئەم پرسیارە پووچ و بێمانایەت ئازارم ئەدەیت و دڵم دەئێشێنیت، دەزانیت بۆ؟ چونکە دونیای ئێوە دونیای کۆلاژدم و مار و دووپشك و گورگ و کەمتیار و رێوییە!! ئێوە جیهانتان بۆنی خوێن و درۆ و نیفاق و بۆگەنیی لێهەڵدەستێ، دە برۆ وازم لێبێنە با دڵت نەیەشێنم هەی کەرەکەی نالی..

***

تاوێکی تر تیشکی رۆژ خۆی دەکاتە کون و قوشبنی پیرە قەڵای شاردا و لووتی بەرزی کۆشك و تەلار و باڵەخانەکان دەسمێت. دەدات لە دەمی کراوەی دەیان بڵندگۆی سەر منارە هەڵچووەکانی مزگەوتی شار و دوایی، ستارەی خانووەکەی ئێمەیش بێبەش ناکات. لە پەنجەرە کۆنەکەوە خۆی دەکات بە ژووردا و ملیۆنەها میسقالە زەڕڕەی سپی سپی لەخۆ دەئالێنێت و دەڵێت: مادام پەنجەرەیەك، دەلاقەیەك، کونێکی بچووك بە قەد نووکی دەرزییەك شك ببەم، دێم و سەردانیتان دەکەم.. بەدوای تیشکەکاندا دەچمە ژوورەوە، هەرچۆن دایکە زەیسانەکە بان دەم و چاوی کۆرپەکەی لادەدات و سەرێك بەلای دەم و لوتیدا شۆڕدەکاتەوە تا بە مشە و هەناسەیدا باری تەندروستی بپێوێت، منیش رێك ئاوام کرد، رۆیشتم، بەلای جگەرگۆشەکەمەوە دانیشتم، دەستێکم بە رووومەتیدا هێنا و بەرگەکەیم لادا و بەسەر یەکەم لاپەڕەوە نووسیم: (منداڵێك لە مەملەکەتی باوکەکاندا)، ئینجا دووەم لاپەڕەیم هەڵدایەوە و قەڵەمەکەم گرت بە دەستەوە و بە خەتێکی درشت نووسیم:

پێشکەشە:

بە کانی..

بە چاوەکانی..

بڕێ لێی وردبوومەوە، بە مەبەستی کلڕێژکردنی چاوەکانی.. یان بە شیاوم نەزانی و شەرمێکی بێمانا پاڵی پێوەنام تا وشەی چاوەکانی ڕەش کەمەوە، وەك هونەرمەندێکی وێنەکێش هێدی هێدی نووکی ڕەشی قەڵەمەکەم بە نێو جووت کەوانەکەدا بردوهێنا، بەڵام وا ڕێکەوت، وێنەی مامزە چاوێك خۆی خزاندە نێو جووت کەوانەکەوە.

زۆر دەترسام بەرلەوەی (منداڵێك..) زمانی بێژێت و قسەی دڵی خۆی بۆ خوێنەرە جوان و مرۆدۆستەکان بکات، تێر لە گەمەی منداڵانەی خۆی نەخوات و بەرچنگی نێرە ڕۆشنبیرێکی خۆپەرست، یان پیرە باوکێکی دڵڕەق بکەوێت و دەمکوتی بکات، بۆیە بیرم لە دایانێکی دڵنەرمی دایك ناسا دەکردەوە تا لەگەڵ لاواندنەوەیدا زات بخاتە بەری و فێری پرسیاری بکات و بەگورگە شەوانە زارەتەرەکی نەکات..

سەیرە زۆرجار تۆ بۆ شتێك چاودەگێڕیت، دوور دەڕوانیت، کەچی کەسی مەبەست ئەوەتا زۆر نزیکە لێتەوە و بانگی بکەیت دەتبیسێت و وەڵامت ئەداتەوە!! دەنگی زەنگێك هۆشم گلێر دەکاتەوە.. هەڵدەستم و وەکو گوڵێك لە هەڵوەرینی پەڕەکانی بترسێت، ئاوا بە ئەسپایی لێی دەنەوم و دەیخەمە ناو جەنتاکەمەوە، خۆ ئێستا ناونیشانی خۆی و ژمارەی تەلەفۆنەکەی دەزانم.. بەپەلە لەماڵ دەردەچم، کات هێشتا زووە. بەپێ و بەسەر شۆستەکەدا ڕوو لە فەرمانگەکەم دەکەم، بۆ ئەوەی تا دەگەمە جێ ئەویش گەیشتبێت. من بەدەم ڕۆیشتنەوە بیری لێدەکەمەوە، دەسپێك چۆن ڕێ بۆ قسەکردن خۆش بکەم و دەرئەنجام پێی بڵێم: "دێم بۆ سەردانیت".

بەدەم ڕێگاوە ئەوەندە بیرم لێکردەوە، خەریك بوو لە بیرۆکەی سەردانەکەم پاشگەز ببمەوە. خۆ ڕاستە جۆرە ناسیارییەکمان لەنێواندا هەیە، بەڵام کێ دەڵێت (ئەو) ئامادەیی پێشوازیکردنی هەیە؟ ئاخر ترس و شەرم بەشێکی گەورە لە کەسایەتی ئێمەومانان پێکدەهێنێت و زۆرجار ئەقڵمان گێژ دەکات!! دەی کێ دەڵێت ئەویش پێویستی بە من نییە؟ خۆ ئەگەر حەز بە نزیکبوونەوە نەکات؟ بۆ لەئەو پەیوەندییە تەلەفۆنییەدا پێمدەڵێت:"چاوەڕوانت بووم سەردانمان بکەیت، کەچی هەر نەهاتیت.."هەر ئەویش بوو لەئەو پەیوەندییە تەلەفۆنییە کورتەدا هەوڵیدا زۆرترین قسە بکات، دیارە ڕۆشنبیریشە، بۆیە لێیپرسیم: چ دەخوێنیتەوە؟ کە وتم کتێبی (زەردەشت ئاوا دوا). ئەو بە مەبەستەوە وتی: بە نیچە سەرسامیت؟ یا لەڕقی نا ئەقڵانییەتی باوباپیرانی ئیسلام و

ئیسلامییەتی گەنجەکاندا، زەردشتییەك لەناختدا سەری هەڵداوە؟ ئەو لە قسەکانیدا مەبەستی بوو بڵێت: منیش دەخوێنمەوە و بەشی خۆم رۆشنبیریم هەیە! جا کە وای لێهات ئیتر ئەم دوو دڵییەی بۆ چییە؟ ئەو بەیانییەشم کەوتەوە بیر، کە بە رێکەوت تووشی بووم، راستە بە دەممەوە رانەوەستا، بەڵام بە هەردوو چاوەمامزییەکانی، کە وامهەست کرد پڕن لە قسە و بە هەردوو لێوە گۆشتنەکەی، بێنەوەی سەرنجی کەس رابکێشێت، سلاوی لێکردم و منیش گورج لێی حاڵی بووم، بۆیە خۆی ناسا بە کەمێك سەردانەواندنەوە و بە دەریایەك زەردەخەنەی رۆحمەوە، کە جگە لەئەو، کەس تێی نەڕوانیم، بە نەختێك خۆنوشتانەوە و دەس بەسینگەوە گرتنەوە سلاوەکەیم سەندەوە.

ئێستا ئەم منداڵە، کە بە دەستمەوەیە، خۆمم و خۆمیش باوکم. پەلیم گرتووە و دەیبەم بۆ لای مەلای گوندیی و داوای لێدەکەم بۆم بخاتە بەر خوێندن. قورعانی پێخەتم بکات و چەند کتێبێکی عیلم و شەریعەتی فێر بکات. بەشکوو لە سەرە مەرگدا یاسینم بخوێنێت و هەر ئەویش بەسەر قەبرەکەمەوە تەلقینم دابدات.

ئەم منداڵە کە بە دەستمەوەیە و پەلکێشی دەکەم، دەیبەمە خزمەت شێخ و لە حوزووریا چۆکی پێدا ئەدەم. عەرزی دەکەم و دەڵێم: قوربان ئەم خزمەکارەی تۆ گشت کتێبە کوردییەکانی لە حوجرەدا خوێندووە و قورعانیشی خەتم کردووە، منداڵێکی نوێژ و تاعەت دروستە، بەڵام هێشتا هەر چەتوون و لاسارە، هاوردمەتە خزمەتت، تەریقەتی نیشان بدە و تۆبەی دادە، بەشکوو ئەمە خوایە پیاوێکی باش و وەکەلکی لێدەرچێ.. ئەوەی لێل ئەم حەرامزادەدا کردم گشتی وە فیڕۆ چوو!! ئەم کەڕەتە ئەگەر مامەی لەشارەوە هات بۆ ئاوایی، ئەیدەمە دەسییەوە، با بیوات بۆ شار و لەوێ بیخاتە بەر خوێندن و فێری عیلمی شەیتانی بکات، وا دیارە خوا ئەوەی لە ناو چاو بۆ نووسیوە، بزانین دوارۆژی وە چی ئەگەیێ؟!

من دەبمەوە بە خۆم، منداڵەکەش دەبێتە هەشتا پەڕەی کاغەزی (ئەی فۆر) و ئاخنیومەتە ناو جانتاکەمەوە، ئێستاش بەسەر شۆستەکەدا ملم شۆڕکردووەتەوە و دەڕۆم..

- مامۆستا ئەوە خێرە، بە پێ دەڕۆیت؟ فەرموو سەرکەوە با بتگەیەنم..

+ سوپاس کاکە حەز ئەکەم بەپێ بڕۆم..

- مامۆستا فەرموو سەرکەوە، ئەوە چۆن بەپێ دەڕۆیت؟

+ وەڵا دکتۆر بۆی نووسیوم. دەڵێت بەپێ رۆیشتن بۆ دڵ باشە، ئاخر منیش تەزەخوومی دڵم هەیە..

- برا سەرکەوە، مامۆستا بۆۆۆ، فەرموو، دەفەرموو با بتگەیەنم..

+ زۆرم نەماوە سوپاس. ها ئەوە فەرمانگەکەمە گەیشتم، بێوەی بن.

هەرچۆنێك بوو گەیشتمە فەرمانگەکەم و ددانم بەخۆمدا گرت تا کاتژمێر گەیشتە دەوروبەری دە و زەنگێکم لێدا:

+ هەلۆ بەیانیت باش..

- بەیانیت باش

+ بە ئەرك نەبێت (کانی بارام)م نادەیتێ..

هەر ئەوەندە کارمەندی بگۆڕ، دووگمەی هێڵی تەلەفۆنەکە بگۆڕێت چاوەڕوان بووم، (کانی) وتی: بەڵێ..

+ کانی تۆیت؟ بەیانیت پاش..

- بەڵێ، باشتر.

کەمێك بێدەنگ بوو وەك ئەوەی بیربکاتەوە و بیەوێت دەنگم بناسێت، بۆیە وتم دەمناسیت؟ ئەو وتی: ئەگەر سەهوو نەبم (کوڕە گەرمیانیت) ئەو کەسەی بە شێوەی گەرمیانیان بدوێت و بە تەلەفۆن لەگەڵ مندا قسەبکات تەنیا ئەوە، من پێمووت:

+ راستە ئەوم، بەلاّم (کوڕ ) نیم، ئەوەندەش بچووکم مەکەرەوە با خۆم لێنەگۆڕێت..

- چۆنت دەوێ با وابێ، هەر باشە بە تەلەفۆنیش بەسەرمان دەکەیتەوە! ئەگەرچی تەسکینی بەدەڵ نادات، بەلاّم لە بێدەنگیی باشترە!!

تۆنی دوا قسەی کە گللەیی بوو، هەستم کرد کەمێك نازی ژنانە و تاسەی دیدەنی پێوە دیارە، بۆیە بەبێترس وتم:

+ خانم ئاخاوتنەکانت شەپۆلی فێنکی سەر دەریایەکی بن گەوهەرە و ماسی رۆحی شەڵەژاوم بەرەو کەناری ئارامیی راپێچ دەکات، بۆیە دەمەوێت بڵێم نیازمە ئەگەر ئیجازە بفەرموویت لە چاوتروکانێکدا دێمە خزمەتت، خۆ ئەگەر بەختم یاربوو مۆڵەتم پێبەخشرا، ئەوا هەتا دەگەمە حوزووری ئەو مرۆڤەی کە خەو بە دیدەنییەوە دەبینم، لەوانەیە ئەو تاڵە موانەی سەر و ریشم کە خەم و پەژارە سپیی کردوون، لە ساتێکی ئەفسووناوێدا رەش ببنەوە!!

- وەی چەند شێتیت، شڵەژانی رۆح لە پای چیی؟ دایکم دەڵێت بە منداڵیی شێتۆکە بوویتە، شاگەشکە دەبم ئەفەنی، چاوەڕوانتم.

لەگەڵ گۆکردنی وشەی (چاوەڕوانتم)دا هێڵی تەلەفۆنەکەی داخست.

وا رێککەوتبووین لە جێژواندا، یان راستتروایە بڵێم، لە جێگەمەکەماندا، چاوەڕوانیبم، چونکە دوا دیدارە و سبەی دەگەڕێمەوە بۆ شار، لەئەو رۆژە بەهارییەدا خۆشم نەمزانی بۆ ئەوەنـدە پەلـەم کرد؟ وەك کێچ چوویێتە کەولّم جێم بـە خـۆم نـەگرت و چـاوەڕوان نـەبووم تـا شـوانەکەیان، رانـە مەڕەکەی لە ئاوایی رابدات، بە هەڵەداوان خۆم کردە حەوشەی ماڵیاندا و بەدەم دەرگاکەوە چەقیم، کاتێکم زانی پەیدا بوو، کە چاوی پێم کەوت، راچڵەکا، کەمێك بە شپرزەییەوە نزیك بووەوە، وەکو تەوارێکی برسیی و پەشۆکاو چاوە رەشەکانی بریسکانەوە و بە چـپە وتـی: ئـەی نـەمگوت لـەوێ چاوەڕوانم بە. دە تۆ برۆ ئەوا منیش هاتم.. "دە تۆ برۆ " لە شێوەی فەرمان بوو، بۆیە زۆر بەپەلەتر خۆم گەیاندە شوێنی مەبەست و دزئاسا خـۆم کوتایـە نـاو تۆقـە تۆلکـە بالاکردووەکـەدا و خـۆم حەشاردا، زۆری پێنەچوو پەیدابوو.. ئەو بە تەمەن چەند ساڵێك لە من گەورەتر بوو. زۆرجـار بـە منیشیان دەگوت: دەنگی نێر بووە و کەڵەشێری قووقاندوویەتی، ئیتر عـەیب و شـوورەییە لەگـەڵ کەنیشکدا گەمە بکات..

روانییم دەم و چاوی کەمێك ترسی پێوەدیارە و رەنگی هەڵپرووکاوە. بەپەلە خۆی کوتایە نـاو تۆقە تۆڵەکەکەدا و بە چنچکەوە دانیشت. ( خۆم لەدایکم دزییەوە، دوێنـێ هەرەشـەی لێکـردم و پێیووتم ئیتر نابێت لەماڵ دەربچم و لە کۆلاندا گەمە بکەم، وتیشی ئەگەر بەقسەی نەکـەم داخـم دەکات)، پاشان داوای لێکردم لێی نزیك ببمەوە، دەستی راکێشا و توند مەچەکی گـرتم و بـۆلای خۆی رایکێشام. ئەو رۆژە ئەو وەکو ئەرکێکی گرنگی پێسپێردرابێت و زۆر بەپەلە دەبێت جێبەجێی بکات و بگەڕێتەوە، ئاوەها بەبێ هیچ پێشەکییەك لێمنزیکتر کەوتـەوە و سـەرمی خـستە سـەر بازووی خۆی و توند نووساندمی بەسینگییەوە و دەمی نایە سەر گۆنام، دەمـی گـەرم گـەرم وەك پشکۆی ئاگر داخ ببوو و بە توندیی هەناسەی ئەدا، ئەو ئەوەندە توند باوەشی پیادا کردبووم وەخت بوو لەناویەکدا بتوێینەوە، دوو سێ جـار بەسـەر ئـەو تۆڵەکـەوە، کـە رۆژانـی پێـشوو، ئەوەنـدە تەپاوتلمان تیادا کردبوو وەك فەرشێکی سەوز بەسەر زەوییەکەوە راخرابوو، گەوزاندمییەوە، دواجار من کەوتمە سەرەوە ئەو دەستی برد سنجاقی ملیـوانی کراسـەکەی ترازانـد و دەمـی خـستە سـەر سینەی و توندتر گوشیمی بەخۆیەوە. (بەیانیی دەچییتەوە بۆ شار، دەدەی توند بمگوشە، تونـدتر)، منیش توندتوند ئەوم بەخۆمەوە گوشی، لەئەم یەکتر گوشین و یەك سوینەدا تـا دەهـات ئـەو پـتر دەشڵەژا، شڵەژانەکە منیشی گرتەوە، پاشان وردەوردە خاوبوویەوە و شڵەژانەکەی دامرکایـەوە، ئەو وەکو نۆمایێنێك، کە بۆیەکەم جار لەغاو دەکرێت و پاشان لەغاوەکەی لەسەر دادەماڵرێت، ئاوا

لەناو تۆقە تۆڵەکەکەوە دەرپەڕی و بە تاو بەرەو ماڵ بوویەوە. ئەوە یەکەم گەمە و دواگەمەی حەرامی ئەو دوو منداڵە بوو، کە نەیاندەزانیی هۆی چییە ئەوەندە یەکتریان خۆشدەویت.

گەیشتمە بەر دەرگا سەرەکییەکە و خۆم کرد بەژووردا. بە نەردەوانەکەدا و بەلای چەپدا، نازانم پێنج شەش، دە پایەیەك دەبوو سەرکەوتم. هەر کە پاڵم بە دەرگای ڕێڕەوەکەوە نا، ڕوانیم کانی بە پێش دەرگای ژوورێکەوە لە چاوەڕوانیدایە. دوو سێ هەنگاوێك لێینزیك کەوتمەوە و ئەو بەرەو پیریم هات. زەردەخەنەیەکی شیرین بەسەر لێویەوە ڕوابوو. بە وێنەی دیبلۆماتێکی کارامە و لێزان، بە کەمێك خۆنوشتاندنەوە دەستی بۆ لای دەرگای ژوورەکە ڕاکێشا و فەرمووی لێکردم. من بەبێ بیرکردنەوە لە قسەکەی خۆم وتم: لە چوونە ژوورەوەدا هەرگیز نەکەوتوومەتە پێش هاوڕێکانمەوە، بە تایبەتی خانمە هاوڕێکانم.

من چەندێ پەلەم کرد لەم دەربڕینە ناوەختەمدا، ئەویش هەر دەتگوت خۆی بۆ وەڵامدانەوە نامادەکردووە. گورج وتی: بەرلە هەموو شتێك تۆ میوانیت، میوانیش ڕێزی تایبەتی لێدەگیرێت و دەبێت پێشبخرێت، ئەجا کێ دەڵێت من و تۆ هاوڕێین؟..

بەدەم چوونە ژوورەوەوە هەڵوەستەیەکم کرد، ( تۆ میوانیت، کێ دەڵێت من و تۆ هاوڕێین؟)، تووشی جۆرە شپرزەییەکی کردم، ئاخر وەڵامە حازر بە دەستەکەی جێگای ڕامان و بیرلێکردنەوە بوو، بۆیە لە دڵی خۆمدا بە خۆمم وت: "ئەم ئافرەتە وریا و ژیرە، کوڕە حیساب بۆ قسەکانت بکە، ئەوەندە دڵساف و ساویلکە مەبە، خۆ کفری خودای نەکرد جارێك بەیانیی باش و سووکە گاڵتەیەکی لێکردی، ئەو ڕاست دەڵێت، هاوڕێ چۆن وا بەئاسانی پەیدا دەبێت؟ ئاخر خۆ هاوڕێ کەروێشك نییە تا بە چەپکێك وێنجەی تەڕ دەسەمۆی بکەیت، نێ خۆ کەڵەشێری شامیش نییە بۆ کات بەسەر بردن بەشەڕی بدەیت، کە ڕۆژێکیش لە گۆڕەپانەکەدا بەزیی، لێی بێزار بیت و تیخاوتیخ بە چەقۆیەکی تیژ سەری ببڕیت و گۆشتەکەی بکەیت بە مەزەی سەر مێزی شەوێك..

ئەو کە خستبوومیە لای دەستی ڕاستییەوە، دیسان فەرمووی لێکردم، بەپەلە چاوێکم بەناو ژوورەکەدا گێڕا، بەرانبەر دەرگاکە، تاك قەنەفەیەك دانرابوو، بەلای دەستی ڕاستدا مێزێکی بچکۆلانەی دارساجەوە، کورسییەکی قنجی بەپشتەوە دانرابوو، بەلای چەپی مێزەکەوە و لەپێشەوە، کورسییەکی تر دۆش دامابوو، من ویستم بەسەر تاك قەنەفەکەوە دابنیشم، ئەو دەستی بۆ لای کورسی پشت مێزەکەی خۆی ڕاکێشا، ئیتر هەلێك بوو بۆم ڕەخسا و لەدەستم نەدا، پێموت: "میوان دەبێت جێگای خۆی بناسێت و بزانێت لە کوێدا دادەنیشێت، وەسیەتێکی باوکم قەت لەبیر ناچێتەوە، کە هەردەم دیگوت: کوڕم لەشوێنێکدا دابنیشە گەر پاشاش هاتە ئەو

مەجلیسەوە بۆی چۆڵ نەکەیت.. وا دیاربوو ئەو هەم لەئەو کەمە شپرزەییەی کە گرتبوومی و هەم لە مەبەستیشم تەواو حاڵی بوو، بۆیە پێی لەسەر ئەوە داگرت تا بچم لە شوێنەکەی خۆیدا دابنیشم، بەڵام بە قسەیم نەکرد و چووم بەسەر کورسیی پێش مێزەکەوە دانیشتم. هەر بۆ دڵنەوایی کردنیشم بوو کاتێك وتی: جێگای کەسێکی لە دڵدا شیرین سەرچاو و ناو رۆحە، ئەوەندە باسی ئێوەم بۆ کراوە واهەست دەکەم زۆر لە زووەوە دەتناسم. ئێستا لە قسەکەی پێشووم پەشیمان دەبمەوە، تۆ نەمیوانیت و نەهاورێ، واهەست دەکەم زۆر لە هاورێ نزیکتریت، بەڵام نازانم چ ناوێکت لێبنێم؟

من لەدڵی خۆمدا وتم: ئاخاوتنی جوان و کێشانەکراو مرۆڤی جوان جوانتر دەکات و ئەو جۆرە مرۆڤانەش قسەی خۆیان بە با نادەن و بەرلە ئەوەی بێنە ئاخاوتن، باش دەزانن چوار پەلی قسەکانیان لە کوێدا ئەدات لە زەویی. کە من دانیشتم ، ئیتر ئەو حاڵیی بوو ناتوانێت جێگۆڕکێم پێبکات، چوو بەسەر تاك قەنەفەکەوە، کەمێك لابەلا رووەو من دانیشت. پاش کەمێك بێدەنگیی پێمووت:

+ ببوورە، وا دەردەکەوێت کەمتەرخەمیم کردووە زوو بەسەرم نەکردوویتەوە..

- ئەوە لوتفە دەینوێنیت، جارێك چ دەخۆیتەوە؟ چا، شیر، قاوە؟

+ ئەگەرچی حەزم لە شیرە، بەڵام هەر چاکە چاکە..

- کە حەزت لەشیرە بۆ داوای چا دەکەیت؟

+ من شیرمەردەم، کە ساوا بووم مەمکی دایکم لە بێبەختی مندا وشکی کرد، بە ناچاریی بە شەکر و رازیانە بە خێوی کردم، وەکو خۆی بۆی دەگێڕامەوە، کە شەکر و رازیانەم لێدەبڕایەوە بۆ لای ژنە کۆرپەدارەکان ئەم ماڵ و ئەو ماڵی پێدەکردم تا قومێك شیر بچۆڕێننە دەمم و لە گریان بکەوم، دایکیشم زۆر حەزی لە چا بوو کەچی نەیدەخواردەوە، دەزانیت بۆ؟ ئەو ئافرەتێکی جارِسەخت و نەفس بەرز بوو، لە رقی قسەی رەقی بازرگانێکی شەکر و چا فرۆش دەرهەق بە باوکم کردبووی، دەستی نابوو بەرِوویدا و شەکر و چای بەقەرز پێنەدابوو، چای لەخۆی حەرامکرد و تا مرد نەیخواردەوە، کەچی هەرکاتێك بیرم لەخراپەکاری، یا تۆڵە بکردایەتەوە، ئەو پێدەووتم: کوڕە شیرینەکەم دەخیلت بم نەکەیت، قەت بیر لەخراوە نەکەیتۆ، هەر چاکە چاکە، ئەگەر ناحەزەکانت ئێسقانتیان نەشکان و خوێنیان نەرژانیت، تۆ وەچاکە چاویان کوێرکە، ئەگەر پیاو بوون، ئەوا ئەونە دۆستت، خۆ ئەگەر ناپیاویش دەرچوون، حەواڵەی خوایان بکە، کوڕەکەم چاکە بکە و بیدە وە ناوا..)، بۆیە منیش هەردەم حەزم لە چا کەیە.. خانم داوای چا کەم بۆ بکە، بەڵام با شیرین نەبێت،

چونکە هەموو پیاوێك دەتوانێت چای شیرین بخواتەوە، پیاو ئەو پیاوەیە تاڵیش بخواتەوە، ببوورە مەبەستم لە پیاو مرۆڤە، جا ئەو مرۆڤە نێر بێت یان مێ؟ بۆ خواردنەوەکەش ئیتر خۆت سەرپشکی بە.

هەواڵی دایکیم لێپرسی. ئەو بەسەر قەنەفەکەوە دانیشتبوو لێیدەڕوانیم، لەناکاودا خۆی گورج کردەوە و وتی: هاها.. پرسیاری دایکمت کرد؟ نا.. دایکم، هەر بەسەر ماوە، بەڵام بیروهۆشی خراپ نییە.

پاشان وتم: باوکیشت خودا عافووی بکات.. ئەو سەرێکی بۆ لەقاندم و وتی:

- بە رەحمەتی خوداچوو، چۆن دەزانیت، لە کێت بیستووە؟

+ پارساڵ کە یەکترمان ناسی، یا ڕاستتر بڵێم، کە قەرزاریارت کردم و خۆتت پێناساندم، ئەو کاتە وتت (دایکم دەڵێت ئیمەش گەرمیانین)، گومانی ئەوەم کرد کە باوکت لە ژیاندا نەمابێت.

- براکەیشم لە (ئەبوغرێب) لە سێدارە درا و تەرمەکەشیان نەدایەوە..

(کانی) کە باسی باوك و براکەی بۆ دەکردم بە دەنگێکی لەرزۆك و پڕ لە حەسرەتەوە دەدوا و چاوەکانی ببوون بە دوو گۆمی شەڵەقاو و بە زۆر فرمێسکەکانی ڕاگرتبوو، بۆیە پێموت:

+ داوای لێبووردنت لێدەکەم، وابزانم برینەکانتم کولاندەوە، بەڵام هەر دەبێت دوا پرسیاریش بکەم، ئەویش دەربارەی (شەم)ە، شەمی خوشکت، ئەو چۆنە و لە کوێیە؟

کانی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و سەری داخست، ڕەنگی هاورد و ڕەنگی برد و هیچی نەووت.. منیش بێدەنگ بووم. ژوورەکە لەهەردووکمان کپ و بێدەنگتر، بەڵام هەر لە چاوەڕوانیدا مابوومەوە و گوێم بۆ وەڵام شل کردبوو، لەناکاودا سەری هەڵبڕی و وتی:

شەم بەر شاڵاوی ئەنفال کەوت، خەفەتی شەم دایکمی هێنایە چۆکدا، شووکردنی شەم و ئەو ژیانە تاڵەی بەسەری برد، باسێکی دوور و درێژە، هەر لێیگەڕێ، ئەگەر دەرفەت بوو لە کاتێکی تردا هەموو دەردەسەرییەکانت بە وردیی بۆ دەگێڕمەوە!

وەڵامە کورتە حەسرەتاوییەکانی کانی کە بۆنی چەرمەسەریی و کارەساتیان لێدەهات تاساندمی، بۆیە نەمویست زیاتر لەسەری بڕۆم، ئەویش وەك پرسیارەکانم ماندووی کردبێتن، پاڵیدا بە قەنەفەکەوە و بە بێدەنگی لێیدانیشت.

ئەو پرسیارانەی کە نەدەشیا نەیانکەم، ئەگەرچی وەڵامەکان هەمووی ئازاربەخش بوون، بەڵام هەر کردم. ئینجا چاوم بە ژوورەکەدا گێڕا و شۆڕمکردنەوە بۆ بەر لووتی خۆم، ڕوانیم پەڕۆیەکی قەدیفەی شینڕەنگی تووکن بەسەر ڕووی مێزەکەوە لەژێر شووشەیەکی کەمێك ئەستووردا ڕاخراوە،

لەژێر شووشەکەدا وێنەی دوو ئەسپی بۆرەی تیژ و پڕ لەسەر پاشوو ڕاوەستاون و بە حەواوە چنگیان لەیەك گیر کردووە. لەئەولایشەوە دوور لە ئەو جووت ئەسپە، ماینێکی شێ بە دەم سەڵەفکردنەوە سەر و ملی وەرچەرخاندووە و لە جووت ئەسپەکە دەڕوانێت، لە سوچی لای ڕاستەی مێزەکەوە کتێبێکی ڕەنگ قاوەیی قەوارە مامناوەندیی دانراوە، کانی ڕووی دەمی تێکردم و وتی: چی سەرنجی ڕاکێشاویت؟ هەستم کرد کەمێك خەم و پەژارەکەی ڕەوییەتەوە و حەزی لێیە قسە بکەم، نەك پرسیار، بەلام من پرسیارم لادروست ببوو بۆیە وتم:

+ ڕەنگی ئەو پارچە قەدیفەیەی ژێر شووشەکە و وێنەی ئەو دوو ئەسپە زۆرانبازە و ئەو ماینە سەرسامە و ڕەنگی جلوبەرگەکەشت، وەك یەکەمجار کە چاومان بە یەك کەوت، هەر شینە؟ مەگەر مەحویی لەئەم گشت شین و حەسرەتەی خۆت و ژوورەکەت بپرسێت، کە دەفەرمووێت:

لە کێ پرسم دڵی بۆ پڕ لەخوێنی حەسرەتە یاقووت؟

عەزا پۆشی چییە و کێیە، جلی پیرۆزە بۆ شینە!

کانی هەڵسایە سەر پێ تا بەر دەرگای ژوورەکە ڕۆیشت، سەرێکی کێشایە دەرەوە و گەڕایەوە، بەرانبەرم ڕاوەستا و هەردوو لەپی خستە سەرمێزەکەی پێشم و بێورتە تێیڕوانیم، تێڕوانینێکی وا هەر وەختبوو بێتە ناوگلێنەی هەردووچاومەوە و لەوێوە بۆ ناو دڵم شۆڕ ببێتەوە. ئەوەی من لەچاوەکانیدا خوێندمەوە نیازی درکاندنی قسەیەك بوو بیکات، بەلام خۆی کۆنترۆلکرد و هیچی نەووت. پاشان هێدی هێدی خاوبوویەوە و پاشەوپاش کشایە دواوە بۆ شوێنەکەی خۆی، بە لێواری قەنەفەکەوە دانیشتەوە و چووە دۆخە کپییەکەی چەند ساتێك پێشتر و وەك لەبیرکردنەوەدا بێت سەری داخست، پاشان هاتەگۆ:

- وەلامی سەرجەم پرسیارەکانت بە چۆنیەتی ئاشنابوونم بەکتێبەکە ئەدەمەوە. خەڵکە کۆسکەوتوو و لێقەوماوەکانی پێش ڕاپەڕین لەناوشاردا هەردەم خەریکی خۆشاردنەوە بوون، چاوەڕوانی ڕۆژێکیان دەکرد هەر هیچ نەبێت بوێرن بە کەمێك شانازییەوە باسی ماندووبوون و قوربانییەکانی خۆیان بکەن، چونکە ئەو ئازادییەی کە پاش ڕاپەڕین هاتە ئاراوە لە خەیاڵ و بیرکردنەوەی کەم کەسدابوو. ئەوئازادییەی کە گشتمان وەك سوێسکەیەکی ناو قەفەس کە قەت ماڵیی نابێت، دەرگای بۆ والاکردین، منیش ویستم بە وێنەی مامزە ژنێکی سەربەست، بێترس و خۆف لە مێرگ و چیمەنی نیشتمانەکەمدا بژیم، وامدەزانی وڵات بەهەشتێکە و ئیتر دۆزەخ نییە، مێرگوزارێکە و دارستان نییە و من ئیتر ئازادم لەکام سەرچاوە ڕۆحی تینووم پاراو بکەم، سەربەستم لەپاڵ چ تاشەبەردێکدا بحەسێمەوە، بێترس لە سێبەری کام دەوەندا پشوو بدەم، مافی

سروشتیی خۆمە و کەس ناتوانێت ئەو مافەم لێزەوت بکات، کەچی وا دەرنەچوو!! دەرەنگێك زانیم منی دڵساف و ساویلکە زۆر هەڵەم، چونکە بۆم دەرکەوت لەناو هەر لێرەوارێکدا کە رۆحیانەتە سپییەکان لە سووتان رزگاریان کرد، لە سێبەری هەر تاشەبەردێکدا، کە دەست و پەنجەی خوێناویی خۆنەویستێك کەڤاڵێکی لەسەر نەخشاند، گورگێك لەوێ خۆی مەڵاس داوە.. ئەمانەی بۆم باس کردی برێك راستی بوون، بەڵام حەقیقەتی تاڵ، هەر هیچ نەبێت بەلای منی ساویلکەوە..
رۆژێك بە هۆی رێگە خۆشکردنی رێوییەکی فێڵباز بەر پەلاماری گورگێکی برسیی کەوتم، خۆ ئەگەر زوو فریای خۆم نەکەوتایەم ئەوا کەڵپەی لە کولۆك و لاتەراِفم گیر دەکرد و خوێناوڵی دەکردم، پاشانیش دەکەوتمە بەردەم و لمووزی کەمتیارە گەنە خۆرەکان!! دە ئیتر تۆ لە جیاتی من بیر بکەرەوە بزانە چەندێك ناشیرین و قێزەون دەبووم؟ باش بوو زوو هەستم بە ترسناکی ئەو پەیوندییە بە رواڵەت دۆستانە و لە ناوەرۆکدا دوژمنکارانە کرد، ئەو رۆژانە گەلێك نزیك بووم لە شێت بوون، وەخت بوو عەقڵ لەدەست بدەم، باوەڕم بە کەس نەمابوو هەردەم لەبیرکردنەوەی خراپدا بووم تا رۆژێك چاوم بە کتێبخانەکەی (کاکم)دا دەگێرا، قسەیەکیم بە بیردا هاتەوە، کە زۆر جار پێیدەووتم: خوشکێ، ئێمە لە ژینگەیەکی پیسدا دەژین، ژینگەیەك ئالوودەیە بە برێ ڤایرۆسی کوشندە، لە کۆمەڵگایەکی تووش بوو بە پەتای بیرچوونەوە و فەرامۆشکردنی مێژووە کارەساتاوییەکان ژیان بەسەر دەبەین، باوکەکانمان لە دڵسافی و جەهلی خۆیان بە هەڵە پەروەردەیان کردین، هەڵەیەك ئێمە پەی پێدەبەین، بەڵام چونکە بە شیرەوە دەرخواردمان دراوە، بێنەوەی بە خۆمان بزانین لە ئەقڵی ناوەوەماندا کەڵەکە بووە و دەبێت هەوڵ بدەین خۆمانی لێقورتار بکەین. بۆیە هەقە هەموو رۆشنبیرێك ئەو کتێبە بەووردیی بخوێنێتەوە.

چەند جارێك ئەو وتەیەی کاکم کەوتەوە بیر، تا رۆژێك دەستم برد و لەناو کتێبەکانیدا، کە پاش خۆی کەس دەستی بۆ نەبردبوون، ئەو کتێبەم هێنایە خوارەوە خوێندمەوە. دوای ئەویش، چەند کتێبێکی تر.. سوهراب، فەروغی فەروغزاد، مەحوی، نالی و زۆری تر.. تا وردەوردە بەرچاوم روون بووەوە، هاتمە هۆش خۆمدا و بڕوام بەخۆم پەیدا کرد. من کتێب فێریکردم، لەناو ئەم جەنگەڵستانەدا چۆن خۆم لە تەڵە بپارێزم و لە کاتی تەنگانەدا، بێشەرمانە و دەڵەشێرئاسا هێرشبەرم. ئاخر نازانم یانی چی، بۆ شەرم ئافرەت جوان بکات؟ ( ژنی شەرمن شارێك دەژێ ؟!) رێزم هەیە بۆ شێرە پیاوەکان، کە زۆر کەمن، سەری وەفایش دادەنوێنم لە حزووری رۆحی ئەو کەسانەدا کە، کەم ژیان و کەڵ ژیان، لەئەم رۆژگارەدا گورگە مرۆڤەکان گەلێك زۆرن و جوامێر کەم، ئەی وا نییە؟ تۆچی دەڵێیت؟

من پێشتر لە گفتوگۆیەکی تەلەفۆنیدا هەستم کرد خوێندەوارییەکی باشی هەیە و مرۆڤێکی وریا و ژیرە، ئەوا ئێستا بۆم دەرکەوت، لەپاڵ رۆشنبیریی و رەوانبێژییەکەشیدا ئازاری چەشتووە و کۆڵێك خەم و پەژارەیشی داوەبەکۆڵیدا، بۆیە تووشی نیمچە حەپەسانێك هاتبووم و هیچم پێنەووترا، ئەو لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو و وتی: ببورە وابزانم بەشی خۆم دوام، یا نەختێك دەروونی پەنگخواردووی خۆمم بەتالکردەوە، ئەوەش دەخەمەسەر قسەکانم و دەڵێم واهەست دەکەم زۆر لە زووەوە دەتناسم، بۆیە بەبێ پێچ و پەنا کەمێك داخی دڵم لەلات هەڵڕشت، وا نەزانیت زۆر رەشبینم، نەخێر دەرکم کردووە، کە ژیان بە هەموو تاڵ و سوێرییەکانییەوە هەر خۆشە، دەشزانم کەسی پاك و مرۆڤدۆست هەیە، دونیا هێشتا جوانی خۆی نەدۆڕاندووە.. مادام مرۆڤە جوانەکان لە شیعر نووسین، شیعری جوان نەکەوتوون... من قسەکەیم پێبڕی و وتم: وریابە هەموو شیعرنووسێکی جوان مەرج نییە مرۆڤێکی جوانیش بێت.. واتا مەرج نییە تۆ کە شیعرێکی جوان دەخوێنیتەوە مرۆڤێکی جوان و دادپەروەر و لێبووردە نووسیبێتی. زۆر کەس تەنیا لە کاتی نووسینی شیعردا شاعیرن و دواتر کە لێبوونەوە دەبن بە بازرگان و قاچاخچی و راپۆرتنووس، ئەوەش بزانە کەسانێك هەن پڕ بەپێستی وشەی شاعیر شاعیر و مرۆڤن، بەڵام ناتوانن شیعر بنووسن، چونکە ناتوانن بە نووسین خۆیان خاڵیی بکەنەوە، ئازاری زیاتر دەچێژن.. ئەو وتی: بەڵام سەرەڕای ئەو راستییانەش کە باست کردن هێشتا بە بەرییەوە ماوە ئێمەومانان بیر لە ژیانێکی خۆشتر بکەینەوە و هەوڵ بدەین ئاسوودە بژین. من دایکمم زۆر خۆشدەوێت، هەست بە قەرزاربوونی لەڕادەبەدەری دەکەم، ئاخر تەنیا منی ماوە بۆیە هەرچی لە وزە و توانامدا هەیە تەرخانم کردووە بۆ خزمەتکردنی ئەو. هەتا لەژیاندا مابێت منیش هەر وا دەمێنمەوە و خزمەتی دەکەم، کە کۆچی دواییشی کرد ئەوا منیش لەوانەیە بیر لە (کۆچ) بکەمەوە و سەری خۆم هەڵبگرم بۆ دەرەوەی وڵات، دەچم بۆ لای کوڕە گەورەکەی (شەم)ی خوشکم، ئێستەش ئولفەتم بە دایکمەوە و بە تەنیاییەوە گرتووە، هاوڕێی راستەقینەم، جگە لەدایکم تەنیا کتێبە و بەس.. دە پێمبڵێ تۆ خەریکی چیت؟ من قسەی زۆرم کرد وا بزانم بێزارم کردیت، دەی تۆش کەمێك بدوێ..

من لە دڵی خۆمدا وتم: ئۆۆۆ هۆ دیسان کۆچ؟ ئاخر کورد راستی وتووە (مارانگەستە لە پەتی رەش و بازوو دەترسێت). بۆیە هەستم بە جۆرێك لە بێهوودەیی کرد و زانیشم زۆرم پێچووە دەبێت هەڵسم. جانتاکەم کردەوە رەشنووسی (منداڵێك لە مەملەکەتی باوکەکاندا)م دەرهێنا، هەستامە سەر پێ و بۆم راکێشا:

- شیعرە؟

+ نا  شیعر نییە، ماوەیەکی باش بەئەم نووسینەوە خۆم  خـەریك کـردووە، ئەگـەر تاقـەتی خوێندنەوەت هەیە، ئەوا بۆتی بەجێدەهێڵم.

کانی بەپێوە راوەستابوو، دەستی درێژکرد، یەکەم بەرگی لادا، تێیڕوانی و وتی: ناونیـشانەکەی سەرنجڕاکێشە.. ئینجا بەرگی دووەمی لادا و تێیڕوانی، هەستم کرد کوڵمەکانی خوێنیان تێزا و وەك سێوە لاسوورە ئاڵ داگەڕان. من تەریق بوومەوە. پاش کەمێك سەری هەڵبڕی و بە دەنگێکی ناسك و نەرم، کە بۆنی عەتری شانازی و کەمێك نازی لێدەهات وتی: بە منت پێشکەش کردووە، وانییە؟ من تەنیا سەرم بۆ لەقاند، ئەو وتی:

- گەرمیانییەکی ئاوارە و دۆستی دێرینی ئازیزانم شەونخونیی بکات و کتێبێك بنووسـێتەوە و پێشکەش بە منی بکات چۆنی ناخوێنمەوە، بەئەوپەڕی شانازییەوە..

بەدەم دەرگاکەوە ماڵئاواییم لێکرد، بەڵام ئەو بەدوامدا هاتە دەرەوە، وادیـاربوو بـەدەم ڕێـوە، وەکو خوێندەوارێکی بە ئەزموون، دوالاپەڕەشی هەڵدابووەوە بۆیە وتی: دوا بەشـیش، مەبەسـتم ( مەملەکەتی گورگەکان)، یەکەم کەس هەر خۆمم دەیخوێنمەوە، وانییە؟

+ هیوادارم دایە گەورە تەمەنی هەر درێژ بێت، بەشکو ئەمە خوایە تۆش کۆچ نەکەیت، ئاخر تەنیا بیرکردنەوە لە کۆچ پردی پەیوەندی رۆحم بە رۆحێکی زامداروە دەهەڕۆژێنیێ، دار شاتووەکەی هەستی قەسیدەم بە کاڵی دەوەرێنیێ، هەر وشەی (کۆچ)یش بوو وایلێکردم بەرلە جیابوونەوە بەڵێنی بدەمیێ تا چەند پارچەیەك لە قەسیدەیەکی خۆمی بو بنێرم، کە باس لە ئازاری کۆچ دەکـات، ئـەو کۆچەی وەك تووڵەمارێکی دەیمی رۆژگارێك گەستمی و تا ئەمرۆش تاوناتاوێك ژەهرەکەی بە بالای رۆحمدا دەگەڕێت و دڵم هەو دەکات، ئەوەندە هەو دەکات تا لە پـیێ دەکـەوم. پـاش چـەند رۆژێـك بەڵێنەکەم هێنایەدی و ئەم چەند کۆپلەیەم بۆ رەوانەکرد.

**بەیادی رووی گوڵیێ، چاوم لەسەر بەردیێ کەگریابیێ**

**کەبەردیان کرد بەشووشە پڕگوڵاوە عەشق ئەبیێ وابیێ**

**"پیرەمێرد"**

کاتژمێر، سێی پاش نیوە مەرگی شەوە بە سوتانی عەشق
شوێن، کانییەکی دوورە دەس لە خەیاڵی دار بەڕوویەکی زرخەو
رەنگ، رەنگی رۆحە، لە تاڵە سپییەکانی پرچی کچێنیی دایکم دەچیێ

خەیاڵ، لە پارێزدا نوقمی باوێشکە، لە مامزێکی بەلەسەی سرك دەڕوانێ
سەرەتا، ئەگەر فریا نەکەوین، سەرە مەرگی سەرەتایە
سەرەتا، لەززەتێکی نەشئە بەخشە، گەر دڵۆپە سۆزێك بە پەنجەی شەهادەت لێوی عەشق تەڕکا،
لەبەر خاتری گوڵە، گەڵا دەبێتە پەناگەی چۆلەکەیەکی ترساو لە داتەپینی ئاسمان
سەفابەخشە، ڕێبوارێکی ماندوو لە کۆشی کانیدا خەوێکی خۆشت لێبکەوێ
بۆ سبەی ڕێگاکان گوڵەمێخەکیان لێدەڕوێ
خونچەکان دەم دەکەنەوە و دەبن بەگوڵ،
دەی کەوا بوو، خوایە گوڵێك هەڵنەوەرێ



بەیانیی زوو بە شڵپەی دەسنوێژی سەفەر، مەنگیی کانی دەشڵەقێنم
لە حوزووریدا دەنوشتێمەوە و پێیدەڵێم:
دەستم دامێنت کۆچ مەکە،
ئاخر لەگەڵ کۆچی تۆدا، کانی بیری شیعرەکانم دەچۆڕێت و وشك دەکا
کۆچی تۆ بەرەزای عاتیفەی تەڕم دەژاکێنێ
سەفەری تۆ، دارشاتووەکەی هەستی قەسیدەم بە کاڵی دەوەرێنێ
پێیدەڵێم:
چاوی کۆچ کوێر بێ و چاوی من قوربانی تۆ
کوانێ کانی دوای کۆچی تۆ، کلاوکوورەی عەشقی شوانییم، لە شەوە کەژی فیراقا
شاپەڕی باڵی لێتەڕکا و لە گلێنەی ئەشکی سۆزی چاوەکانتا چینە بکا..
چی پێبڵێم؟
بڵێم مەڕۆۆۆۆ؟
کەمێکی تر پاش هەڵهاتنی خۆر لە سووتانی من، دەچمە خزمەتی
دەرۆم و دڵم دەخەمە سەر لەپی پەڵە هەورێکی سەرهەڵگرتووی مەست
مەست بە شەستە بارانی ئەوین
لەوێ بەزمانی رەشەبا ئەدوێم
بە تیژیی بروسکە دامێنی دەگرم و

به زاری سووتان دەپاڕێمەوە، سووتاااااان
دوایی، کشتەکی کرژی زمانم خاوڕیس دەکەمەوە و
بە باوەشێنی ڕەشمەڕەیحانە، فرمێسکی سەفەری ئەو و ئارەقەی پەشیمانیی خۆم دەسڕم
ئیوارە درەنگ وەختێك کە (زوهرە) لە بورجی کانی بانگی کۆچ دەخوێنێ
مانگ دەسنوێژی سەفەر هەڵدەگرێ و دەکەوێتە ڕێ
هەسارەکان دەڕژێنە سەر بەرماڵی ئاو و نوێژ بۆ کانی دائەبەستن
ئەو وەختە من، تریفەی ژێربی پەلم دەگرێ
دەمبا و دەمبا تا پێیدەگەم
دەس لە دامێنی گیر دەکەم و پێیدەڵێم:
ئەز لە گوێلێ ئاودا دەخنکێم عەزیزم
کەچی ڕۆحم لە قووڵایی عەشقی تۆدا تا دێ بای باڵی خۆش دەبێ
لەوێ، بە نەرمی شنەبا
بە فێنکیی شەپۆل
بە هێمنیی داباریینی کلووە بەفر
کپیی بنار
بە عەشقی پەڕەسێلکەی لێوقەیتانی بەهار
بە سەر سەریا دادەبارم و پێیدەڵێم:
چاوی ڕۆح لە تامەزرۆیی دیدارت وەختە کوێر بێ
بۆیە بەم ناوەختە هاتم
ببوورە عەزیزم ببوورە
هاتووم لە باخچەی سۆزی سۆفیانەم بروانە
لە شیلەی غوربەتی ڕۆحم تێر هەڵمژە و ئەم سووتانەم خامۆش بکە
ئێژم: ئەی گوڵە ڕەنگ پەمەییەکەی عەرشی غورروور
ئەی پاکیزەیی و بێگەردیی گوناهی من
لەم بێدەنگییەت دەربچۆ
لە لوتکەی غورروور دابەزە
گوڵ بە خەرمانی نازەوە

کە پێیشەرمە ناز بفرۆشێت
منی نامۆ زەکاتی نازم پێدەشێت
ئیتر بەسە بالآی سەبرم گڕی تێچوو
سووتا.. سووتا
دەوەرە دەستم بگرە
با بچینەوە بۆ زەمەنی ماریفەت
بەرەو ساتەکانی منداڵیمان بگەڕێینەوە
بۆ ئەو ساتانەی دەسنوێژمان لێك نەدەشکا
بۆ کۆڵانەکانی دوور لە سێبەری شەرم و ترس
ئەو زەمەنە کە عەشق خەتی نەدابوو
بەرماڵمان بۆ عاتیفەی تەڕ رادەخست
بە بێ دەسنوێژ نوێژمان بۆ پاکیی دادەبەست
بە بێ نییەت رۆژوومان بۆ خوا گچکەکەی باوك دەگرت..
ئێستەش کاتی ئەوە هاتووە بە کۆڵێ عەشقی هەجیجیەوە
بچینەوە بەرەو پاکیی رۆح
بۆ کۆلآنەکانی چاوشارکێی بەرائەت
بۆ ئەو رۆژانەی کە لە قرچەی نیوەڕۆدا
لە سێبەری دارشاتووەکەی رۆخی کانی ماڵمان دەکرد
نە من شەرم دایدەگرتم
نە تۆش چاوت دادەخست و نە کوڵمت سوور هەڵدەگەڕا
دەبا بگەڕێینەوە بۆ ساتەکانی منداڵیمان
کە دەسنوێژمان لێك نەدەشکا
با بگەڕێینەوە عەزیزم بەرەو دوا!!!!!!
بۆ... دوور..
بەرلەوەی هودهودی رۆحمان لەم غوربەتی عاتیفەیەدا بخنکێ،
دەبا تێر یەك بخۆینەوە

***

# منداڵێك له مەملەكەتی باوكەكاندا

لەنەو شوێنەی كە ئێستا جێگای رامانمە راوەستابووم، كە لە دوورەوە دەركەوت مس وەك بازێكی برسی ئەو هەردە و هەڵەتە، چاوم تێبڕی هەتا لێمنزیك بووەوە. ئەمجارەش تانوپۆی ترس و شەرم تێكەڵ بە یەك بوون و پەرژینێك بەرچاوی گرتم. ناچار سەرم داخست تا تێپەڕی. ئینجا تێمڕوانی هەتا خۆی كرد بە ئەوسەری كۆڵانەكەدا و لە چاو ون بوو.

دوێنێ لەهەمان شوێندا راوەستابووم. لە دوورەوە دەركەوت، دەریایەكی شینباو سەربەرەو ژوور شەپۆلی دەدا و شەقامەكەی دەشڵەقاند. ئەو نۆمایشێكی گەردن كەڵەگەتی رەسەن و خۆشڕەوت بوو. زۆر سەرنجراكێشتر لە جاران. رووبارێك شیرینی و جوانیی دابووە پێش خۆی، كە نزیك بووەوە سەرم داخست و كەمێكیش سەر بەرەو ژوور رووی خۆمم وەرچەرخاند. ئەم روو وەرچەرخاندنە فێڵێك بوو كردم هەتا چاوەكانم بكەم بە جووتێ هەڵۆ و بە دوایدا هەڵیانفڕێنم. كاتێكم زانی لە ئەوبەری شەقامەكەوە پەڕییەوە ئەم بەر و تەواو لێمنزیك بووەوە. ئیتر ناچار بووم سەر هەڵبڕم. شەقاوێك لە ئەولامەوە راوەستا. هەردوو كۆترە كێوییەكەی سەر قەفەسی سینەی، كە بە دەسماڵێكی رەنگ شەوەیی تەنك داپۆشرابوون، لە عەجوولیی و باڵەتەپە كەوتن و ئارام بوونەوە، بە رووگەشییەكی پارێزەرانەوە وتی:

- ئەم كاتەت باش!!

من لە شەرم و سەرسامیدا دڵم وەك چۆلەكەیەكی بەندكراو كەوتە فرتەفرت و لە ترسانا وەخت بوو نێوان دوو پەراسووم كوون بكات و دەرپەڕێت، بە دەنگێكی لەرزۆكەوە وابزانم پێموت: باشتر..

- چۆنی، باشی؟

+ سوپاست دەكەم

- دەزانم نامناسیت

+ ئاااانا... ئەوەڵلا بەداخەوە، ئەو شانازییەم پێنەبڕاوە. تۆ...هاها، ئەشێ لە بۆنەیەكدا یەكمان بینیبێت و من زاكیرەم خیانەتم لێبكات ئێستە ئەتناسمەوە..!

- دووراودوور تۆم دیوە، بەڵام دەرفەتی یەکناسینمان بۆ نەرەخساوە.

ئەو بە ئەوپەڕی باوەڕبەخۆبوون و بوێرییەوە راوەستابوو، قسەی دەکرد، کەمێك هاتمەوە سەر خۆ و پێمووت:

+ دەتوانم بزانم ئێوە کێن خانم؟

- من کچی (بارام)م و خوشکی (شەم)م، ناوم (کانی)یە، دایکم دەڵێت ئێمەش گەرمیانین و پاش ئەوەی باوکم باری کردووە بۆ (کەرکوك) من لە دایکبوومە..

من کە ناوی بارام و شەم و گەرمیانم بیست، ناوی (کانی بارام )یش لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر بوو. هەروەکو ئەوەی لە ژێر نەشتەرگەرییەکی قورسدا دەرچووبێتم و هێشتا کاریگەری سڕبوون بەری نەدابم، ناوەها دێی (کانیماران) و کەسایەتییە سەیر و دڵساف و منداڵەکانی هاوتەمەنم وەك برووسکە بە خەیاڵدا هاتن و گوزەریان کرد.

پێموت: ئێستە رەنگە بتناسمەوە، دەی کەوا بوو با بچینەوە ماڵ..

سوپاس مەبەستم بوو خۆمت پێبناسێنم. خوداحافیز.

من زمانم لەناو دەمدا بوو بە کلافەیەکی دەزووی لوول خواردوو، هیچم پێنەگوترا.

ئەمڕۆ ئەو پێناساندنە چاوەڕوان نەکراوەی کانی پەلی گرتم و بردمییەوە بۆ هەمان شوێن. کەمێك ئەولاتر پاڵمدایە دارتەلەکەوە و خەیاڵ بردمییەوە. ئەو ئاخاوتنە هەنگوینییە لەنەو چەند چرکەیەدا، کە خۆی پێناساندم و ئەو هەموو قسە خۆش و یادەوەرییە شیرینانەی کانیماران، کە بیستبووی و بەچاو بۆی گێڕامەوە لەگەڵ ئەو تەنکە هەوری شەرمەدا، کە بە رووخسارییەوە بوو، بە کردنەوەی خونچەی دەمی زوو رەوییەوە و نم نم خۆشەویستی باراند بەسەر رۆحمدا. سۆزێك بوو هەڵیگرتم تا بچمەوە بەرەو کانیمارانی بەرائەت و منداڵیم.

کە کەوتمە رێ بەرەو فەرمانگەکەم، شەقامەکە وەك سالآنی زوو چۆڵ و تەسك دەهاتە بەرچاوم. ژمارەی ئۆتۆمبیلەکان کەمتر و مۆدێلی کۆنتر. پاسەکە نزیك گەراجی کەرکوك راوەستا و بەپەلە دابەزیم و رووم لە ئۆتۆمبیلەکان کرد. شۆفێرەکە وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی، کە چاوی پێمکەوت بانگی کرد: (یەك نەفەر کەرکوك..دەڕۆین). نزیك بوومەوە، کە دڵنیا بوو نەفەری ئەوم، بە دەست هێمای بۆ لای تاکسییەکی مارسدیس کرد و وتی: بچۆ سەرکەوە..

کوشنی دواوە سێ کەسی لێدانشتبوون، ویستم دەرگای پێشەوە بکەمەوە، بەڵام مێردمنداڵێك دەرگاکەی کردەوە و دابەزی، هەنگاوێك دوور کەوتەوە و بە فیزێکەوە ئیشارەتی بۆ کردم، کە سەرکەوم، بۆیە منیش بە سەرلەقاندنێك رەزامەندیم نواند و خۆم ترنجاندە لای گێری ئۆتۆمبیلەکەوە. شۆفێرەکە سەرکەوت و ئۆتۆمبیلەکە کەوتەرێ. قوشتەپە و پردێ و پاشان بە دەستی چەپدا حەسارمان بەجێهێشت و لە مۆرەی سەرباز و ئەمنەکانی بازگەی کەرکوك رزگارمان بوو. لە نزیکترین شوێن بۆ گەراجی کفری دابەزیم و بە بێهیچ خۆ خەریککردنێك خۆم گەیاندە گەراجی کفری، روانیم پاسەکەی (حاجی ئەحمەدە خرە) لە دەرچووندایە. حاجی ئەحمەد، کە چاوی پێمکەوت بە دەنگێکی کەمێ بەرز وتی: وەرە سەرکەوە مەگەر لەلای چەپەوە بەسەر سەلاجەکەوە دابنیشیت، ئەوەش بزانە ئیتر ئۆتۆمبیل دەرناچێت، چونکە نەفەری کفری نەماوە..

هەر بە دەم رێوە پێموت: ئەوە گرفت نییە. گرنگ ئەوەیە ئەمشەو لە کەرکوك نەمێنمەوە.. بۆیە بەبێهیچ خۆخەریککردنێك سوار بووم و پاس کەوتە رێ.

وەك ئەوەی ئەخشەی کوردستانم لە بەردەستدا بێت و شوێنی کفری بۆ قوتابیان دەسنیشان بکەم، ئاوەها بەچاو لێکنان و کردنەوەیەك، شارم لە بەردەستدا بوو، ئەو شارەی کە وەڕس بوومە لێی و لە چاوەڕوانی پشووی سەری ساڵدا هەڵدەقرچێم تا بچمەوە بۆ گوندەکەی خۆمان.

***

لەئەم رۆژانەدا شار جموجۆڵێکی بەرچاوی پێوەدیارە. جووتیارەکان لە لادێوە رووی تێدەکەن بۆ دەمزەردکردنی داس و ناڵکردنی گوێدرێژ و وڵاخەکانیان و کڕینی پێداویستییەکانی وەرزی دروێنە. تۆی چاودێر، کە دەچوویتە بازاڕ و قەیسەرییەکە و دەتروانی، هەر چۆن شارەمێروولە، لە وەرزی پاییز و بەر لە سەرپەڵە دەشڵەژێت و مێروولەکان بۆ کۆکردنەوەی پێداویستییەکانی بەردەوامبوونی ژیان دێن و دەچن، ئاوەها جووتیارەکان پاش کڕین و مامەڵەیەکی سەرپێیانە لەگەڵ بازرگان و سەنعەتکاراندا، بە رووگەشییەوە هەگبە و خورج و چارۆگە پڕەکانیان دەدایە بنهەنگڵ و سەرشانیاندا و لە شار دەردەچوون.

من یەکێك بووم لەئەو قوتابیانەی کە لە لادێوە هاتبوونە شار و لەوێ دەیانخوێند. خۆشترین کاتم پشووی سەرەساڵ بوو، چونکە دەگەڕامەوە بۆ ئەو ماڵەی کە پڕپڕ بوو لە

سۆز و خۆشەویستی، ئازادیی و چاوسوورکردنەوە، تێخوڕین و ترسی جۆراوجۆری تاڵ و شیرین.

چەند رۆژێکە پشووی سەری ساڵ دەستی پێکردووە و باوکیشم هاتۆتە شارەوە. ئەم هاتنەی باوکم تام و چێژێکی لە رادەبەدەر خۆشی هەیە بۆ من، چونکە دەچمەوە لای ئازیزانم، دەچمەوە لای کۆلانەکانی چاوشارکێی بەرانەت، بۆ هەڵمژینی بۆنی سمڵ و مێخەکی ناو سنوقە دارینەکەی ئەو نیشتمانە بچکۆلانەم. ئەو رۆژە باوکم جووتێ جاشکەوشی لەلای وەستا (عابیدی پینەچی) بۆ کڕیم، دواییش هێسترە ماچەی چەمووش و جووتە وەشێنی بردە لای (حاجی خالیدی ناڵبەند) و بە هەزار فەلاکەت تا هەردوو دەستیان ناڵ کرد ئارەقەی سوور و شینیان دەردا. پاش نیوەڕۆ داسە دەمزەردکراوەکانی لە وەستا (مەحموودی عەلەباوەش ) وەرگرتەوە و هاتەوە بۆ ماڵی مامم. لەوێ شەکر و چا و پووشە خورماکەی لەگەڵ کەلوپەلەکانی تردا تاوتوێ کرد و لە هەگبەکەی ئاخنی. پاشان هەڵیگرت و هێنایە بەر دەرکی حەوشە و لە هێسترەکەی بارکرد، ئینجا رەشمەکەی راکێشا لە پاڵ بەرزاییەکەی ئەولاتر رایگرت و سوار بوو. من چەند شەقاوێك دووری راوەستابووم. بانگی کردم و چوومە پێشەوە. ئەو نوکی پێی چەپی لەناو کلاشەکەیدا کرد بە ئاوزەنگی و لە پی چەپم هاوێشتە ناولەپی چەپییەوە و پێی چەپم خستە سەر پێی چەپی و ئەزنەکێکم دا. ئەویش سەربەرەو ژوور هەڵیکێشام و قنج بەپشتییەوە گیرسامەوە. پاشان باوەشم کرد بەناوقەدیدا و بەناو چەمی (قوشەچاپاندا) کەوتینە رێ. هێسترەکە رەوتێکی خۆشی دەکرد، دەنگی ناڵ و بزمارەکانی کە دەیکێشایە خڕە بەردەکاندا ئیقاعێکی رێك و خۆشی بە گوێمدا ئەدا.

کە لە چەمەکە پەڕینەوە بەلای راستدا روانیم (خدر کووزەچی) لە بن سێبەری دار کنارەکەدا، نزیك کەرەکەی، کە ناوی لێنابوو ( بێگ)، راوەستابوو. لە ناونانی کەرەکەیدا بە بێگ، مەبەستی قائیمقامی شاربوو!! ئاخر ناهەقیشی نەبوو، چونکە جەنابی قائیمقام (کەر)ی بە دوژمنی باوەکوشتەی خۆی دەزانی. کە لەناو شاردا کەرێکی بدیتایە چاوی دەپەڕییە تەوقی سەری و بە پێش چاوی خەڵکەکەوە شێتانە پەلاماری دەدا و دەیدایە بەر شەق!! ئەو رۆژێك بە یەکێك لە شەقامەکانی شاردا تێدەپەڕێ و بە رێکەوت نێرەکەرێکی بەرچاو دەکەوێت، ئیتر بێ سێ و دوو پەلاماری دەدات، کەر هەڵدێت و قائیمقام بە دوایدا تا تەواو لێینزیك دەبێتەوە و لە دواوە بە هەموو هێز و توانای خۆی شەقێکی

تێهەڵدەدات، بەلاَم بۆ بەدبەختی جەنابی قائیمقام نووکی قۆندەرە قوونپاژنە بەرزەکەی لە پالدمی کورتانی کەرەکە گیردەبێت و لەسەر سەر دەدات لە زەوی!! کلۆکی وا ئازاری پێدەگات، ناتوانێت راست ببێتەوە تا پۆلیسەکان فریای دەکەون و دەچنە ژێر باڵی و راستی دەکەنەوە، ئیتر لەئەو رۆژەوە ئەو بڕیارە ناودارەی دەرکرد، کە نابێت بە هیچ شێوەیەك کەر لە شاردا بەرەلاَبکرێت، لەئەوەش زیاتر وتبووی: قەدەغەیە و نابێت بە هیچ شێوەیەك نێرەکەر لەکۆلاَنەکانی شاردا بزەڕێنێت، ئەگینا خاوەنەکەی بۆ ماوەی یەك هەفتە زیندانی دەکرێت!! لە پاشکۆی بڕیارەکەیدا ئەم رستەیەی بۆ زیادکردبوو: ئێمە خاوەن نێرەکەرەکان هان دەدەین، کە کەرەکانیان بە خەڵکی دەرەوەی شارەکەمان بفرۆشن و لەجیاتی ئەوە مانگایەکی شیردار بکڕن، ئەوا ئێمە بە پێی توانا یارمەتی دەدەین..

جا سەیر لەئەوەدا بوو کەس نەیدەزانی هۆی ئەم رق لێبوونەوەی قائیمقام لە کەر، بە تایبەتی نێرەکەر چییە؟ لەزمانی هاوڕێیەکی گیانی بەگیانی قائیمقامەوە دەیانگێڕایەوە کە شەوێك لە حاڵەتی بەدمەستیدا وتبووی: ئاخر من چۆن رقم لە نێرەکەر نەبێتەوە، من نازانم خودای گەورە بۆ من بە عەبدی خۆی دەخولقێنێت و داوام لێدەکات عیبادەتی بکەم تا لەئەو دونیادا لە ئاگری دۆزەخ بمپارێزێت و لە نیعمەتی بەهەشت تێر و مەستم بکات، کەچی بە مەخلوقێکی بێهێز و توانا و کەم حەوسەڵە خولقاندوومی! بەلاَم نیعمەتی سەبر و تەحەمول و " ئەوشتەی تریش کە حەق سێنە" بە کەر بەخشیوە و کەم پیاو هەیە حەسوودی پێنەبات! خۆ ئەگەر خودای عەزەوەجەل سەرپشکی بکردایەم و پێیبگوتایەم "عەبدولئیلاە" تۆ سەروەت و سامان و دەسەلاَتت پێخۆشە پێت ببەخشم یان بە کەرێکی بەهێز و توانا و ساحێب حەوسەڵە بتخولقێنم؟ ئەوساکە من خۆم دەمزانی چۆن وەلاَمم دەدایەوە!!

بەلاَم قائیمقام چەندە رقی لە کەر بوو، خدر سەد ئەوەندە رقی لە قائیمقام دەبوویەوە، بۆیە رووی دەمی کەرەکەی دەکردە ناو شار و زەڕی لێدەکرد تا قائیمقام وەڕس بکات! ئاخر ئەو هەموو کەرە، کە لە خان و خانسەراکانی شاری کفری مۆڵیان دەخوارد و تێر کا و جۆ دەکران، نەك بە قائیمقام، تەنانەت بە هەموو دامودەزگاکانی رژێمی ئەوساکەش دەمکوت نەدەکران!!

خدر کابرایەکی کەڵەگەتی رەقەڵەی پشت کەمێ چەماوە بوو. هەردەم کراسێکی عارەبی لەبەر دەکرد و قایشێك، یان پەڕۆیەکی لە پشت دەبەست. ئەو پیاوێکی شیعە

مەزهەبی سمێڵ شۆڕی خۆشەعـشەری قـسەلەڕوو بـوو. کـە قوتابییـەکان بـۆ سـەعیکردن دەچوونە ئەوبەری چەم، بانگی دەکـردن و پێیـدەگوتن: کـوڕە چـی دەخـوێنن؟ مـەخوێنن، مەکتەب نانتان نادات، نانیشتان بدات ئەوا قەت دەوڵەمـەنتان ناکـات، ئـەزانن چ بکـەن باشە؟ بچن ئیشێکی تر بکەن، سەیر بکەن من و ئەو کابرایە هاوڕێی یەك بووین، ئـەوەتا ئەو ئیشی کرد تا دەوڵەمەند بوو نیوەی موڵکی شاری بۆ خـۆی کـڕی، دە بـزانن، چـونکە من ئەو ئیشەم نەدەزانی ئەبێت هەتا مردن هـەر خـەریکی کـوورە گـەرمکردن و گـۆزە و کووپە سوورکردنەوە بم و بەئەم کولەمەرگییە بـژیم، بـە قـسەم بکـەن مەچـنە مەکتـەب، ئەگەر دەچنە مەکتەبیش واباشە دەنکـە دەنکـە ئیـشی تـریش بـزانن، ئـەو ئیـشەی مـن مەبەستمە و ئێوە بە قورسی دەزانـن تـەنیا یەکـەجارتان زەحمەتـە، ئـەوەڵجار کـەمێك، ئا..ئا هەر کەمێك ددان بەخۆتاندا بگرن، بۆ دووهەمجار نەختێك دەچووزێتەوە، ئیتر دوایی ڕێویەکیشی پیاتدا بچێت بە خۆتان نازانن!! دوایـی دەبـن بـە خـاوەن خـان و سـەروەت و سامان و دەبن بە پیاو ماقووڵی شار..



گەڕەکی (ئەوبەری)مان بەجێهێشت و نیو کاتژمێرێکی پێنەچوو هێسترەکە ملی نا بـە هەورازەکەی (ملەی کەر ترێنەکە )وە. لەئـەو بـەرەو ژوورە، کـە بـاوکم پێیـوتم: دەسـتت بکەرە ناو پشتێنەکەمدا و قایم خۆت بگرە بـا نەکـەویت، ملەیەکـە، بـە لای ڕۆژهەڵاتـدا دەڕوانێتە سەر (قاتەکانی کفری)دا، ئەوێ چەند ریزە شـاخێکی نـزم و ڕەمەتـە تـاوێرێکی یەك لە دوای یەك ریز ریز ڕوویان کردۆتـە قیبلـە و چـەماونەتەوە، ئـەو ڕۆژەی کـە خـودا فەرمانی دایە حەزرەتی ئیبراهیم تا کەعبەی ماڵی بۆ بنیـات بنێـت، گـشت شـاخەکانی سەر زەوی ڕوویان لە قیبلەکرد و کەوتنـە ڕێ، بـەڵام ئـەم ڕمەتـە تاوێرانـەی لای خۆمـان فریانەکەوتن و بنیات و بینای ماڵی خۆدا کۆتـای پێهـات، بۆیـە ڕووەو قیبلـە ئـا بەئـەو شێوەیە وشـك بوونـە و بـە تامـەزرۆوە لـە قیبلـە دەڕوانـن! ئـەم ڕێگـا سـەرەکییە، کـە دێهاتەکانی دەشتی گەرمیان و بنەی جاف بە شاری کفرییەوە دەبەسـتێتەوە بـە نـاو ئـەم قاتە پێچاوپێچەدا تێدەپەڕێ.

لە ساڵی ١٩٦٣ بە نیازی پەلاماردانی دێهاتەکانی گەرمیان هێزێکی سەربازی سوپای عیراق بە چەند تانکێکەوە گەیشتە شاری کفری و بۆ چـەند ڕۆژێـك لـەوێ مـۆڵی خـوارد، هێزی پێشمەرگەش کە لەئەو نیازە ئاگادار بوویەوە ڕووی کردە قاتەکان و لەوێ سـەنگەری

لێدا، هەر بۆ پشتگیری هێزی پێشمەرگە باوکم تفەنگە هۆڵەندییەکەی (حاجی سەعید جۆلا)ی کردە شان و خۆی گەیاندە شەڕگەکە. پاش چەند رۆژ ئامادەکاری، تانك و پیادەی ئەو هێزە سەربازییە روویان کردە سەنگەرەکانی پێشمەرگە و شەڕ دەستی پێکرد. پاش پێکدادانێکی قورس، هێزە سەربازییەکە توانی رێگاکە بکاتەوە و پێشڕەویی بکات.

(عەبە ئامە) ناوی پێشمەرگەیەکی قارەمان و بە وەفای شۆڕش و رێبازی بارزانی بوو، کە لە بیروهۆشی ئێمە و خەڵکی ناوچەکەدا رەگی داکوتاوە و هەرگیز لە یادمان ناچێتەوە. ئەو لە پاڵ رەمەتە تاوێرێکدا سەنگەرێکی مەحکەم لێدەدات، دەکەوێتە شەڕەوە و پێش لە بەرایی ئەو هێزە دەگرێت، کە رووەو بەرزاییەکەی لای ئەو ملی دەنا، بەڵام کە سەنگەرەکەی ئاشکرا دەبێت، تانکەکە رووی بەرەولای ئەو وەردەچەرخێنێت و گوللە تۆپێکی ئاراستە دەکات، گابەردەکەی ژوور سەری دەپێکێت و لا تاوێرێك دەست و مەچەکی دەکات بە ژێرەوە، ئەو هەوڵێکی زۆری دابوو لە ژێر باری ئەو تاوێرە قورسە دەرباز بێت، بەڵام هەوڵەکەی بێسوود دەبێت، هەر لەوێدا بە دەست و مەچەکی شکاوەوە دەکەوێتە بەر دەستی دوژمن و لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن بۆ ناحیەی (سەرقەلا).

لەناحیەی سەرقەلا و پاش پرسیار و وەڵام و لێکۆڵینەوە فەرماندەی هێزە سەربازییەکە وێنەیەکی مەلا مستەفای بارزانی نیشانی ئەو پێشمەرگەیە دەدات و لێیدەپرسێت:

- ئەم وێنەیە دەناسیت؟

ئەویش دەڵێت: کێ هەیە وێنەی باوکی خۆی نەناسێتەوە.

- دەی باشە تفێکی لێبکە ئازادت دەکەم.

+ ئەو کەسەی تف لە وێنەی باوکی خۆی بکات زۆڵە.

- باشە تەنها یەك جوێنی پێبدە بەڵێن بێت ئازادت بکەم. ئاخر ئەگەر بە قسەم نەکەیت بە پێش چاوی هەموو دانیشتوانی ئەم شارەوە گوللە بارانت دەکەم.

+ من کوڕە کوردێکم و مستەفا بارزانی باوکی کوردانە. ئەو کوردەی جوێنی پێبدات زۆڵە.

بۆیە هەر لەو شوێنەدا و بە پێش چاوی دانیشتوانی شارۆچکەی سەرقەلاوە فەرمانی گوللە بارانکردنی دەدات و شەهیدی دەکەن.

دووهەمین شەڕی گەورە و زیانبەخشی قاتەکانی کفری لە هەمان ساڵدا روویدا، لەو شەڕەدا بە هۆی هەڵەیەکی سەربازیی بەرپرسەکانی هێزی پێشمەرگەوە (٣٨) پێشمەرگە

گیانیان کرده قوربانی خاك و نیشتمان، هەر لە هەمان جێگادا لە دوو گۆڕی بـە کۆمەڵـدا بە خاك سپێردران.



هێسترەکە تا ئەو هەورازەی بڕی، بنگوێی کەوتـە نارەقـە و کـەفکردن. ئـەو حەیوانـە بەهێزە ئەوەندە بە توندیی هەناسـەی دەدا فیشکەی لـووتی لـە دوورەوە دەبیـسترا. پاشـان سەر بەرەوخوار شۆڕبووەوە بەرەولای (باخی تـورکی) و ئینجـا بـە دەسـتی راسـتدا رێگـا پێچاوپێچەکەی بڕی بەرەوهەردە و چەمی (سەرشۆراو).

ئـەم دەوروبـەرە، پانتاییـەکی شـێدار و شـۆرەکات و زەلکـاوە و هەردەوهەڵـەت و تووشەیـشە. ئـەو سـالآنەی کـە دزیـی و جـەردەیی و رێگریـی بـاوبوو، لەئـەم رێگـا پێچاوپێچانەدا زۆرێك لە ئەو کەسانەی کە بە باخەڵی پڕ و باری شەکر و چا و خورماوە لە شارەوە دەگەڕانەوە بۆ گوندەکانیان، لە لایەن جـەردە و رێگـرەوە رووت دەکرانـەوە و بـە دەستی خاڵیی و بە هەناسەی ساردەوە دەگەڕانەوە گوندەکانی خۆیـان. جـاری واش هـەبوو تەقە تفەنگ لە نێـوان جـەردە و کاروانـچییەکاندا رووی ئـەدا و رێگرەکـان پاشەکـشەیان دەکرد.

کە سەرشۆراومان بەجێهێشت هەتاوەکە تینی بۆمان هێنابوو، بۆیە بـاوکم سـەڵتەکەی لەبەر داکەند و کێشای بەسەریدا. منیش لە پشتییەوە، چۆن جوجەڵە مریشك سـەردەکاتە بنباڵی دایکیدا، ئاوەها سەرم کرد بە ژێر سەڵتەکەدا، پاشان وەکو پیشەی هەمیشەیی کـە لەگەڵ خۆیدا دەیبردمەوە بۆ ئاوایی، دەستی کرد بە بەرباخەڵیدا و وتـی: کـوڕم لوولەیـەك کەبابم لە کەبابخانەکەی (مەحموود ئەبو شوارب) بۆ هاوردویت ئەیخۆیت؟ ئیتر بـە بێئـەوەی چاوەڕێی وەلآمی پرسیارەکەی بکات، دەستەسڕە گـەورە شـینەکەی دەرهێنـا و کردیـەوە، ئینجا پشتاوپشت لوولە کەبابەکـەی بـۆ راکێـشام، منـیش لێمـوەرگرت و گـورج کەوتمـە خواردنی.

هەتاکو ئەمڕۆ وەکو کەبابەکەی بەرباخەڵی باوکم لوولە کەباب دەپێـچمەوە و دەیخـۆم، بەلآم هەرگیز ئەو تاموچێژەی جارانم پێنابەخشێت!

خۆر شۆڕ بووەوە. بەردوبنجەکانیش بەلای رۆژهەڵهاتدا سـێبەریان کـەوتبوو. سـێبەری من و باوکم بەسەر پشتی ئێـسترەکەوە دوو ئەوەنـدە دوور کـەوتبووەوە. گەیـشتینە نزیـك ئـاوایی (بەکرەشـەل). ئـەم گونـدە کـە ( ٥ –٦) ماڵێکـە و رێگاکـە بـەلای راسـتیدا

تێدەپەڕێت، دەتگوت چۆڵ و هۆڵە و کەسی تیادا نەماوە. خۆ ئەگەر لە دوورەوە (عەزەی مامەحەمە) دەرنەکەوتایە و ماندووبوونی لە باوکم نەکردایە، ئەوا ناهەقت نەبوو ئەگەر بتگوتبایە خەڵکەکەی ڕەوی کردووە.

(عەزەی مامە حەمە) کە بە ڕەبەنی ژیانی بەسەر برد، پیاوێکی کورتە باڵای ئێسقان ئەستووری چەناکە پانی دەم هەراشی زۆر بلێ بوو. زۆرجار قسەکانی بە وەزن و قافییە دەکرد و دەیگوت (من شاعیرم)، هەر بۆیە خەڵکی ئاواییەکان ناویان لێنابوو (عەزە هەڵەوەڕ)، بەڵام ئەگەر خودا خراپی بۆ یەکێك بکردایە و ڕووبەڕوو بەئەو ناوەوە بانگی بکردایە ئیتر بە شیعرەکانی چاك دەیشۆردەوە و هەر چی بهاتایە بەدەمیدا بە کێش و سەروا پێیدەگوت و نەیدەگێڕایەوە. کاروکاسبی مامەعەزە، وردەواڵەفرۆشتن بوو، زەمبیلەکەی پڕ دەکرد لە مووروو و زەنگیانە، ئەنگوستیلە و گوارەی زەرتك، دێ بە دێ دەیگێڕا و دەیفرۆشت، هەر کە دەگەشتە دەوروبەری ئاوایی پڕ بە گەرووی هاواری دەکرد و دەیگوت: (وردەواڵە.. زەردەواڵە.. وردەواڵە..).

جارێکیان ڕوو دەکاتە یەکێك لە ئاواییەکانی ئەو دەشتە و وەك پیشەی هەمیشەیی بۆ ئەوەی کیژۆڵەکانی ئەو گوندە بورووژێنی و لە دەوری خۆی کۆیان بکاتەوە دەس دەنێتە بناگوێیدا و هاوار دەکات (وردەواڵە.. مووروی زەرد و سوور و سپی.. لووتەوانەی هەسێرە ڕەنگ.. کووژەکەی جوان.. زەردەواڵە..).

لەوکاتەدا کچێکی تولەك لە پێش دەرگای ماڵی خۆیانەوە و لەسەر ڕووی خۆی بانگی (مامەعەزە) دەکات و بە دەنگێکی بەرز دەڵێت: (هۆهۆ مامە عەزە هەڵەوەڕ بێ بۆ ئەملا، هەڵکشێ بۆ لای ماڵی ئێمە!). ئەویش کە ئەو دەنگە دەبیسێت بە (هەڵەوەڕ) بانگی لێدەکات، یەکجار تووڕە دەبێت و چاوی دەپەڕێتە تەوقی سەری، بۆ دەمکوتکردنی کچەکە و دەوروبەریش بە دەنگێکی زۆر بلندتر بانگ دەکات و دەڵێت (وردەواڵە.. زەردەواڵە.. بانگم دەکەیت تۆ لەوپاڵە.. گڕم تێچوو.. سووتام سووتام.. هەتا سارد نەبوومەتەوە.. ئەوا هاتم.. لەو قەدپاڵە.. بۆم داماڵە).

کچەکە کە گوێی لە وەڵامدانەوەی مامە عەزە دەبێت دەس دەکاتە گریان و ڕا دەکاتە ماڵەوە.

مامە عەزە گۆرانیبێژێکی میللی دەنگخۆش بوو. ڕۆژێك بە ڕێکەوت ڕێی دەکەوێتە ئاواییەك و دەڕوانێت زەماوەندە و هەڵپەرکێ گەرمە. ئەویش بە بێنەوەی کەس ڕووی

لێبنێت و داوای لێبکات، زەمبیلەی پڕ وردەواڵە بەسەر کونەڵانەکەوە دادەنێت و سەرچۆپی دەگرێت، جا چۆن سەرچۆپییەك؟ دەسماڵە سوورەکەی لە بەرباخەڵی دەردەهێنێت و لە شێوەی رەشمار بە رۆحی پەپوولەناساوە باڵ دەگرێتەوە پێ دەکوتێتە زەویدا، پێکوتانێکی وا تۆز لە زەوییە ئاوڕشێنکراوەکە هەڵدەستێنێت، پاش ئارەق دەردانێکی زۆر و شەکەتی، کێشانی سەرچۆپی دەداتە دەس چۆپی کێش خۆیەوە، بەڵام ژنەکان کە هەر دەم هاوڕێیەتییان خۆش بوو لەگەڵیدا بانگی لێدەکەن و رووی لێدەنێن کە گۆرانی هەڵپەرکێیان بۆ بچڕێت. ئەویش بە مەمنوونییەوە دەس دەنێتە بناگوێیدا و بە گۆرانی هەڵپەڕکێ دڵی ژنان گەرم و خۆش دەکات و دەیانهێنێتە جۆش و خرۆش. پاش دووسێ سووڕ، دیسان دەسەسڕە سوورەکەی لە بەرباخەڵی دەردەهێنێت، دەمی دەسڕێت و دەڵێت: بە خودا بەسە ماندووبووم و رێگاکەم دوورە دەبێت بڕۆم.. ژنەکان رووی لێدەنێن و داوای لێدەکەن یەك دوو تاوی تر گۆرانییان بۆ بچڕێت. ئیتر بە ناچاری تاوێکی تر گۆرانییان بۆ دەڵێتەوە و دیسان کپ دەبێتەوە و دەیەوێت بڕوات، یەکێك لە ژنەکان پێیدەڵێت: توخوا مامە عەزە، یەك دوو تاوی تر گۆرانیبێژە، هەتا دەچم بووك دەهێنم با ئەویش تاوێك هەڵپەڕێ.. کە بووك دەهێنن و مامەعەزە چاوی بە بووکی چاوڕەشی باڵابەرزی جوانپۆش دەکەوێت، خۆی واتەنی، بیری لێدەکاتەوە کە لە هیلاکی زیاتر هیچی تری بۆ نامێنێتەوە، بۆیە لە بەهانەیەك دەگەڕێت تا خۆی دەرباز بکات، ئیتر بە گۆرانی وتن و بە پێش هەڵپەڕکێدا دێت و دەچێت و دەڵێ: هەی زاوا، کەوا و سەڵتە و سوخمە کەوە، تەنیا ئەم شەو بوکێ بۆ من، تۆ بسرەوە.. کە زاوا دەبیسێت مامەعەزە قرمی لە بووك خۆش کردووە و داوای سەرتویژەکەی لێدەکات، هەڵدەکوتێتە سەری و بەدەم پەلاماردانەوە پێیدەڵێت: هەی سەگی هەڵوەڕ، زەرەرت نییە تەنیا ئەمشەو بۆ تۆ بێت؟! مامەعەزە پڕتاو هەڵدێت و لە گوند دوور دەکەوێتەوە.



گوندی (بەکرە شەل)مان بەجێهێشت و عەسرێکی درەنگ گەیشتینە سەر ئەو گردۆڵکەی کە دەڕوانێتە سەر چەم و ئاوەکەی دێی (فەتاح هۆمەر)دا. لەسەر ئەو چەم و ئاوە، خەڵکی ئاوایی شینایییان کردبوو. باوکم جڵەوی هێسترەکەی توند کرد. پاشان پەلی گرتم و شۆڕی کردمەوە سەر زەوییەکە. ئینجا خۆی هەڵدایە خوارەوە و مێخەکەی هێسترەکەی بە خڕە بەردێك داکوتا و وتی:

- کوڕم من دەستنوێژم هەیە هەتا نوێژەکەی عەسرم دەکەم تۆ بچۆرە خوارەوە بۆ سەر چەم و ئاوەکە، ئاو بخۆرەوە و نوێژەکەت بکە، بەڵام کوڕەکەم وریابە دەست بۆ تروزی و تەماتەی خەڵکی درێژنەکەیت، حەرامە.. باشە کوڕم؟

من ئەوەم دەزانی باوکم پێش و دوای نوێژە فەرزەکان نوێژی سوننەتیش دەکات و زۆر بە خوشوعەوە دەچێتە حوزووری خودا و لەسەرخۆ، جووڵەکانی رکووع و سجوود ئەنجام ئەدات. پاڕانەوەکانی پاش نوێژیش لە خودا، زۆرن و پاش دوعا و وێردخوێندن فاتیحا بۆ ژمارەیەکی زۆر لە پیاوچاکان و مردووەکانی خۆی دەنێرێت، بۆیە ویستم ئەم هەلە لەدەست نەدەم و بۆ مەرامی خۆم سوودی لێوەربگرم، هەر کە پشتم لێهەڵکرد بەڕاکردن شۆڕ بوومە خوارەوە و چوومە سەر کانییەکە، لە سەر دەم بۆی راکشام، دەمم نایە ناو ئاوەکە و تێرم خواردەوە، ئینجا لە ئاوی چەمەکە دەم و چاوم پشیلەشۆر کرد، قاچەکانم تێهەڵژەند و ناوم لێنا دەستنوێژ، کەمێك ئەولاتر وشکانی بوو، بەردە گەورەکانم لەسەر زەوییەکە لابرد و زیخەکانیش، قەیدی چییە؟ با بچەقن بە تەوێڵمدا مادام خێری نوێژەکەم زۆرتر دەبێت، ئینجا هەر وەکو قمقمۆك، چەند جارێك سەرم هەڵبڕی و نامە زەوی، بەلای راست و چەپدا لام کردەوە و نوێژەکەم تەواو کرد، پاشان نایەتەلکورسییەکەم بەپەلە، هەروەك ئەوەی تیکەیەکی زۆر گەرمم لە دەم نابێت و بیسووتێنێت ئاوا گلمانەدم و لە جیاتی سێ فووی درێژ بە دەوری خۆمدا یەك فووی فتیلە کوژاندنەوەم کرد و دەستم بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە، لەناو ئەو هەموو دوعا و پاڕانەوە زۆرەدا، کە باوکم فێری کردبووم پاش نوێژەکان بیانکەم، تەنیا یەك دوعام کرد: خودایە لە مەکتەب ناجیحم بکەیت!! ئیتر بەپەلە هەڵسامە سەرپێ و جاشکەوشەکانم لەپێ کردەوە..

لەئەو عەسرە درەنگ وەختەدا خوڕەی ئاوی چەم و جریوە و جووکەی چۆلەکەکان و گمەگمی کۆترە باریکە و چریکەی لێرەولەوێی پۆڕە نێرەکانی ناو دار و دەوەن و زەل و قامیشەکانی ئەو گوێ چەمە تێکەڵ بەیەك دەبوون، بۆنی کەسکوون و شێداری بڕکە تەماتەکان، کە بە سەر گۆلەکانەوە باوەشیان بەیەکدا کردبوو پیاوی مەست و کاس دەکرد، رەنگی سوور و بریقەداری تەماتە پڕ چنگە ئاودارەکان سۆمای چاوی دەبرد، هەروەك کوردی دۆنەدیو پەلاماری بڕکە تەماتەیەکم دا، بەڵام کە نزیك بوومەوە لێی، هێزێکی نادیار رایگرتم و وەکو پەیکەر بە دیار نزیکترین بڕگە تەماتەوە وشك هەڵهاتم، پاش کەمێك رامان و لێوردبوونەوە لێیچوومە پێشەوە، بە نووکی پێم بڕکەکەم لەقاند،

ئەوەندەی تر بۆن و بەرامەی کەسکوون و خەستی تێکەڵ بە هەڵم و هەوای چەمەکە کرد و بە یەکجاری هاجی کردم، کەمێك بۆی چەمیمەوە و دەستی راستم درێژکرد، لەپم خستەژێر ئەو برکە تەماتە گەش و تەڕە، بە دەم بەرزکردنییەوە کەمێك لامدا و روانیم، هەروەها تەماتەی سوور و پڕ چنگی کوردبیە بانگم دەکات و دەڵێت: ئەوسی خۆت مەگرە و بمخۆ!!

بە بێهیچ بیرکردنەوەیەك وەکو ئەوەی ئیزنم لە باوکم وەرگرتبێت دەستم بۆ تەماتەیەکی سووری گەورەی گرنج گرنج درێژکرد. بەرلەوەی دەستم پێیبگات، لەناکاودا گوێم زرنگایەوە و کەللەم وژەیەکی تێرژا! دەنگی باوکم بوو وتی: کوڕم دەست بۆ ترۆزی و تەماتەی خەڵکی درێژ نەکەیت، حەرامە..

تۆ چۆن بە کلکی گۆچانێك بدەیتە پۆزەی بەرخێکی برسیدا، کە دەم بۆ گوانی پڕ شیری دایکی دەبات و دەسڵەمێتەوە، ئاوا سڵەمیمەوە و گورج هەڵسامە سەرپێ، بەهەر چوار دەوری خۆمدا چاوم گێرا، بە دیقەتتر بە ئاراستەی جێنوێژەکەی باوکمدا روانیم، بەلام هیچم نەبینی. دوودڵییەك گرتمی و پاشەوپاش کشامەوە بۆ سەر کانیاوەکە، وێنەی خۆمم بە لێڵی لە ناو ئاوەکەدا بینی. دەستم درێژ کرد و دوو سێ گوێل ئاوم خواردەوە و لاگوێلێکم دا بە دەم و چاومدا، هەستم کرد هێشتا تینووییەتیم نەشکاوە.. ئاخر کەباب ئاوکێشە و دڵیش بۆ خواردنی سەوزە و میوە زیاتر دەکاتەوە. بۆیە پێلاوەکانم لە پێ داکەند و چوومە ناو ئاوی چەمەکەوە، لەسەر خڕە بەردێکی گەورە، کە نیوەی بە سەر ئاوەکەوە بە وشکی مابووەوە دانیشتم. خۆیشم نەمدەزانی ماوەی چەندێ لەئەو بارەدا ماومەتەوە و بیر لە چی دەکەمەوە. لەناو ئاوەکەدا وردە گازی ماسییەکان بە ئاگایان هێنامەوە. دیسان هەڵسامە سەر پێ، لە ئاوەکە دەرچووم و پێلاوەکانم لە پێ کردەوە، گەرامەوە بۆ لای برکە تەماتەکە. چەند هەنگاوێك دووری راوەستام و وەك راوچییەك چۆن لە کەروێشکێکی خۆشخەوی ناو لانەی بن بنچکێك پارێز دەگرێت و لێیدەڕوانێت، ئاوەها بە وردی تێمڕوانی، ئینجا لێیچوومە پێشەوە و نوشتامەوە، بە دەستی چەپم برکەکەم لادا و دەستی راستم بۆ ئەو تەماتەیە درێژ کرد، کە قرمم لێخۆش کردبوو. چنگم پێیگەیشت و نەگەیشت، دووبارە گوێم بە دەنگی باوکم زرنگایەوە: نەکەی کوڕە حەرامە، حەرام.

هەڵسامەوە سەر پێ و وەك داری زەقنەبووت بە دیار گۆلە تەماتەکەوە چەقیم، خەیاڵ بردمییەوە، هەروەك جەنگاوەرێك لەهەر چوار لاوە ئابلۆقە درابێت و بیر لە چۆنێتی

خۆدەربازبوون بکاتەوە ئاوەها ویستم هۆشم گلێر بکەمەوە. کەمێك بەلای راستدا سەرم وەرچەرخاند، کە روانیم خاوەن شینایییەکە بە تەنیشتمەوە راوەستاوە، ئەو پیاوێکی بالآبەرزی سپیپۆشی ریش سپی بوو، نوور لە رووخساری دەباری، من ویستم بڵێم: مامە بە خودا تەماتەم لێنەکردۆتەوە.. ئەو هاتە گۆ و لێیپرسیم:

- کوڕم ئەوە بۆ تەماتەیەك لێناکەیتەوە و نایخۆیت؟

لەژێر لێوەوە پێموت: حەرامە..

ئەو وتی:

تۆ کوڕی کێیت وا ئەوەنە حەلآل و حەرام لێکجیا ئەکەیتەوە؟ بینیتم نوێژیشت ئەکرد..ها، کوڕی کێیت؟

+ کوڕی حەمە فەرەجی ئەولکەریم.

- ئێ ئێی، تۆ فەقێ حەمە سەعیدە بچکۆلانەکەیت.. برازای (مەلا ئەولقادریت) رۆڵە گیان من نانی دەستی دایکتم زۆر خواردووە، ئەو دایکە خانەدان و لەخوا ترسەت، ئەی نانی مامەکانت؟ ئەوە هەر مەپرسە، ئەی نازانیت ئێمە و ئێوە یەك ماڵین و تەنیا حەلاڵمان لە یەك جیایە؟ دەی مادام وای لێهات سوێندم پێمەخۆ هەر دەبێت بە دەستی خۆت ئەو تەماتە گەورەیە لێبکەیتەوە، هەر بە بەر چاوی مامی خۆتەوە قەپی لێبگریت و بیخۆیت، ئەگینا بەجێتناهێڵم، عەیبە کوڕم عەیبە تەماتەیەك بایەخی چییە؟ ئەی بۆ نازانیت من بە خودای خۆم بەڵێنم داوە و وتوومە: خودای گشت عالەم گەردنی ئەو کەسە ئازاد بێت، کە دەچێتە ناو ئەم داڵییەی منەوە، بڕکە تەماتە و خەیارەکان ناشێلێت و ئەوسی خۆی کوێر دەکات.. دە دەی بێقەزابیت ئەوەندە شەرمۆکیت، دەس درێژ بکە دەی هەی عەمرت درێژ بێت..

هەر وەکو ئەوەی ئەمە خەیاڵێکی خۆفریودەرانەی منداڵانە نەبێت ئاوەها بەبێترس و نیگەرانی دەستم درێژ کرد، کاتێکم زانی تەماتەیەکی توندوتۆڵ و سوری گرنج گرنج لەناو چنگمدایە، راست بوومەوە و تەماتەکەم بە چمکی لای راستی کراسەکەم سڕی و دەمم کەمێك بۆی کردەوە، لەگەڵ نزیککردنەوەی تەماتەکە بۆ دەمم، نەختێك بەرەو ئاسۆ سەرم هەڵبڕی، لە ئەوەدا بوو قەپێکی پیادا بکەم و سوورا و بە دەم و لەوسەدا شۆڕ بێتەوە، روانیم باوکم بەسەر گردەکەوە تەماشام دەکات، هەر وەکو ئەوەی تەزووی کارەبایەکی بەهێز لێیدابێتم ئاوەها دەستم بە ئاسکە تەماتەی لەعنەتییەوە وشك بوو، ئینجا چنگم

شل بوو تەماتەکە بەربووەوە سەر زەوییەکەی بەر پێم، ئیتر لە شوێنەکەی خۆمدا چەقیم و بەبێ جووڵە چاوم بە ئاسۆکەوە رووەو باوکم ئەبلەق بوو، ئەو بە دەنگێکی بەرزوزبر بانگی کردم وتی: پەلە بکە.. بجوڵێ کورە درەنگە..

من لە شەرم و تەریقی و ترسدا نازانم ئالەوێدا چۆن رۆحم دەرنەچوو، نەشمزانی چۆن هەنگاوەکانم هەڵهێنا و گەیشتمە لای، ئەو بەهەمان شێوەی پێشوو سواری پشتی خۆی کردم، بەڵام جەستەم وەك بی بەر ئاو دەلەرزی و دڵم بە توندی لێیدەدا.

تا لە چەمەکەش پەڕینەوە من هەر چاوەڕێی توڕەبوون و سەرزەنشتی بووم، بەڵام ئەو هیچی نەگوت..

***

(٣)

ئالێرەوە سەر بەرەو ژوور بڕوانە، تاچاو هەتەر بکات دەشتێکی پانوبەرینی کاکی بەکاکییە. کێڵگەی گەنم چاوەڕێی دەمی داسە دەمەزەردکراوەکانییەتی. پۆل پۆل کورکوڕ لە ئاسمانەوە شۆڕ دەبنەوە بۆ ناو تۆقە گەنمەکان و تاك تاك و جووت جووتیش دەقریوێنن و هەڵدەفڕن. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی (قەتێ) لە نێوان نێر و مێکانیدا هاوبەشییەك لە کڕهەڵهاتن بەسەر هێلکەکانەوە هەیە. کاتێکش کە بێچووەکان لە هێلکە دەردەچن و چاو هەڵدەهێنن، دایك و باوکەکانیان بە هاوبەشی و بە بێن ئاو و خواردنیان لە دوورەوە بۆ دەهێنن و دەیکەن بە دەمیانەوە. بەرلەوەی بێچووەکان توانای هەڵفڕین پەیدا بکەن، لەلایەن شوان و مێردمنداڵەکانەوە راو دەکرێن. ئەوانیش پێچەوانەی سوێسك و پۆڕ و کەروێشکی کێوی زوو دەسەمۆ وماڵیی دەبن. جۆرێك لەئەو باڵندانە، کە هەرگیز لەئەو دەڤەرەی ئێمەدا نەدەنیشتنەوە و لادێیەکان پێیاندەگوت (کورکورە شامی)، ئەوجۆرە قەتێیانە بە ئاسمانی ناوچەکدا بەرز هەڵدەفڕین و دوور دەڕۆیشتن، لە باوکم پرسی: باوە، بۆ ئەو کوڕ وڕە شامیانە لەئەم دەشتەی لای خۆمان نانیشنەوە و هێلکە و بەچکە ناکەن؟.. لەوەڵامدا وتی: ئەوانە نیشتمانیان شام و حەڵەبە.. وتم: شام و حەڵەب لە کوێیە؟ وتی: رۆڵە پرسیار زۆر دەکەیت.. چووزانم.. مەلا یێژێت نزیك مەککە و مەدینەیە! ئیتر من نەموێرا پرسیاری زیاتری لێبکەم..

هێستره ماچە جارێك بە رەوت و تاوێك بە یەرغە رێگاکەی دەبڕی. ئەو دەشتەی تەی دەکرد و تەنگی بە گوندەکەمان هەڵدەچنی.

چەند مانگێك بەرلە ئێستە بەهار بوو، هەر بەئەم رێگایەدا چوومەوە بۆ ئاوابیەکەی خۆمان، ئەو کاتە تا توانای بینینی چاو، ئەم دەشتە سەوزی دەکردەوە. خەڵە بەدەم کزەباوە کەروێشکەی دەکرد. (هەوراوەکەی هەسەنۆکە) لێوانلێو بوو لە ئاوی پاش باران. رێگاکەش دوای چەند تاوێك بەهارە باران و هەورە تریشقە کزر بوو بووەوە. بۆنی سێپەڕە و سیرگەنکە و گیا و گوڵی ئەو دەشتە بە هەردوو کونە لووت و هەرچی کوونی تر هەیە لە لەشمدا هەڵمدەمژی. جەستەم سەراپا ببوو بە یەك پارچە عەتری سروشت و هەر ئەوەندەی مابوو منیش بە وێنەی باڵندەکان بدەم لەشەققەی باڵ و هەڵفڕم. جارناجارێك

کلاوکوڕەیەك دەیجریواند و بە جۆش و خرۆشەوە وا هەڵدەفڕی تا لە قووڵایی ئاسماندا بەدەم جریوەیەکی شێتانەوە لەنگەری دەگرت. ئینجا هەرلەنەو بەرزاییەوە باڵەکانی قەمچ دەکرد، وەك هەسێرە چۆن لە شەوەکاندا دەکشێت، ئاوەها بەرەو زەوی شۆڕ دەبووەوە و لەناو تۆقە گەنمێکدا خۆی دەشاردەوە، بەڵام ئێستە دیققەت بدە ئەم دەشتە، کە دوێنێ پڕ بوو لە جریوە و جووڵە و عەتر و نەشونما و عەشقبازی.. بەڵێ لە نێوان زۆربەی زۆری ئەو کانینانەدا کە لەنەو پانتاییەدا دەژیان، تەنانەت خاڵخاڵۆکەکانیش بەسەر پەلکی گیا و گوڵ و بنجە تۆڵەکەکانەوە ژوانیان دەبەست، یەکیان ماچ دەکرد و جووت دەبوون. پاش ئەوەی هەر یەکەو گەرای خۆی بۆ بەردەوام بوونی ژیان دادەنا و نەوەیەکی نوێیان بەجێدەهێشت. ئەمڕۆ بەرەو دونیای ون بوون دەچن، کۆچ دەکەن یان دەمرن.

لەنەو تەختاییەدا هێسترەکە ملی بەرەوپێش ڕاکێشابوو. باوکیشم ڕەشمەکەی بۆ شل کردبوو، کیسە تووتنەکەی لە پێش خۆیدا بەهەر دوو دەستی گرتبوو، خەریکی سیگار پێچانەوە بوو، لە ناکاوێکدا (قاتر)ەکە سەرسمێکی دا و وەخت بوو لووتی بگاتە سەر زەوییەکە و ئێمە بەسەر ملیدا شۆڕ ببینەوە، بەڵام باوکم گورج دەستی بۆ ڕەشمەکە برد، بە توندی ڕایکێشا و گوتی: دەك ملت بشکێ.

هێستر حەیوانێکی دوو ڕەگی نەزۆکە. هەموو ئەو سیفەتانەی کە هەڵیگرتووە چ لە رووی جەستەییەوە، وەکو کەللە و قەپۆز، گوێ و یاڵ و مل و کلکییەوە یان لە رووی هێز و توانا و ڕەوت و ڕەفتار و ئاکارییەوە، هاوبەشییەکی ڕێژەیی هەیە لە نێوان سیفەتەکانی باوکی (کەر) و دایکی (ماین)یدا. ئەم ولاخە لە سینکردن و جووتە وەشاندندا لە سەبر و توانای کارکردنیدا دەچێتەوە سەر باوکی کەری، بەڵام لە بەژن و باڵا و ڕەوت و ڕۆیشتنیدا بە کەمێك ئاسکییەوە لەگەڵ سمکۆڵان و حیلەدا بە لای دایکی ماینیدا شکاندوویەتەوە. بۆ ئەوەی ڕێگا لە ئارەزووی سێکسی ڕەگەزە نێرەکانی ئەم حەیوانە بگیرێت و بە ئاسانی دەسەمۆ و ڕایی بکرێن، هەر بە جاشیی لە ڕێگای نەشتەرگەرییەوە بەیتاڵە گەڕۆکەکان باتوویان دەردەهێنن و ئارەزووی سێکسییان دەکوژن، وا دیار بوو بە قەد ماندوو بوون و بێزاریی من لە دوور و درێژیی ئەم ڕێگاوبانە، هێسترەکەش بێزار ببوو، هەر بۆیە بە گوێرەی ئارەزووی من ڕەوتی دەکرد و تیژ بەرەوماڵ ملی دەنا، ئالەوساتەدا گوێم لە دەنگی سمی بوو، کە بە ڕێتمێکی ڕێکوپێك لەگەڵ فیشکەفیشکی هەردوو کونەلووتیدا و دەنکەدەنکە لێرە و لەوێ قریوەی قەتێکان، کە بۆ ئاو خواردنەوە و چینەکردن هەڵدەفرین

و دەنیشتنەوە سەر زەوی، بە ڕەوت دەچوون بەسەر هێلکەکانەوە کڕ دەکەوتن، جگە لەو چەند دەنگە من هیچی ترم نەدەبیست.

لە ملەکەی ئاوایی دەچین بە ئەودیودا. چەند شەقاوێك ئەولاتر دەرگای حەوشەی ماڵی خۆمان بەدەر دەکەوێت و لە چاوەڕوانیی ئێمەدا خراوەتە سەرپشت، کە دەگەین هەر بە سوارییەوە خۆمان دەکەین بە ژووردا. بە تەنیشت سەکۆکەوە باوکم جڵەوی هێسترەکە توند دەکات و پەلم دەگرێت تا بە ئاسانی پێم دەگاتە سەر زەویی. پاشان خۆیشی دادەبەزێت و بارەکە دادەگرێت. ئینجا دایکم دێت ڕەشمەی هێسترەکە رادەکێشێت بەرەو ئاخوڕەکەی و کورتانەکەی لێدەکاتەوە. ئیتر هەر ئەوەندە خۆشە تا دوور دەکەوێتەوە لێی، دەبینیت جووتە لە دوای جووتە هەر دوو پاشووی بەرەو ئاسمان هەڵدەدات تا داخی دڵی خۆی لەگەڵ ئارەقەدا هەڵدەڕێژێت. پاشان هێور دەبێتەوە و دەس دەکات بە لووشەلووش و سۆڕەسۆڕ. بۆ ئاو و ئالێك سمکۆلان دەکات.

هەر بەسەر سەکۆکەوە لەگەڵ خوشك و براکانمدا دەس لە ملی یەکتر دەکەین و تێرتێر یەك ماچ دەکەین. باس و خواستی شاریش بۆ کاتێکی تر هەڵدەگرین.



## (٤)

جارێك ئاتبەم بۆ ئاوئاوایی با لە حەوشە دەربچین و بڕۆین بۆ سەر گردەکەی پشت ماڵی خۆمان و لەوێدا ئەختێك دابنیشین. ئالێرەوە تەماشای ئەو گردە بکە، کە دەڕوانێتە سەرماڵی موختاری ئاوایی. ڕۆژێکیان بۆ یەکەمجار پۆلێك پێشمەرگەی خوێنگەرم و چاونەترس و خۆشەویستی شۆڕشی ئەیلول، ڕژانە دێ. پاش ئانخواردنی ئیوەڕۆ و پشوودانێکی کورت، بە سەر ئەو گردەوە گلێربوونەوە. خەڵکی ئاواییش بە دەوریاندا ئەڵقەیان بەست و گوێیان دەگرت لە یەکێکیان، کە بە حەماسەت و ئەوپەڕی ورەبەرزییەوە باسی هەڵگیرساندنی شۆڕشی بۆ دەکردن. من کەسیانم ئەدەناسی. سەرپەلەکەیان پیاوێکی گەنم ڕەنگی باڵا مامناوەندی تێکسمڕاو بوو. ئەو چوارمشقی دانیشتبوو تفەنگەکەی بەسەر ڕانییەوە دانابوو. وادیار بوو قسەکەر ئیتر شتێکی وای پێنەمابوو باسی بکات، بۆیە خەڵکەکە دوودوو سێ سێ سەریان نابوو بەیەکەوە و قسەی خۆیان دەکرد. بە ئەوبەری ئاواییەوە هەڵۆیەك هات و بێباکانە بەسەر بەردێکەوە نیشتەوە، موختار چونکە خۆی بە تفەنگچی ئەزانی و حەزی لە نیشانشکاندن دەکرد، لای لە سەرپەلەکە کردەوە و پێیوت: تۆ ئەوسا پیاوێکی ڕاوچی و دەست و تفەنگ ڕاست بوویت، ئا تفەنگێك بنێ بە ئەو هەڵۆیەوە بزانم دەیپێکیت؟ سەرپەلیش فیشەکێکی لێخوڕی و لەسەر چنچك بۆیدانیشت و مشتی لە هەڵۆ گرت. دەنگ لە دەستییەوە هات، یەك کەلە بێژنگ خۆڵ و زیخی بە ڕووی هەڵۆکەدا هەڵدا، جوانەهەڵۆ دای لە شەقەی باڵ و هەڵفڕی. چەند جارێك بە ئاسمانی ئاواییدا هاتوچوو، لە ئاست ئەو شوێنەی کە لێینشتبۆوە لەنگەری گرت، دواجار سووڕێکی بازنەیی بەسەر پێشمەرگەکاندا خوارد و وەکو ئەوەی بە سەرپەلەکە بڵێت: ئەگەر تۆ هەڵۆیت جارێکی تر هەوڵی کوشتنی ڕەگەزی خۆت مەدە، چونکە دەشت و دەری ئەم نیشتمانە بە هەڵۆوە جوانە.. پاشان دوور ڕۆیشت و شۆڕ بووەوە بۆ ناو هەردە و هەڵەتەکە و لە چاو ون بوو.

بە لای دەستی ڕاستدا چەند شەقاوێك بڕۆ و بڕوانە ئەو ئەختە زەوییە، کە هەموو ساڵێك باوکم دەیکاتە قەرسیل تا مەڕ و ماڵات و مانگا و ئاژەڵە هەراشـزێکانی تیادا بلەوەڕێن. ئالێرەدا چیرۆکێك ڕەگ و ڕیشەی لەبیرەوەرێمدا داکوتاوە وا بۆتی دەگێڕمەوە.

ساڵی ١٩٦٤بوو حەرەس قەومییەکانی شاری کفری لە چڵەپۆپەی بەدڕەفتاریدا بوون. (مامە مەلا ئەولقادر)م بەسەر جێگای مردنەوە لە گیانەڵادابوو. ئێمە هەموو لە دەوری

دانیشتبووین کە (فەقێ عەلی) مامەمیان ئاگادار کردەوە تا بە زووترین کات لە ماڵ دەربچێت و خۆی دەرباز بکات، چونکە بڕیاری گرتنی لەلایەن ڕژێمەوە بۆ دەرچووە و کاتێکیش زانی دێن بۆ گرتنی. هەر بۆیە ئەویش ناچار بوو ئەو برا گەورەیەی لەسەرەمەرگدا بەجێبهێڵێت و روو بکاتە ئەم ئاوایییەی ئێمە و لە ماڵی باوکمدا رۆژ بگوزەرێنێ.

ئەو رۆژە، کە من لە شار گەڕامەوە (مەلا مەحموود)یش بوو بە میوانی ماڵی باوکم. پاش ناخواردن و دەمەتەقێ، مامەم و مەلا لە ماڵ دەرچوون و منیش کەوتمە دوایان تا گەیشتینە ئەو شوێن قەرسیلە. لەوێ هەردووکیان بە چپە کەوتنە ئاخاوتن و را و تەکبیر. پاشان مامم وتی: دەی باشە مەلا، مادام رێککەوتین با دەس بە مەشقەکەمان بکەین. مەلا وتی: باشە لالە، من حازرم. ئەوا ئەو بەردە درێژکۆڵەش ناو دەنێم دەمانچە و ئەو کەڵەکە بەردەش کابرای حەرەس قەومییە.. باش نییە؟

مامم وتی: مەلا، من هەرچیم وت دەبێت بە گوێم بکەیت، باشە؟

مەلا: باشە..

ئەوەتە ئەوە خۆیەتی.. تۆ وای حیساب بکە ئەو کەڵەکە بەردە خۆیەتی و بەرەو شەقامەکە دێت.. ئادەی خۆت بدە پاڵ دیوارەکە و بە پسکەپسک لێیبچۆرە پێشەوە. تۆ فیشەکت لێخوڕیوە و دەمانچەکەت لەسەر پێیە. هیچ خۆت تێکنادەیت و ئاشڵەژێیت لە کۆڵانەکە بۆی دەردەچێت و لووتت دەتەقێت بە لووتیدا، ئیتر بەبێ سێ و دوو گوللەیەك دەنێیت بە ناو دەمییەوە و بۆی دەردەچێت..

مەلا دەڵێت: لالە گیان، خودا بۆم بکات لە لەوەڕی دەخەم..

(مەلا مەحموودی وەلی)ی کوڕە هەرزەکارێکی بەژن و باڵا کەڵەگەتی ئێسقان ئەستووری کەم گۆشت و ئەسمەرێکی خوێنگەرم و رووخۆشی کەمێك سەرشێت بوو. من چەند هەنگاوێك دوور راوەستا بووم و بە حەپەساویی و سەرسامییەوە لەئەو دوو مرۆڤەم دەڕوانی. ئەوان خەریکی نەخشەدانان و مەشقکردن بوون بۆ کوشتنی حەرەس قەومییەکی باوەکوشتەی کورد و دوژمنی سەرسەختی خەلکە بە شەرەفەکەی شاری کفری. ئاخاوتنەکانیان کە من بەواقوڕماوی گوێم لێدەگرت و دەمروانی هێواش هێواش لەبەر گوێمدا بوو بە غەڵبەغەڵب و هاژەهاژ، دواییش هەردوو گوێم کپ بوون و ئیتر هیچم نەبیست..

مامم دەستێکی بە پشتی مەلادا کێشا.. ئەویش زەردەخەنەیەکی تێگرت و دەستی برد هەردوو چمکی کەواکەی هەڵکرد و کردنی بە تووێی پشتوێنەکەیدا و کەوتە رێ. من

تێمدەڕوانی ئەو هەنگاوی دەنا بەرەو شوێنی مەبەست، بەرەو شاری کفری، بەناو دەریایەك تراویلکەدا دەڕۆیشت و تا دەهات بچووك دەبوویەوە. ئەو رۆیشت و من رایەڵەی روانینم بە دوویدا هەڵکرد تا لەناو شەپۆلی سەرابەکەدا بوو بە خاڵێکی لەرزۆك و کاڵ. پاشان وەك کڵۆ بەفرێك چۆن لە ناو رووبارێ ئاودا دەتوێتەوە، ئاوەها توایەوە و لەچاو ون بوو.

مەلا هەر هەنگاوێکی کرد بە هەزار هەنگاو و پاش نوێژی نیوەرۆ خۆی گەیاندە (شارەکەی ئەمبەر) بەسەر بەردەبازەکاندا لە چەمی ( قوشەچاپان) چاپووکانە پەڕییەوە بۆ ناو قەبرستانە کۆن و پڕ گومەزییەکانی ئەمدیوی ماڵی مامم و لەوێوە خۆی گەیاندە بەر دەرگای قەبرستانەکە، کە دەیڕوانییە سەر شەقامە قیرتاوە سەرەکییەکەی شار. چەند سەرەتاتکەیەکی کرد و بە بێهیچ شڵەژانێك وەکو خەڵکی شار لە دەرگاکە چووە دەرەوە و بەبێ خۆ تێکدان بەسەر قیرتاوەکەدا کەوتەڕێ.

ئێستە کابرای (حەرەس قەومی) نانی نیوەڕۆی خواردووە و نوێژی کردووە، پاشان سەرخەوێك دەشکێنێت و وەك پیشەی هەمیشەیی خەڵکی شار بۆ خۆپاراستن لە تینی هەتاوی ئەم هاوینە، چاکەتەکەی دەکێشێت بەسەر سەریدا و بە بێترس و خۆف بەرەو بازاڕ دەچێت. لەم ساتەدا کە خۆر تینی گەرمی دەڕژێنێتە سەر شاردا، کەس بە دەرەوە نییە، جگە لە مەلا و ئەم نێچیرە قەڵەوەی کە وا دەزانێت (شار شامی شەریفە ). مەلا لەسەر کۆڵانە تەسکەکەدا خۆی داوەتە پاڵ سێبەری دیوارەکە و چاوەڕێیە. کاتێك دەزانێت کابرا رووی کردووەتە سەر شەقامەکە و لەبەر پێی خۆی بە ئەولاوە هیچی تر نابینێت. هەر دەگاتە ئاست ئەم پیاوە داخ لە دڵە، کە پێنج شەش سەعاتێك رێی بۆ کوشتنی بڕیوە، هەڵوەستەیەك دەکات، بەڵام مەلا مۆڵەتی نادات و یەکسەر ئامبازی دەبێت، دەمانچەکەی لە باخەڵی دەردەهێنێت یەك گوللە ئاڕاستەی ناو دەمی دەکات و بۆی دەردەچێت..

ئاخر ئەخشە و پلانەکە ئاوەهابوو، دەبێت ئەو سوود لە چۆڵی و گەرمی کۆڵان و شەقامەکە وەربگرێت، بە کەمترین کات کارەکەی خۆی ئەنجام بدات و خۆیشی دەرباز بکات، بۆیە بە بێهیچ خۆخەریککردنێك، خۆی دەکاتە مزگەوتەکەدا، جامانەکەی فڕێ دەدات و مێزەرێکی سپی لەسەر دەبەستێت. پاش پشوودانێك بە شەقامەکەی ئەودیودا دەچێتە ناو بازاڕەوە. لەوێ گوێ بۆ چیرۆکی جۆراوجۆر و شێوەی کوشتنی کابرا دەگرێت، دوا چیرۆکی باوەڕپێکراو بەمشێوە دەگێڕنەوە:

(حەسیب خەسرەو) ئەو کوڕە لاوە ئازا و چاونەترسەی کە لە هەموو یاسا و ڕێسایەکی دەوڵەتی ناوەندی و تەنانەت لە هی شۆڕشیش یاخییە، نەیارەکانی خۆی و گەلی کوردیش هەردەم سڵی لێدەکەنەوە و لێیدەترسن، دزە دەکاتە ناو شارەوە و هەر چۆنێك بێت دەگاتە مزگەوتەکەی (حاجی رەشید)، ئالەوێوە خۆی دەکاتە ناو جۆگە ئاوە سەرگیراوەکەدا، ئەو جۆگە ئاوەی کە لە بن شاخی (باوە شاسوار)ەوە دێت و بە ناو شاردا تێدەپەڕێت، لەئەوێوە بە شێنەیی و بە بێترس دێت تا دەگاتە بەردەم (ئیستهلاکەکە)، ئەو کەلاوە کە فورسانە عارەبەکان کردوویانەتە بنکە و بارەگای خۆیان، لە کونی بەردەم (مەقەڕی فورسانەکانەوە) سەرێك دەکێشێت، بەڵام کەس بەدیی ناکات، بۆیە هەر لەئەوێدا پشوویەك دەدات، لە ئەو پشووە کورتەدا وای بە خەیاڵدا دێت، دان بەخۆدا بگرێت هەتا بەشکو ئەمە خودایە یەکێك لە فورسانە عارەبەکان دەربکەوێت و دەستێکی لێبوەشێنێت، بەڵام بەقرچەی ئەو نیوەڕۆیە کێ حەوسەڵەی ئەوەی هەیە خۆی بداتە بەر ئەو خۆرە سووتێنەرە، بۆیە ئەو شوێنە جێدەهێڵێت و بەناو ئەو تونێلە پڕ ئاو و شێدارەدا دێت تا لە نزیك ماڵی ئەم (حەرەس قەومییە)وە سەر دەر دەکات و خۆی بەئەو کۆڵانە تەسکەدا دەکات. ئەڵێن ئەم کابرا حیز فرسەتە، کە کوردە بە شەڕەفەکانی ئەم شارەی هەراسان کردووە بە گوللە ئەکوژراوە، سەیرە! ئەی چۆن مردووە؟ چۆن؟ دە گوێبگرە: ئەم حەرەس قەومییە، کە چاوی بە حەسیب خەسرەو دەکەوێت و دەیناسێت زریکەیەك دەکات و هەر بە پێوە گیانی دەردەچێت..!!

ئاخر ئەو کە حەسیب دەبینێت قەسابخانەکەی شاری دێتە پێش چاو، ئەو قەسابخانەیەی کە دەیانگوت گوایە ئەم کوڕە کوردە ئەو چەند کەسە دژە کوردەی تیادا سەر بڕیوە. ئەگەرچی خەڵکە سیاسی و هۆشیارەکەی شار ئەو کارەیان ڕەت دەکردەوە و بە پیلانێکی دەزگای (ئەمن و ئیستخباراتی) ڕژێمیان لە قەڵەم دەدا، هەتا ناکۆکی بخەنە نێوان کورد و تورکمانی شارەکەوە، بەڵام ناوی حەسیب خەسرەو هەورێکی تاڵ و تووڕەی پێش با و بۆرانی تەفر و تووناکەر بوو، کە خەڵکە بیر تەسکەکانی شاری تۆقاندبوو.

بەڵێ ڕاستە حەسیب هاتووەتە ناو شاردەوە و خۆیشی نیشانی ئەم کابرا مردووە داوە، ئێستەش لە شاردا خۆی شاردووەتەوە، ئەم خۆنیشاندانەی تەنها بۆ چاوشکاندنی نەیارانی شۆڕش و مەلا مستەفایە، بەڵام کابرای حەرەس قەومی هەر خۆی ترسنۆك و بوودەڵە بووە، بۆیە بەرلەوەی تەقەی لێبکرێت یەکسەر زراوی دەتەقێت و دەمرێت!!

من هەروەك ئەوەی یاوەری مەلا مەحموود بێتم و هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵیدا چوویێتمە ناو شارەوە تا ئاستی چاوساغیکردنیش، ئاوا هەنگاو دوای هەنگاو بینیم گوللەیەکی ناڕاستەی ناودەمی کابرا کرد. خوێن بازڕەقەی بەست و زۆر بە بێدەنگیی لار بووەوە، لەئەو کاتەدا هەستم بە تەنگەنەفەسییەك کرد بۆیە هەناسەیەکم بە قووڵیی هەڵکێشا، وامزانی پریشکی خوێنی کابرای کوژراو جەستەی منیشی گرتووەتەوە. ئازای ئەنامم لە نارەقەدا شڵپەی دەهات بۆیە دەستم بەرز کردەوە، لەپم برد بۆ تەوێڵم و نارەقەی ناوچاوانم سڕییەوە، کە روانیم مامم وەکو ئەفسەرێکی سەربازیی راوەستاوە و مەلاش وەکو سەربازێکی گێل بە داوای لێبووردنەوە سەری شۆڕ کردووەتەوە بۆ بەرپێی خۆی، مامم وتی:

+ مەلا دەی ئەمجارەش..

مەلا وتی: ئەمجارەش چی لالە؟

ئەمجارەش مەشقەکەت بکە بزانم سەردەکەوێت؟

مەلا دەستی درێژ دەکات بەردە درێژکوولەکەی لەبەر پشتوێنەکەی دەردەهێنێت و بە پسکەپسك لە کەڵەکە بەردەکە نزیك دەبێتەوە، خۆی چەند قووچ و درێژە ئەوەندەی تر درێژ دەبێتەوە، دەستی رادەکێشێت و بەرەو رووی کەڵەکە بەردەکە بە تاو رادەکات و بە دەمیش تاق تاق، تەقە دەکات.. مامم دەڵێت:

- دەك دەستت بشکێ هەی قووچی بێنەقلێ نەزان!! لەئەو دوورەوە چۆن پیاو بە دەمانچە، نیشان دەپێکێ؟

+ ئەی چۆن بکەم لالە گیان؟

- دەبێت بەرۆکت بنێیت بە بەرۆکییەوە و تەقەی لێبکەیت..

+ ئەی بەشکو ئەویش دەمانچەی پێبوو، بەرلەوەی من تەقەی لێبکەم بێتە دەست و بمکوژێت؟

مامم نیگایەکی تەوساوی تێدەگرێت..

مەلا یەك بست دەم دادەچەقێنێت و هاهاها پێدەکەنێت.



مزگەوتەکەی حاجی ڕەشید کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی شارەوە و لەسەر ڕۆخی چەمی قوشەچایان بنیات نراوە. پاش مردنی مەلا ئەولقادر، مەلا عەلی مەلا ساڵح بوو بە ئیمام و مەلای ئەو مزگەوتە کە چەند سوختەو فەقەییەکی گرتبووە خۆ. یەکێك لەئەو کەسانەی کە لە حوجرەدا لەوێ زانستە ئایینییەکانیانی دەخوێند، مەلا مەحموودی لاو و گوندنشینی عاشقە تفەنگ بوو. لەئەو ساڵانەدا کە دڕندەیی دارودەستەی ڕژێمی ناوەندی (عارف) گەشتبووە چڵە پۆپە، چالاکیی سەربازی و سیاسیی شۆڕشی ئەیلوولیش لە پێشکەوتنێکی بەرچاودا بوو بۆیە هەستی نەتەوایەتی لەلای خەڵکی کوردستان و بە تایبەتی لاوان بەرز ببووەوە و گەشەی بەرچاوی کردبوو. هەر ئەو بارە فیکری و سیاسی و کۆمەڵایەتییە بوو، مەلای هان دەدا لەئەم شارەدا چالاکییەك ئەنجام بدات، ئیتر ئەو چالاکییە کوشتنی حەرەس قەومییەك بێت یان فەلاقەکردنی پیاوخراپێك یان هەر چالاکییەکی تر، کە بە شانازی بۆی بدرێت لە قەڵەم. هاتنە شارەوەی بە مەبەستی خوێندن لە حوجرەی فەقێکاندا، بۆ ئەو دەرفەتێکی باش بوو تا کۆڵان بە کۆڵان و کون و قوژبنی شار شارەزابێت. ناشنابێت بە هەڵسوکەوت و شوێنی ناحەزان و نەیارانی کورد، کە بۆ ئەو، هەر کەسێك و هەر ڕەگەزێك بێت هەمان بایەخی هەیە. خۆ ئەگەر لەگەڵ ئەو چالاکییەدا کە بە نیازە ئەنجامی بدات، دەمانچەیەك یان تفەنگێکی هۆڵەندی گوللەنەخۆری چنگ بکەوێت ئەوا دوا هیوا و ئاواتی ئەوە و ئیتر دەبێتە (مامۆستا مەلا مەحموودی قارەمان).

شەوێك لە شەوەکانی پاییزی ساڵی ١٩٦٤ ئەم مەلایە بوو بە میوانی ماڵی مامم. ئێمە خێزانیی، دوور و نزیك بە دەوریدا ئەڵقەمان بەستبوو ئەویش بە بێوچان دەمی ئەدەدا بەیەکدا، پەیتاپەیتا نوکتە و سەربووردە و قسەی خۆشی بۆ دەکردین. جارناجارێکیش چەند دێڕە شیعرێکی خۆی بۆ دەخوێندینەوە، کە هەوڵی دابوو لاسایی شاعیری گەورەی کورد (قانیع) بکاتەوە. تاوناتاوێك نوقمی خەیاڵ و بیرکردنەوەیەکی قووڵ دەبوو، لەناکاوێکدا سەری بەرز دەکردەوە، یەکە یەکە تەماشای ناوچاوانی دەکردین هەروەك ئەوەی لێمانبپرسێت و بڵێت: ئەوەی من بیری لێدەکەمەوە و نەخشەم بۆ

دارشتووه، سبەی بە ئەنجامی بگەیەنم ئێوە هیچی لێدەزانن؟ کە حاڵیی دەبوو کپییەکەی ئێمە لە چاوەڕوانی قسە و نوکتەی خۆش زیاتر هیچی تر ناگەیەنێ، هەردوو لەپی دەدا بە یەکدا و قاقا پێدەکەنی.

لە دانیشتنی ئەو شەوەدا جارێك رووی دەمی لە من کرد و پرسیی:

+ ئەوە یەژم لەئەم شارەدا (بەرید) هەیە؟

پێموت: بەڵێ هەیە. بەریدت بۆ چییە؟

+ خزمێکم ماڵیان لە کەرکوکە و تازە کۆرپەیەکی چاوگەشیان بووە، بە نیازم بێشکەیەکی جوانی لە بازاڕ بۆ بدەمە کرد و بە پۆستدا بۆی رەوانە بکەم!!

من وتم: مامۆستا بەرید تەنها نامە دەگوازێتەوە.. بێشکە چۆن بە بەریددا رەوانە دەکرێت؟

ئەو وتی: بۆ رەوانە ناکرێت ها؟ بەرید ئەگەر بەرید بێت ئەبێت (بەرد)یش بگوازێتەوە!! ئەی نالێن: پارە بدە و مەلا لە مزگەوت دەربکە، منیش پارە دەدەم و بێشکە دەنێرم!! ئیتر بۆ نایبات؟

ئەو شەوەمان بە گوێگرتن لە حیکایەت و قسە خۆشەکانی ئەو پیاوە مێشك ئاڵۆز و خۆتێکنەدەرە بردە سەر و نووستین. بەیانی کە لە خەو هەڵسام روانیم مەلا لە جێگاکەیدا نەماوە. بۆیە بڕیارمدا کە نیوەڕۆ لە قوتابخانە گەڕامەوە، بچم بۆ مزگەوت و لەوێ هۆی قاوەڵتی نەکردن و زوو دەرچوونی ئەم بەیانییەی بزانم، بەڵام کە لە قوتابخانە گەڕامەوە ماڵ و گوێم هەڵخست، باس هەر باسی مەلا بوو، کە ئەم چێشتەنگاوە چ کەتنێکی کردووە.

ئەمەش بەسەرهاتەکەیە بۆتانی دەگێڕمەوە..

مەلا بەیانی لە ماڵ دەردەچێت و رووودەکاتە مزگەوت. لەوێ هاوەڵەکانی ئاگادار دەکاتەوە، کە بە مامۆستا بڵێن ئەو ئەمڕۆ ناتوانێت وانەکانی بخوێنێت، چونکە ئەگەر خودا بۆی رێکبخات ئەوا بە نیازە سەفەرێکی دوور بکات، ئەگەر نەهاتەوە لە جیاتی ئەو دەستی ماچ بکەن و داوای لێبوردنی بۆ لێبکەن. مەلا لە مزگەوت دەردەچێت و روو دەکاتە بازاڕی شار. لەمسەرەوە خۆی پیا دەکات و دەگاتە ئەوپەڕی قەیسەرییەکە، وەك کڕیارێك بە دوای کوتاڵێکی دەگمەندا چاو بگێڕێ ئاوەها بە ئەمبەر و ئەوبەری دووکانەکاندا دەڕوانێت تا دەگاتە ئەوسەر و لەوێوە دووبارە بە رێگاکەی خۆیدا دەگەڕێتە

دواوه. بـەدەم ڕێگـاوە بـیری لێدەکاتـەوە تـا دەگاتـە قەبرسـتانەکەی دامـێنی چـیای باوەشاسوار، دیسان بەهەمان شێوە بەچاوی کڕیار دەگەڕێتە دواوە بۆ ناو بازاڕ.

ڕۆژانە لە چێشتەنگاو بەدواوە بازاڕ جموجوڵی تێدەکـەوێت. خـەڵکی شـار بـۆ کـڕینی پێداویـستییەکانیان ڕوودەکەنـە ئـەم قەیـسەرییە و کەسـی دەسـبەتاڵ و بێکـاریش بـۆ خۆخافڵاندن و کاتکوشتن دەچێت بەسەر یەکێك لە کورسییە دارینەکانەوە و لە پێش لووتی دووکاندارێکی دۆستیدا دادەنیشێت و چایەکی ڕەشیش نۆش دەکات.

هەر ئەوکاتانە، فورسانە عارەبەکانیش بە مەبەستی جۆراوجۆر بە تاك و جـووت دێنـە ناو بازاڕەوە. مەلا مەحموود دەڕوانێت پیرە فورسانێك تفەنگە هۆڵەندییەکەی ناوەتـە سـەر ئەرەی شانییەوە و یاپشە یاپشە سەربەرەو ژوور دەڕوات و ئاگـای لـە مـەحموودی بێـزەواڵ نییە، ئالەوێدا هەر وەکو ئەوەی هەنگوینی لە کلـۆری داربەڕوویـەکی پـیردا دۆزیبێتـەوە، مەلا ئاوەها قۆڵی لێهەڵدەکات، هەردوو چمکی کەواکەی لێـدەکات بـە دارا و ئـەو هەڵـە زێڕینەی کە لەئەو سبای ساڵحانەدا دوو سەفەری ڕۆح سووتێنەری ناو بازاڕی بۆکردووە لـە دەستنادات، کە فورسانەکە دەگاتە بەر دەرگای چایخانەکەی (کـەمال چایـچی) مـەلا وەك پڵنگێکی برسی پەلاماری کـابرای عـارەب دەدات و قۆنـداغی تفەنگەکـە زۆر بەسـووك و ئاسانی بـە دەسـتییەوە دێـت. پـیرە فورسـانی عـارەب وەك دارێـك مۆرانـە لێیـدابێت و ڕەشەبایەك بیخات بەلادا، ئاوا لار دەبێتەوە. ئیتر مـەلا سـەر بـەرەو ژوور دەقوچـێنێت و پڕتاو بەرەو دەرەوەی شار ڕادەکات، کە تفەنگەکە ئاوەها بـە سـووك و ئاسـانی دەکەوێتـە دەستی ئەوەندەی تر وزە و توانا و ورە دەزایەتـە دڵ و دەسـت و بـازووی و بـە قەڵـەمباز تەنگ لە چەمی قوشە چاپان هەڵدەچنێت.. ئاخر مەلا چاکی دەزانی، کە لە چەم پەڕییەوە ئیتر هەر دێو بە دێوی خۆی زات ناکا بکەوێتە دووی، بەڵام بۆ بەدبەختی ئەم کوڕە کـوردە چەند فورسانێك بە ڕێکەوت بەرەورووی دێن، کـە دەبیـنن ئـەم لادێیـە تفـەنگێکی بـە دەستەوەیە و ڕادەکات، تێیدەخوڕن، ئەویش چاپووکانە دەست دەبات و میلی تفەنگەکـەی ڕادەکێشێت، بەڵام قۆرتی چارەڕەشیی و نەگبەتییەکەی ئالەوێدا بـوو، کـە تەنانـەت یـەك فیشەکیشی تیادا نابێـت، ئـیتر قەڵـەمی ئـەژنۆی دەشـکێت. فورسـانەکان دەوری دەدەن، تفەنگەکەی لە دەست هەڵدەپڕوکێنن و هەر لەئـەو شـوێنەدا سـەروگوێلاکی بـە قۆنداغـە تفەنگ دەشکێنن و جەستەی مار ئەنجن دەکەن. پاشان دەیدەنـە بـەر بـۆ (مەقـەڕ) لـەوێ

سەرەك فورسانەكان لێكۆڵینەوەیەكی سەرپێی لەگەڵدا دەكات ئینجا رەوانەی (سەرا)ی دەكات و لە (قشلە) بەندی دەكەن.

پاش لێكۆلینەوەكە بۆیان دەردەكەوێت فەقێیە و لە حوجرەدا دەرس دەخوێنێت، بەرپرسی بنكەی پۆلیسی شار دەنێرێتە دوای (مەلا محەمەد توركە)دا، كە بە یەكێك لە دۆستە نزیكەكانی رژێم و نەیارێكی سەرسەختی كورد لە قەڵەم دەدرا، ماموور مەركەز لە بارەی تاوانبارەوە داوای زانیاری لێدەكات، بەلاّم ئەو مەلا توركمانە ئەگەر چی مەلا مەحمودیشی نەدەناسی مەردانە دێتە جواب و دەڵێت: ( ئەم كورە فەقێیە لە حوجرەی من دەخوێنێت و زیاتر لە دوو هەفتەیە ئەقڵی لە دەست داوە و شێت بووە، بۆیە بە ئەم كارە هەڵساوە.. پاشان تاوانبار لە ئیفادەی مەلای توركمان ئاگادار دەكەنەوە و رێی بۆ دادەنێن چی بكات و چ بڵێت.. دەبێت ئەویش وەكو شێت هەڵسوكەوت بكات تا لە سزای قورس رزگاری بێت. ئیتر مەلا وەكو ئەكتەرێكی لێهاتوو چ لە بەندیخانە و چ لە كاتی لێكۆڵینەوەدا رۆڵی شێتێكی پەتەری دەگێرێت و قسەی مەلای توركمان پشت راست دەكاتەوە، هەر بۆیە راپێچی شێتخانەی بەغدایان كرد و ماوەی ساڵێكی رەبەقی لەوێ بەسەر برد ئینجا ئازاد كرا.

مەلا مەحموودی وەلی ژیانی لە قەسابخانەكەی موسڵ لە ساڵەكانی هەشتادا بە خنكاندن كۆتایی هات.



## ( ٦ )

کانیماران گەورە دێیەکی دەشتی گەرمیانە و لە رووی کارگێڕییەوە سەر بە ناحیەی سەرقەڵایە، بە دووری ٤٠- ٥٠کم دەکەوێتە باکووری شاری کفرییەوە. بەسەر ئەم گردەی پشت ماڵی باوکمەوە ئەگەر بە دانیشتنیشەوە بڕوانیت ماڵ بە ماڵی ئاواییت لێوە دیارە. تەنانەت ناو حەوشە و بەرهەیوانی مزگەوتەکە دەبینیت و هەر لەوێوە دەتوانیت ئەو ئافرەت و کیژۆڵانەش بژمێریت، کە یەك یەك و دوو دەچوونە سەرکانی ژنان و بە کونە ئاو و مەنجەڵەوە دەگەڕانەوە ماڵ، بە لای دەستی راستدا رووەو باشووریش بۆ ئەو دەشتە پان و بەرینە بڕوانە، ئەگەر چاوەکانت وەکو چاوی گوندنشینەکان تیژ بێت، ئەوا دێی (فەتاح هۆمەر) و (سەید چەژنی) دەبینیت، ئەگەر چاوت زیاتر بەهێزبێت، لەوانەیە دێی (بەکرەشەل)یش بەدیی بکەیت، خۆ ئەگەر بە دووربینیش بڕوانیت لوتکەی چیای (باوەشاسوار) بەدی دەکەیت، کە دەڕوانێتە سەر شاری (کفری)دا، هەروەها شارۆچکەی (سەرقەڵا)ت لەبەردەسدایە، بەڵام بەلای رۆژهەڵات و رۆژئاوا و باکووردا ئەگەرچی گوندەکان لەئەوانەی باشوور نزیکترن، بەڵام بەدی ناکرێن، چونکە ئەو دەڤەرە هەردە و هەڵەت و گردۆلکەی بەرز و نزمن و دێهاتەکان خۆیان لەوێ حەشار داوە.. دووریی لەم سەر گردەوە بۆ ماڵی باوکم مەودای بەرد هاوێژێکە، حەوشەیەکی گەورە و سێ گەلەخانووی دوور و درێژ و کاگەنێك دەورەی داوە، دیوەخانە بەرز و بەقوڕە سوور سواخدراوەکەش بەسەر حەوشەکەوە رووەو خۆرهەڵات دەڕوانێت.

من لەئەو ماڵ و دیوەخانەدا چاوم کردەوە. هەر کە فامم کرد زانیم دەبێت منداڵێکی پیاو بم!! چونکە باوکم هەردەم حەزی دەکرد کوڕییەکی رێك و بێنوقسانی ئەوبم. خۆ ئەگەر لە خوودی خۆی پیاوتریش بم ئەوا بۆ ئەو شانازییە، چونکە وەجاخەکەی بە رۆشنی دەمێنێتەوە. باوکم لە هەموو ئانوساتێکدا بە رۆژ و شەو، کە دەرفەتی هەبوایە ئامۆژگاری دەکردم و پێیدەگوتم: کوڕم ئەبێ تۆ بزانیت کوڕی کێیت، پێت یەژن برازای کێیت.. دەبێت لە دیوەخاندا لە نزیك دەرگاکەوە دابنیشیت و وریابیت مەسینە و دەستشۆرەکە بێئاو و سابوون نەبێت، بە ئاقڵی گوێ لە حیکایەت و دەمەتەقێی میوانەکان بگرە، فێری قسەی خۆش و جوان و پیاوانە ببە. تۆ دەبێت هەر تەنیا گوێگر بیت، بە تایبەتی لە ئایەت و حەدیسەکان و ئەو فەرمایشتانەی هەر کە لە دەمی مەلا کەوتنە خوارەوە دەبێت تۆ بیانقۆزیتەوە و لەبەریان

بکەیت، ئەگەر بە قسەی باوکی خۆتت کرد ئەوا پیاوێکی نتم و ژیر و قسە زانت لێدەردەچێت و خەڵکی دەڵێن: دەك ڕەحمەت لەئەو دایکەی شیرەکەی ناوەتە دەمت و هەزار ئافەرین بۆ ئەو باوکەی کەوا پەروەردەی کردووی..

باس و خواسەکانی مەجلیس لە سێبەری دیواری مزگەوت و دیوەخان و سەرگردەکەی پشت ماڵی باوکم و ئەو یەك دوو شوێنەی تر، کە لە کاتی بێکاریدا گوندنشینەکان لێی کۆدەبوونەوە بە دەم گەمەی دامەدامە و نۆڕسکان و کلاوکلاوێنی شەوانەی زستانەوە دەیانکرد، باسگەلێك بوون لەسەر بارانی پەڵە، کاتی تۆوکردن، تەڕەکاڵ، وەرد بڕین و وشکە ساڵ، ژن بە ژن و خێری زۆری نوێژی جەماعەت و سووتانی خەرمانە خەلە، بڕینی کلکی کەری فلانەکەس و چوون بۆ شار و بابەتی تر، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ژیانی ڕۆژانەی خۆیانەوە هەبوو، جا ئەو بابەتەی پێوستی بە چارەسەر هەبوایە ڕێگاچارەیان بۆ پێشنیار دەکرد، ئەو بابەتانەش کە لە توانا و بیرکردنەوەی ئەواندا نەبوایە دەبوو بە غەڵبەغەڵب و ژاوەژاو. پاشان پیاو ماقوولێك یان ڕیش سپییەك دەهاتە دەنگ و دەیگوت: لا حەولە وە لا قووەتە ئیلابیلا.. بە خوا برا مەگەر خوا فریا بکەوێت و چارەسەری بکات، خوا بە ڕەحمە گەورەکەی خۆی ڕەحم بە گرۆی موسڵمان بکات، ئێمە بەندەی ئەوین و هیچ دەسەڵاتێکمان نییە.. دەی خوا گەورەیە بیدەنە دەستی ئەو، ئەم دونیا موڵکی خۆیەتی خۆ کاولی ناکات..

منی ساوا چەندێ چێژم لە دەمەتەقێ و جۆرە سوحبەتێکی ئەم جۆرە مەجلیسە وەردەگرت ئەوەندەش نائومێدی و دەسەپاچەیی ئەم باوکە بەهێز و بە توانایانەم دەیتۆقاندم. دەچوومە یەك و ئەوەندەی تریش خۆم لەلا بچووك و بێدەسەلات دەبوووەوە، ئاخر ئەوان، کە نائومێد دەبوون پەنایان بۆ خوا دەبرد، ئەو خودایەی کە بە عەرشی عەزیمەوە لەسەر کورسییەکەی دانیشتووە، ئەوەندە بە هێز و توانایە گوێی لە گیزەی مێشوولە و تەپەی پێی مێرولەیە، ئەگەر هەوەسی لێبێت (بە کول دەڵێت کول و بە تیژیش دەڵێت تیژ) و بە (کفرەلکوونێك) ئەم دونیایە ژێراوژوور دەکات. ئەو خودایەکی بێخەمە و کەس لە ڕەنگی نییە.. باوکم دەیگوت:

خوا، چەند مەلائیکەتێکی خۆشەویستی هەیە و مەئمووریی بۆ دەکەن، ئەوەتا حەزرەتی میکائیلی کردووەتە بەرپرسی باران بارین و بە فەرمانی ئەو نەبێت باران نابارێنی، کە فەرمانیشی پێدا ئیتر مەلائیکەتی ڕەعد بە قامچی برووسکە دێتە وێزەی هەورەکاندا و ئەوانیش لە حەیبەتدا دەگرمێنن و بارانی ڕەحمەت بەسەر زەویدا دەبارێنن، تا پەڵە دەدات و ساڵەکەی دەبێتە ساڵێکی هات، ئیتر خێروبەرکەت بە سەر زەویدا دەڕژێت، بەڵام با ساڵەکەی

هاتیش بێت ئەگەر جووتیارەکان و بەندەکانی خودا ناشوکر بن و خودا بەحەق نەناسن، ئەوا بە تاینکردنی یەك رەوە کوللە، گشت خەلە و دەغڵەکان مەحوو دەکاتەوە، یان سون و کیسەڵەیان تێبەردەدات.

مەلائیکەتێکی تری هەیە ناوی ئیزرائیلە. ئەم ئیزرائیلە هەردەم لە ئامادەباشیدایە و بۆ رۆحکێشان چاوەڕوانی فەرمانی دەکات، پاش ئەوەی کە ئیزرائیل گیانی هەموو (زیرۆح)ەکانی سەر ئەم زەوییە دەکێشێت ئینجا نۆرەی رۆحکێشانی دێو و درنج دێت، پاشان یەك لە دوای یەك رۆحی مەلائیکەتەکان دەکێشیت و سرە دێتە سەر شەیتانی ئیبلیس، ئاخر ئەویش مەلائیکەیە، بەڵام لە خودا یاخی بوو و بووە دوژمنی سەرسەختی بنیادەم، بۆیە خودا نەعلەتی لێکرد و لە ریزی فریشتەکان وەدەرینا، ئیزرائیل بە شەیتان دەڵێت: تەنیا تۆ ماویت مەلعون، وەرە با رۆحت بکێشم.. بەڵام ئەو مەلعونە خۆی نادات بە دەستەوە، بۆیە ئیزرائیل پەلاماری دەدات و ئەویش هەڵدێ، لە ئەمپەڕی دونیاوە بۆ ئەوپەڕی دونیا راوی دەنێت، هەتا تەنگاوی دەکات و دەپێچێتە ناو قەبرستانێك، ئالەوێدا تەنگی پێهەڵدەچنێت، شەیتان لە شپرزەیی خۆیدا پێی لە کێلی قەبرێك هەڵدەکەوێت و ئیزرائیل سوارسەری دەبێت و گیانی دەکێشیت.

پاشان لەوێدا ئیزرائیل بە خودای گەورە دەڵێت: خودایە خۆ تۆ ئاگات لە هەموو شتە و دەزانیت ئەرکی من لێرەدا کۆتایی پێهات، فەرمانت بە چییە و چ بکەم؟ خودای گەورە دەفەرموێت: تەنیا لە عەبدەکانی خۆم یەك کەس ماوە رۆحی بکێشیت، ئەویش خۆتیت.. ئینجا ئیزرائیل چنگ دەنێتە بن و گەردنی خۆی، لەگەڵ روحکێشانی خۆیدا یەك زریکەی بۆ دەکات ئەرز و ئاسمان دەنگ ئەداتەوە.. جویرائیلیش پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر بە ئاسمانەوە ماوەتەوە و بە هیچ شێوەیەك توخنی زەوی نەکەوتووە..

(ئیسرافیل) ئەو مەلائیکەتەیە، کە چاوەڕوانی فەرمانی خودای خۆیەتی هەرکە مەنسور دای لە کەوان ئەویش فووی پیادا دەکات و زەوی تەخت دەبێت، ئەم شاخ و داخ و هەردە و هەڵەتە، تەنانەت ئەم ئاواییەی ئێمەش وا تەخت دەبێت لەئەوپەڕی دونیاوە هێلکەیەك دابنێ، لەمپەڕی دونیاوە تەماشایکە بەدی دەکەیت!! پاشان خودای گەورە بە چۆڵ و هۆڵی لەئاسمانەوە دەڕوانێتە ئەم مولکەی خۆی، هەر خۆیشی دەزانێت ئەم زەوییە چەندێك بە چۆڵی دەمێنیتەوە، هەتا بارانێکی چل شەو و رۆژیی خەست دەبارێنێ، ئاوی ئەو بارانە ئەوەندە خەستە هەر دەڵێیت تۆوی شەهوەتی بنیادەمە، دوای ئەم بارانە هەرچی مردوو هەیە وەك گیای بەهاران

سەر لە زەوی دەردەکەن، دەڕوێن و بەڕووت و قووتی رادەوستن، ئینجا بە فەرمانی خودا ڕۆحەکانیان بەرەڵا دەکرێن و هەر یەکە دەچێتەوە جەستەی خاوەنەکەیەوە. ئەم بنیادەمانە ئێستە چاویان ها بە تەوقی سەریانەوە، بۆیە خودا چاوی عەبدەکانی خۆی دەنووسێنێت بە تەوقی سەریانەوە تا نەزەر لەیەك نەکەن و نێر و مێ عەورەتی یەك نەبینن، دوایش..!! وەی لە دوایی.. دوایش بەرەو مەحشەر دەکەونەڕێ بۆ حەشر و نەشر.. بەرەو پردی سیرات، ئەو پردە بۆ کافر و خودانەناس و نوێژ نەکەرەکان ئەوەندەی تاڵە موویەك باریك دەبێتەوە ئیتر یەك لە دوای یەك لەئەو بەرزاییەوە دەکەونە خوارەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.. ئیماندارەکانیش بەرەو ناز و نیعمەتی بەهەشت بەسەر پردی سیراتدا بە بێترس دەپەڕنەوە..

کەسێك نییە لەئەم دنیەی ئێمەدا خودا و پێغەمبەر و مەلائیکەتەکانی نەناسێت و شێوەی ئاخرزەمان و ڕۆژی زیندووبوونەوە و حەشر و نەشری لە یاد و بەرچاو نەبێت. من ئەو وێنە ترسناکانە دەیانتۆقاندم و شەوانە لە جێگادا کێنگڵم دەخوارد. هەموو کات ئەوەم دەزانی، کە مزگەوت پیرۆزترین جێگایە، چونکە ماڵی خودایە و پیرۆزترین ڕۆژیش لە هەفتەدا هەینییە و گەورەترین و پیرۆزترین مانگیش مانگی ڕەمەزانە، لە ناو ئەو سی ڕۆژی ڕەمەزانەشدا شەوی لەیلەتولقەدر پیرۆزە، بۆیە پیاوانی ئاوایی بەتاسەوە چاوەڕوانی ئەو شەوەیان دەکرد تا بە بەرچاوی خودا و مەلائیکەتەکانییەوە، کە دادەبەزنە سەر زەوی زیکر و تەلیلە و نوێژ بکەن و خێری هەزار مانگیان بۆ بنووسرێت.

پاش نوێژی عیشا باوکم چرا نەوتینەکەی هەڵگرت و ڕووی لە مزگەوت کرد، تا ئەو شەوە نوێژ و زیکر و تەلیلەکان تێکەڵ بە زیکر و تەلیلەی مەلائیکەتەکان بێت و بەرزبێتەوە بەرەو ئاسمان، تا خودا خێری هەزار مانگەکەی بۆ بنووسێت، ئەو ڕۆیشت و من چوومە سەر جێگاکەم، بەڵام شەو کردی و من کردم و خەو نەچووە چاوم. ئەو شەوە ترس و خۆفێکی سەیر دایگرتبووم، ترس لە ئاخر زەمان و ڕۆژی حەشر و نەشر، ترس لە ڕەنگ و ڕووخساری مەلائیکەتەکانی، کە پاش تاوێکی تر پۆل پۆل لە ئاسمانەوە دێنە خوارەوە و دەڕژێنە سەر زەوی. ئەو شەوە ناو ئاوایی کپ و بێدەنگ بوو، ئاسمانیش کشومات، هەسێرەکان گەشتر لە شەوانی پێشوو وا دەدرەوشانەوە واتدەزانی ئێستە نا تاوێکی تر دەڕژێنە سەر زەوی. ئەو شەوە تەنیا سەگێکیش چییە حەپەی لە دەم دەرنەدەچوو، ئەم دیاردانەش بۆ خۆی دیاردەی شەوی لەیلەتولقەدرن، بەسەر جێگاکەوە هەڵاژابووم و لە دەنگی هەناسە و مشەمشی منداڵەکان بەئەولاوە هیچی ترم نەدەبیست، ئەو چەند جارەی کە هەڵدەسام درزێکم دەخستە نێوان

دەرگای ژوورەکە و دیوارەکەوە و بە ئەسپایی سەرم دەردەهێنا و چاوێکم بەناو حەوشە و سەربانەکاندا دەگێڕا، بەڵام هیچم نەدەبینی، بۆیە لەسەرخۆ دەگەڕامەوە ناو جێگاکەم، خۆ من دەمزانی هەر سی ڕۆژ و شەوی ڕەمەزان خودای گەورە دەست و دەمی دێو و درنج و جنۆکە لە بنیادەم دەبەستێت، ئەویش لەبەرخاتری پیرۆزیی ئەو مانگەیە بۆیە لەنەو بارەوە ترسێکی وام لە دڵدا نەمابوو بەرانبەر بە جنوکەکانی (مەجە گلاڵی) و ئەو دێوانەی کە ( دەروێش عەول) و (مامەخەلیفە) باسیان کردبوون، دەمزانی ئێستا بە ئەمری خودای عەزەوەجەل لەغاو کراون، بەڵام ئەو سامەی چووبووە دڵمەوە هەر بەری نەدەدام. نازانم شەو چەندی ڕۆیشتبوو چەندی مابوو، گوڕێکم دایە بەر خۆم و هەڵسامە سەر پێ، ئەمجارەیان دەرگاکەم خستە سەرپشت و ڕوانیمە ئاسمان، مانگ دوو بەشی زیاتر تواوەتەوە ئەو بەشەکەش کە ماوە ڕووناکییەکەی دابەشکردووەتە سەربانی مزگەوت و کۆڵان و سەربانی ماڵەکاندا، لە شوێنەکەی خۆمدا ڕاوەستام و بەووردی دیقەتم لە ئاسمان دا، ئەوەندە ڕوانیم چاوەکانم فرمێسکیان تێزا و کەوتە ڕێشکەوپێشکەکردن، بۆیە سەرم داگرت، بەسەر دەستی کراسەکەم چاوم سڕی، پاشان کەمێك وڵێمن و دووبارە سەرم بەرزکردەوە، ڕوانیم چەند تارماییەك لە ئاسمانەوە بەرەو ناوئاوایی شۆڕ دەبنەوە، تارماییەکان وردە وردە گەورە دەبوونەوە، هەر دەتگوت ڕەوە پەڕەسێلکەی گەورە و سپین دەهاتنە خوارەوە بۆ ناو کۆڵان و سەربان و ناو حەوشەی مزگەوتەکە، لەوێوە تاقم تاقم ڕوویان دەکردە قیبلە و دەیانچریواند، موچڕکێك لە تەوقی سەرەمەوە هات و لەگەڵە مووسی پەنجەی پێمەوە دەرچوو، هەر لەوێدا دانیشتم و پاڵم دا بە دیواری ژوورەکەوە و هەردوو لەپم خستە سەرچاوەکانم، پاش تاوێك دانیشتن هەر چۆنێ بێت خۆم کرد بە ژوورەکەدا و خزامە ناو جێگاکەمەوە، بە ئەو سەرسامییەوە ماوەیەك مامەوە دوایی بە دەم بیرکردنەوەوە لە خۆمم پرسی: ئایە بەڕاستی ئەوە پۆلە مەلائیکەت بوو بینیم؟ بۆیە ئۆقرەم لێبڕا و دیسان هەڵسامە سەرپێ ئەمجارە زۆر لەسەرخۆ و بە ئەسپایی دەرگاکەم لادا و ڕوانیمە ناو حەوشە و سەربانی ئەو گەورەی کە دەیڕوانییە سەر کۆڵانەکەی ئەولادا، بەئەو سەربانەوە شتێکی سپیم هاتە پێش چاو لەبەر تیشکی مانگەشەوەکەدا دەبرسکایەوە، تەزوویەکی گەرم زاییە ناو گلێنەی چاوم و کەللەمی قورس کرد، بۆیە بە ناچاریی کشامەوە ناو جێگاکەم و بۆ دواجار ئەو جەستە بێهێزە بچکۆلانەیەم گرمۆڵە کرد و خەوم لێکەوت.

ئەقل و مێشکی منداڵێکی ٤- ٥ ساڵیی لە دونیایەکی بچکۆلەدا کە سنوورەکەی لە هێزی بینینی چاو تێپەڕ نەکات، نیشتمانەکەی دێکەی بێت و پایتەختی ئەم وڵاتەشی ماڵێکی

بچکۆلانەی لە خشت و قوڕ درووستکراوی رووت باوکیشی دوای خوای گەورە، بەهێزترین کەس و راستگۆترین مەخلووق بێت، نازانم چۆن جێگای ئەم هەموو هێز و توانا نەبینراوە و ترس و خۆفی مەلائیکە و فریشتەکانی مەلا و مزگەوت، دێوە زەبەلاح و ترسناکەکانی شێخ و جنۆکە ناشرین و بە توانا و کافرەکانی ئەو چەم و دۆڵ و کەلۆزانەی تیادا دەبێتەوە. دەروێش دەڵێت: شێخ دێوە شەلەی لە شەڕێکدا بە دیل گرت و شایەتمانی پێهێنا، ئێستە ئەو دێوە موسڵمانە و وەکو هەر دەروێشێکی دڵسۆز دار و چیلکە بۆ تەکیەی بابە شێخ لە دەشت و کەژ کۆ دەکاتەوە، هەر بارێکی بەقەد باری چوار هێسترە، کە دەیدات بە کۆڵیدا و دەیهێنێتەوە ماڵی باوە شێخ. ئەم دێوە تەنها نانی دەستی دایکە شێخ دەخوات، لە تەکیەدا کە برسیی دەبێت شەوانە دەیکاتە بۆڵەبۆڵ و زرم و هووڕ، هەتا یەك مەنجەڵ دۆینە نەخاتە بەر دەستی کپ نابێتەوە.

رۆژێکیان باوە شێخ بەرماڵەکەی کێشایە سەر خۆیدا و خەوی لێکەوت.. دەروێش دەیگێڕایەوە و دەیگوت: من بە دیارییەوە دانیشتبووم، کە بەرماڵەکە نشتەوە و بە زەوییەکەوە لکا، زۆری پێنەچوو وەکو قارچك جەستەی موبارەکی لە ژێر بەرماڵەکەوە هەڵتۆقی و لە خەو هەڵسا.

پاشان داوای مەسینەیەك ئاو و نەختێ خۆڵی پاکی لێکردم، کە بۆم هێنا دەست و پلی بسمیل کرد و نەیهێشت لێیبپرسم، جەنابی فەرمووی: کە خەوم لێکەوت لە غەیبەوە پێیانڕاگەیاندم، کە شەڕ لە نێوان دێوە کافر و ئیسلامەکاندا قەوماوە و دێوە شەلەش نابلۆقە دراوە، ئەگەر فریانەکەوم لەوانەیە شەهیدی بکەن، بۆیە منیش بە هیمەت و بەرەکەتی باوەگەورەم غەیب بووم و خۆم گەیاندە ناو شەڕەکە، شەڕ قورس بوو منیش دەستم نەپاراست، نازانم چەند دێوی کافرم تۆپاند، یەك دوو دێوی کافری برینداریم بینی لەناو خوێندا دەگەوزان، لە کۆتاییدا دێوەشەلەم رزگارکرد و گەڕامەوە، ئەوە دەستم بە خوێنی ئەو دێوە کافرانە گلاو بوو بۆیە بسمیلم کرد. دەروێش کە قسە و باسی پێنەدەما، لە دیوەخاندا بیکات، حاڵی لێدەهات و بەکوڵ دەگریا.

منی منداڵ ئەوەندە بە کەسایەتی ئەم دەروێشەوە وابەستە و سەرسام بووم، جارێکیان وەکو ئەو جۆرە حاڵێك گرتمی و دەستم کرد بەگریان!!

عەسرانێکی درەنگ (مامە خەلیفە) بۆ ئاوایی دێتەوە، کە دەگاتە ئەو چەمەی ئەودیو، سەیر دەکات هەروا جنۆکەیە دەستی گرتووە، سەرچۆپییکێش دەقریوێنێت و دەڵێت: "تریت و

ماسە تریت و ماسە.. باڵای لاولاو عەرعەرناسە". جنۆکەی سەرچۆپیکێش کە ئەم بنیادەمە دەبینێت لە دوورەوە بەرەولایان دەچێت، ئەترسێت زەماوەندەکەیان لێتێکبدات بۆیە بانگی دەکات و دەڵێت: "مامە خەلیفە ئەوەی بەسەر زارتەوەیە مەیەژی و وەرە دەست بگرە.." ئیتر مامە خەلیفەش دەچێتە ناویانەوە، بەبێ سێ و دوو دەسەسڕەکە لەسەر چۆپیکێش وەردەگرێت و دەس دەکاتە هەڵپەڕکێ، پاش یەك دوو سوورِ هەڵوەستەیەك دەکات و بەدەم بیرکردنەوەوە لە خۆی دەپرسێت: ئایە ئەو شتە چییە وابەسەر زارییەوەیە و نەیەژێتی؟ پاش سوورێکی تری هەڵپەڕکێ ئەوسا دێتە هۆش خویدا و دەزانێت ئەم کورتە باڵایانە جنۆکەن، بۆیە (بیسمیلا)یەك دەکات و هەر کە وشەی (بیسمیلا)ی لە دەم دێتەدەر یەکسەر زەماوەند و هەڵپەرکێ کۆتایی پێدێ و جنۆکەکان غەیب دەبن، ئەوساکە مامە خەلیفە شایەتمانێك دەهێنێت و ملی ڕێگا بەرەو ماڵ دەگرێتەوە بەر.

دایکم دەیگوت: کوڕەکانم ئەم بەسەرهاتە، مام خەلیفە خۆی گێڕاویەتییەوە بۆ خەڵکی ئاوایی و ئەو پیاوەش پیاوێکی ڕاستگۆ و لەخواترس بوو..

ئێمەی منداڵی ئاوایی حیکایەت و چیرۆکی سەیروسەمەرەمان سەبارەت بە جنۆکە دەبیست. جنۆکەش وەکو بنیادەم خودا خەڵقی کردوون. ئەوان شێوەیان کوتومت لە خۆمان دەچێت، بەڵام کورتە باڵان. باڵایان هەر ئەوەندەی باڵای منداڵێکی ٥- ٦ساڵە بەرزە. کافرەکانیان ناشیرین و چڵمن و چڵکن، قژ ئاڵۆزکاون و ڕەنگ و ڕووخساریان وەك بنیادەمە کافر و بێدینەکان سوور و سپی و چاویشیان وەك کووژەکە شینە. ئەوان قسەی ئێمە دەبیستن و تێیدەگەن، بەڵام بە دەگمەن بنیادەم گوێی لە قسەی ئەوان دەبێت، هەر کە دونیا تاریکی کرد ئەوانگەل دەڕژێنە ناو ئاوایی بۆ کۆکردنەوەی ژێردەستە و پاشماوەی خواردن، زۆر حەزیان لە خواردن و کرۆشتنی سوقان و لوولاقی پێی مامرە. ئێوارە داهات لە بنمێچی خانوو و درزی دیوار و ژێر خشتەکانەوە بە خۆیان و منداڵەکانیانەوە دەڕژێنە ناو حەوشە و سەرسەکۆ و بەر دەرگای ماڵەکان، هەر بۆیە ئەبێت وریابیت و ناوی خودا و بیسمیلات لەسەر زمان بێت. شەوانە ئەگەر ویستت چامۆلکەیك ئاوی گەرم بڕژێنێت نەبێت بیسمیلا بکەیت هەتا جنۆکەکان فریای خۆیان بکەون و بەچکەکانیان دووچاری سووتان نەبێت، ئاخر ئەگەر ئاوی گەرمت کردە سەر بەچکە جنۆکەیەکی موسڵماندا و سووتاندت ئەوە تۆش لەئەم دونیادا منداڵێکت بە سووتان دەچێت!! خۆ ئەگەر بەچکە کافرێکت سووتاند ئەوا ئیتر دایك و باوکەکەی لە پارێزدا دەبن هەتا دەست لە خۆت یا لە خۆشەویستێکت دەوەشێنن و تۆڵەی

خۆیان دەکەنەوە. مەلا دەڵێت: جنۆکە دەچێتە پێستی پشیلەوە، جن خۆی دەکاتە پشیلەی رەش!!

من خۆم جارێك دەمەو مەغریب جنۆکە پشیلەیەك ترساندمی، پشیلەیەکی رەشی گوێ قووت لە دەلاقەی نیشتمانەکەوە سەری کێشایە ئەمدیودا و بە یەك میاوە رایچەڵەکاندم و قیژاندم، پاش ئەو قیژەیە ئەخۆش کەوتم. برژانگەکانی چاوم تاك و جووت رەپ لێیڕاوەستان و دەمم بۆنی ترسی لێدەهات. دایکم سێ رۆژ لەسەر یەك پێش خۆرناوابوون ئاگرێکی دەکردەوە و خوێی دەپرژاندە سەر ئاگرەکەدا و لەئەمدیوەوە بۆ ئەودیو بەسەر ئاگرەکەدا هەنگاوی دەنا، خوشکەکانم دەیانگرت:

- دایە ئەوە چی دەکەیت ؟

ئەویش دەیگوت:

- ترسی کوڕەکەم لە پشیلە رەش دەردەکەم.

سێ رۆژ لەسەر یەك ئەم ئاگرکردنەوە و بازدان و پرسیار و وەڵامە بەردەوامی بوو، لە چوارهەمین رۆژدا لەئەو ئەخۆشییە رزگارم بوو.

***

لێزەمە و شەستە بارانی ئامۆژگارییەکانی باوکم و رووداوە سەیر و ترسناکەکانی ناو حیکایەت و چیرۆکەکان دەربارەی دێو و جنۆکە، چاو بازووبوونەوە و وەڕینی وەك سەگی رەشی ئەو کابرا نوێژنەکەرەی کە لە سەرەمەرگیدا بوو بە مەخسەرە و پەند بۆ خەڵکی لە خودانەترس، غەزەبی خودا و ئاخرزەمان و رۆژی زیندووبوونەوە و حەشر و نەشر، ئەو رۆژانەی کە ئەوەندە ترسناك و تۆقێنەرە باوك و دایك نایانپەرژێتە سەر منداڵ و جگەرگۆشەکانیان، ئەو ئاگرە سووتێنەرەی جەهەننەم، کە لە چاو ئاگری ئەم دونیادا بە حەفتا ئاو شۆراوەتەوە، گوناهی قاقای پێکەنین و نەزەر و تەماشاکردنی نامەحرەم و خواردنی تەنیا یەك تەماتە یا یەك ترۆزی حەرام و نەپاراستنی ئادابی دیوەخان و هتد.. منی منداڵی کردبووە یەك تۆپەڵ ترس و شەرم و بوونەوەرێکی بێدەسەڵات، هەردەم وەك بەچکە مەیمونێکی تۆقیوی زارەتەرەك بە کۆڵ دایك و خوشکە گەورەکەمەوە توند چنگم لە ملیوانی کراس و کەواکانیان گیر دەکرد.

رۆژێك دایکم چنچکی کرد و پێیوتم: رۆڵە وەرە کۆڵم دەچین بۆ لای (ئەولا بازوو) بزانم چەقۆیەکی گاسەربڕم بۆ دروست ناکات..

لە دەرگای حەوشەکەی ماڵی باوکم دەربچۆ و سەربەرەو خوار نزیکەی سەد شەقاوێك برۆ و بە دەستی چەپتدا پاڵ بنە بە دەرگایەکی تەنەکەوە و بچۆرە ژوورەوە.. ئەویّ ماڵی ئەولاّ بازووە. رووبەری حەوشەکەی ئەم وەستای چەقۆسازە نزیکەی دووسەد مەتر دووجا دەبێت، ئەم حەوشە جگە لە پشقلدانێکی بچکۆلە ژوورێکی دوو بە چوار لە سووچی لای دەستی راستدا قووت کراوەتەوە، کە دەچیتە ژوورەوە خاوەن ماڵ لەژێر لێوەوە فەرموویەکت لێدەکات. ئەو پیاوێکی سوکەڵەی سەرورپیش ماشوبرنجە، بەسەر کەوڵێکی خۆشەکراوی تووك سپییەوە دانیشتووە و لاقی چەپی بۆ پێش خۆی راکێشاوە و لاقی راستیشی بۆ ژێر خۆی چەماندۆتەوە. کلاّوێکی بۆری چلکنی لەسەر ناوە، کە سەر هەڵدەبرێت دوو چاوی سپی کەلای شووشە ئاسا لەناو دوو کالانەی قووڵدا دەبرسکێنەوە. ئەم پیاوە بێکەس و رەبەنە، کەروێشك دەمێکی چەناکە کوڵی موو زبر و برۆ و برژانگ ئەستووری کەمدووی قسەخۆش و نوێژنەکەرە، لە تەوقی سەریەوە تا نووکی پەنجەی پێی سووتاوە و بەڵەك بووە، هەر بۆیە بە (ئەولاّ بازوو) ناسراوە. ئەو لەبەر ئەوەی قاچی سەقەتە هیچ کاروکاسبییەکی قورسی پێناکرێت، بۆیە خووی داوەتە دروستکردنی سیکارت و چەقۆ. ئێستە لە پیشەکەی خۆیدا وەستایەکی کارامە و دەسڕەنگینە. لەئەو رۆژەوە، کە رووی کردووەتە ئەم ئاواییە و لێرە نیشتەجیّ بووە، کەسیّ رووی تێنەکرد بڵێت: من باوکی، برای، خوشکی، یان کەسێکی نزیکی ئەم پیاوەم.. ئەو خۆی دەڵێت: کەسێك نییە لەسەر رووی ئەم زەوییەدا بە خوێی چێشتێك پێمبگات..

مامە ئەولاّ پشتی داوەتە دیوارەکەوە و بەرەو رووی کوورە ئاگرەکەی دانیشتووە. یەك دوو پلایس و گاز و چەند پارچە ئاسن و شاخە بزنی نزیك خۆی داناوە و چەکوشێکی بچکۆلە و یەکێکی تری گەورە لەگەڵ سندانێکی ئاسنین و مەقاشێکی لە پێشدا دەبینریّ، هەنگاوێك ئەولاتر سنوقێکی دارینەی رەنگ تەڵخ دەبینیت و لە خودا و خاوەنەکەی بەئەولاوە کەس نازانێت چی تیادا شاردراوەتەوە. ژوورەکەی بە دووکەڵ قانگی خواردووە و گەلاّ و قەفی قامیش و تەرکە و قەرەمی تەیمان و تەنەکەی ژوور سەری توێژتوێژ دۆزنجی گرتووە و رەشهەڵگەڕاوە. جلوبەرگ و پێخەفی نووستنی ئەم پیاوە ئەوەندە دووکەڵی هەڵمژیوە وەکو ئەو چۆلەکانەی کە پاسار و بنمیچی خانووەکەیان کردووەتە هێلانە، بۆرودێز هەڵگەڕاوە.

من زۆر بەزەییم بەئەو پیاوە سووتاو و شەل و بێکەسەدا دەهاتەوە. چەند جارێك کەرە و نان و دۆم بۆ دەبردە ماڵ و بە دیارییەوە دادەنیشتم تا دەیخوارد، کە چوومە حوجرە و پاشان بۆ خوێندن چوومە شار و فامم کرد، ئیتر ئەو بەزەییەم بۆ مامە ئەولا گۆڕا بۆ خۆشەویستی،

ئەویش وەکو هاوڕێیەکی خۆی سۆز و خۆشەویستی بۆ دەردەبڕیم. جارێك پێموت: مامە ئـەوڵا دەزانیت چەقۆ هەڵگرتن سوننەتە؟

ئەو سەری هەڵبڕی و وتی چۆن؟

وتم: ئەگەر کەسێك بەسەر زەوییەکی سەختەوە دانیشت بۆ دەس بە ئاو گەیاندن، دەتوانێت بە نووکی چەقۆکە چاڵێك لەبـەردەم خۆیـدا هەڵبکـەنێت و خۆڵەکـەی تیـادا شـیی بکاتـەوە، ئەوساکە میزی تێبکات تا میزەکەی پرش نەداتەوە و گیانی بێنوێژ نەبێت. ئەو سەرێکی بەرز کردەوە، زەردەخەنەیەکی شیرین زاییە سەر روومەتی و وتی: ئافەرین کوڕە شاریی.. ئافـەرین، ئەم سوونەتە لەلای خەڵکی ئاوایی زوو زوو باس بکە بەشکو چەقۆی زۆرتریان پێبفرۆشم، دەی خودا عەمرت درێژ بکات و ببیت بە ئەفەنییەکی ئاقڵ و قسەزان..

من پرسیارێکی ترم لێکرد و وتم: مامە ئەوڵا خۆ تۆ خوا دەناسیت و لێیدەترسیت، کەوایە بۆ نوێژ ناکەیت؟

هەناسـەیەکی قووڵی هەڵکێشا و کەمێ بێدەنگ بـوو، پاشـان وتـی: بـاوکی تـۆ و گـشت خەڵکی ئەم ئاواییە لە ترسی ئاگری جەهەننەم و تەماحی بەهەشتدا نوێژ دەکـەن. مـن لەئـەم دونیای رۆشنەدا منداڵێکی بەسەزمان و بێگوناح بووم، خودا بە ئاگر سـووتاندمی، بـۆ نـاز و نیعمەتەکەی بەهەشتیش خۆی کەریە. تۆ لەوە گەڕێ، باسـی زەوی سـوڕانەوەکەم بـۆ بکـە و چاك حاڵیم بکە، ئەو قسە تۆ لێیدەکەیت خۆر لە ئەو ئاسمانە چەقی بەستووە و زەوی بە دەوری خۆی و خۆریشدا دەسووڕێتەوە؟

من لە قوتابخانە چۆن لە مامۆستا حاڵی ببووم ئاوەها باسەکەم بۆ دووبارە کردەوە، ئەویش زۆر بە وردیی و سەرسامییەوە گوێی بۆ شل کردبووم، کە لێبوومـەوە لەگـەڵ سـەرلەقاندنێکدا یەك دوو ئم ئمی کرد و وتی: دەی مادامەوایە هەڵسە ئەفـەنی ئـەو کوورەیـەم بـۆ دەمبـدە بـا چەقۆیەکی جوانی قەڵەمبڕت بۆ ساز بکەم.

مامە ئەوڵا زۆرکەم لە ماڵ دەردەچوو، ئەگەر دەریش بـچوایە دوور نەدەکەوتـەوە، چـونکە توانای بڕینی رێـی دووری نـەبوو. نـازانم ئـەو رۆژە چـۆن رێـی کـەوتبووە مزگـەوت و لـەوێ رۆیشتبووە سەر حەوزە ئاوەکە و دەس و دەمـی لێـشۆردبوو، کـە مـەلای مزگـەوت ئاگـادار دەکەنەوە و پێیدڵێن گوایە ئاوی حەوزەکە گڵاوبووە و دەبێت هەر ئێستە دەری بدەن، چـونکە ئەوڵا بازووی نوێژنەکەری کافر دەسودەمی لێشۆردووە!! مەلا لە حەوشەی مزگەوت دەردەچێت و لە پێش دەرگای دەرەوەدا رادەوەستێت، فەرمان دەدات مامە ئەوڵای بۆ بانگ بکەن..

مامە ئەولاّ بە شەلەشەل نزیك دەبێتەوە. مەلا رووی دەمــی تێـدەكات و پێیـدەڵێت: وەرە وەرە هەی سەگە بازووی كافری بێدین، وەرە تێمبگەیەنە بزانم چۆن زەوی سوورِ دەخوات؟

+ قسەی وام نەكردووە؟

- بــەڵێ بــەڵێ تــۆ وتووتــە گوایــە خــۆر راوەســتاوە و زەوی بــەدەور خــۆی و خــۆردا دەسوورِێتەوە.. ئەمەشت وتووە؟ كفری واشت كردووە، هەی مەلعونی خوانەناس؟ دەی بۆمــان باس بكە؟

+ دەی باشە وتوومە و راستیشە! دەبزانم تۆ چی یەژیت؟

- باشە ئەگەر زەوی سوورِ دەخوات، بۆ رۆژێك لە رۆژان دەرگای ئەم مزگەوتە بەرەو قیبلــە وەرناچەرخێت؟

مامە ئەولاّ زۆر هەولّدەدات مەلا حاڵیی بكات و خۆیشی لەو بەلاّیە رزگار بكـات، بـەلاّم ئەو حاڵی نابێت، یان نایەوێ قسەی ئەم كافری نوێژنەكـەرە بـسەلمێنێت. ناچـار مامــە ئــەولاّ نموونەیەكی جوان و جەرگبرِ بۆ دەهێنێتەوە و دەڵێت: مامۆستا كردمــان تــۆ ســواری كــەرێك بوویتە و ئەویش سینی كردووە لە شوێنەكەی خۆیدا چـەقیوە و تــۆش ناچـاری بــە دارەكــەی دەستت دێیتە وێزەو سەر و گوێلاكی كەرەكەدا، ئەویش بە دەوری خۆیدا وەكـو میــزراح خــول دەخوات، ئایا جارێ لە جارەكان لووتی تۆ هەڵدەچەرخێتەوە بــۆ لای كلكــی كەرەكــە؟ مــەلای مزگەوت كە ئەم قسە دەبیسێت چاوی دەپەرِێتە تەوقی سەری و هانی فەقێ وردەكانی دەدات، كــە ئــەو كــافرە بدەنــە بــەر بــەرد و وەكــو شــەیتان رەجمــی بكــەن. منداڵــەكان وەك شــارە زەردەواڵەیەكی ئاڵۆزكاو وەردەبنە ئەو پیاوە هــەژارە و بــەردبارانی دەكــەن. ئــەویش بــە پەلــە پرووزە و بەهەزار فەلاكەت خۆی دەرباز دەكات.

مامە ئەولاّی دەسەپاچە و رەبەن هەردەم چاوی لە دەست ئەو ئافرەتە میهرەبانانە بــوو تــا سەتڵێك یان مەنجەڵێك ئاوی خواردنەوەی بۆ ببەنە ماڵ. جارجارێكیش بە پارە كەلوپەل و قاپ و قاچاخیان بۆ دەششت، بەلاّم ئەوەیشی دەزانی رۆژێك دێت تەواو پەكی دەكەوێت و خەڵكیش ئامادەنییە تاهەتایە خزمەتی پیاوێكی پەككەوتە بكــەن، بۆیــە هــەردەم چـاوی بــۆ ئـافرەتێ دەگێرا، ئافرەتێ بــشێت ببێتــە هاوســەری و لــە پاشــەرِۆژدا بەكــەڵكی بێـت. ئــەم خــەیاڵ و ختوورەیەی زۆرجار دەدایە بــای گــوێی خێرەومەندانــدا تــا رۆژێــك قــەیرە كــچێكی هــەژاری شێتۆكەی بێكەسیان بۆ دۆزییــەوە و هێنایــان بــۆی. ئــیتر وەكــو ئــەوەی تەمــەنی لــەنوێ بــۆ بنووسرێتەوە ئاوەها لە ســایەی (ئامینــە)دا گەشــایەوە، كــە بــە دەنگــی بــەرز و بەئەوپــەرِی

خۆشحاڵییەوە بانگی دەکرد: هۆهۆ خاتو ئامینە.. هەزار خاتو ئامینەی لـە دەم بـەردەبووەوە. ئامینەش نانی کەوتە رۆنەوە، رەنگ و بۆی ئافرەتانـەی بـۆ گەڕایـەوە، بـە دەنگێکـی ژنانـە وەڵامی دەدایەوە و دەیگوت: بەڵێ ئاغام ئەوا هاتم..

ئەم پیاوە دەسەپاچەیە، کە لە هەموو تەمەنیدا ئەوەندەی ئەو چەند مانگـەی کـە ئامینـە بووە هاوسەری خۆشی نەدیبوو و نەحەسابووەوە. رۆژێ لەرزوتا دەیگرێت و نەخۆش دەکـەوێت. ئامینەش وەکو ژنێکی دڵسۆز و بەوەفا بەدیارییەوە دادەنیشێت و خزمەتی دەکات، مەگەر بۆ ئاوهێنان جێیهێشتبایە و برۆیشتایە بۆ سەرکانی ژنان. رۆژێك لە رۆژەکـانی سـەرەتای زسـتان ئاغا لەرز دەیگرێت و ئامینەش ئاگرێکی بۆ دەکاتـەوە و دایدەپۆشـێت، ئینجـا مەنجەڵەکـەی هەڵدەگرێت و روودەکاتە کانی ژنان. لێرەش نەخۆشی تین بۆ مامە ئەولاّ دەهێنێت، کە وا رێك دەکەوێت مامە ئەولاّ لەناو ئێش و ئـازاری جەسـتەیدا پـل دەخـوات و لایـەك لـە لێفەکـەی دەکەوێتە سەر ئاگری کوانووەکە.. وردە وردە ئاگر گەش دەبێتەوە، تا بە تەواوەتی پێخەفەکەی گڕ دەگرێت، چڕە دووکەڵ لە کون و گوێسەبانەی ژوورەکـەوە دەردەچـێت، هاوسـێکانی مامـە ئەولاّ بۆنی بۆکرووز و سووتان دەکەن و دەبینن دووکەڵ لە ماڵی ئەو پیاوە کۆنە بەدبەختەوە لە دەرگا و کون و دەلاقەی ژوورەکەوە دێتە دەرەوە، دراوسێکان بەهەڵەداوان رادەکـەن و ئاگرەکـە دەکوژێننەوە بەڵام دوای چی؟ دوای ئەوەی مامـە ئـەولاّ جەسـتەی بـە تـەواوی دەسـووتێت و رۆحیشی وەکو پەپوولە باڵ دەگرێتەوە و بەرەو ئاسمان هەڵدەفڕێت.

خاتوو ئامینە بە مەنجەڵە ئاوی سەرشانەوە، ئاغرئاغر دێتەوە، کە لە ماڵ نزیك دەبێتـەوە ژنێکی تووش دەبێت و پێیدەڵێت: کچە هەی باوانتشێوی، پێهەلگرە ماڵەکەت ئاگری تێچوو و سووتا..

ئەویش لە حەپەتدا مەنجەڵە ئاوەکەی سەرشانی دەڕژێنێت و بەپەلە خۆی دەکاتـە ماڵـدا، کە تەماشا دەکات خەڵکێکی زۆر رژاونەتە حەوشەکەیان، دەپرسێت ئەوە چی رووی داوە؟ کـە حاڵی دەبێت سەروماڵی تیاچووە، دەس دەکاتە شیوەن و قژ رنینەوە، سنگ کوتـان و ئاغـاڕۆ، پاشان کە هێوری دەکەنەوە، رووی دەمی دەکاتە یەکێك لە پیاوەکان و دەڵێـت: ئێـستە دەزانم هەموو شتێکم لە دەستدا و ئاغام مردووە، دە توخوا بزانە (بوغ بوغەکەی) نەسووتاوە؟!

***

لە دوای سێ کچ خودا کوڕێکی بە دایکم بەخشی، ئیتر فریشتەی ئاسوودەیی باڵی بەسەر ماڵی باوکمدا کێشا. ئەگەرچی دایکم گرفتی بێشیریی بوو، من هەردەم لە برسییاندا دەمزریکاند، بۆیە ئەرکی بەخێوکردنم زۆرگران و سەخت بوو، دەبوایە دایکم ماڵە و ماڵی پێبکردایەم بۆ قومێ شیری مەمکی ئەم ژن و ئەو ژن. ڕۆژانەش سەرەڕای سەرقاڵی بە کاروباری ماڵە جووتیارێکی فرەمیوان و ئەرك قورس، دەبوایە کاتێکی زیاتری خۆی تەرخان بکردایە بۆ کوتانی شەکر و ڕازیانە تا شەوانە لە باتی شیر دەمی منی پێبنێتە یەك و بە قیژە و گریان خێزانەکەی خۆمان و هاوسێکانیش هەراسان نەکەم. سەرەڕای ئەو هەموو ماندووبوون و شەونخوونییە، کە لەنێو ماڵدا دەیکێشا خۆی بە ئافرەتێکی بەختەوەر دەزانی. سۆزەی فێنکی ئەو بەختەوەرییەش لەناو لانکەکەی منی نێرەوە هەڵی دەکرد، بەڵام هەر ئەوەندە خۆش بوو پێمگرت و زمانم پژا، ئیتر بووم بە پیاو، بۆیە باوەشی دایکم بەجێهێشت و چوومە باخەڵی باوکمەوە.. ئاخر کوڕ کوڕی باوکە و وجاخی ئەو ڕۆشن دەکاتەوە.

باوکم پیاوێکی ئیمانداری دەست و دەم و داوێنپاك بوو. شەوانە بەدەستی دەستنوێژەوە دەچووە سەر جێگای خەوتن و منیشی لە باوەشی خۆیدا دەخەواند و هەتا شل دەبووم و خەو دەیبردمەوە ئەو ئامۆژگاری دەکردم.. "کوڕم ئاقڵ بە، ئازاری هاوسێ و کەس و هاوڕێت مەدە، ڕێز لە پیاو و ئافرەتە پیرەکان بگرە تا ئەوانیش دوعای خێرت بۆ بکەن و ئەو میوانانەش کە لە دوورەوە دێن یەکەیەکە بەخێرهاتنیان بکە و دەستیان ماچ بکە ئەوساکە بچۆ لەلای دەرگاکەوە دابنیشە و گوێ بۆ قسەکانیان هەڵبخە، هیچ مەڵێ و هیچ مەپرسە..). ئینجا باسی مردن و گیانکێشان، سەلبی سەرەمەرگ و سزای قەبر، زیندووبوونەوە و حەشر و نەشر و بەهەشت و جەهەننەمی بۆ دەکردم. پاشان دەیگوت دەی ڕۆڵە گیان لە دوای دەمی منەوە بێژە: ئەستەخفیرەڵلاهی وەلحەمدولیلاهی وەلائیلاهە ئیلەڵلاهی.. دواتر بەدوای دەمی ئەودا ئایەتەلکورسیم دەخوێند و سێ جار بەدەوری ماڵدا فووم دەکرد، چونکە بە قسەی ئەو بەرەکەتی ئەو ئایەتە دەبێتە پەرژین بە دەوری ماڵدا و دزەکان کوێر دەکات. گورگیش بۆ ماڵی ئێمە ڕێ دەر ناکات و شەوارە دەکات، بەڵام دەبێت وریابم هیچ هەڵەنەکەم لە خوێندنەوەی ئەو ئایەتە پیرۆزانەدا، چونکە گۆکردنی یەك وشە بەهەڵە، دەبێتە هۆی کردنەوەی دەرگایەك لەنێو پەرژینە پۆڵاینە، کە خێر و بەرەکەتی ئەو ئایەتە بە دەوری ماڵدا دەیکێشێت، ئا لەوێوە دز و گورگ دێنە ژووری.

گەورەترین هیوا و ئاواتی باوکم ئەوە بوو، کە رۆژێ لە رۆژان بمبینێت، مەلایەکی دوانزە عیلم و ئیمام و وتاربێژی مزگەوتی ئاواییەکەی خۆمان بوومایە. لە کاتی سەرەمەرگیشیاندا سووورەتی (یاسین) بۆ خۆی و دایکم بخوێنم، هەر ئەو ئاواتە بوو پاڵی پێوەنا تا لە تەمەنی پێنجساڵیدا بمخاتە بەر خوێندن لە حوجرەدا.

لە حوجرەدا دەستم کرد بە خوێندنی جزمەکانی قورعان و وردە کتێبەکانم تەواوکرد، کە قورئانم خەتم کرد و دەستم دایە خوێندنی کتێبی (ئیزهار و کافی) ئیتر بەشێك لەئەو ئاواتەی باوکم هاتە دی، بەڵام پێچەوانەی حەزێکی تری ئەو، کە دەیویست کەسێکی هێمن و سەلار و خاکیی بم، من منداڵێکی لاساری چەتوون و بزێوم لێدەرچوو، زۆربەی ئەو سەرچڵی و کەتنانەی کە دەمکرد بەئەو نەدەگەیشت، ئەگینا سزای قورسی دەدام، لە ماڵیشەوە کە تووڕە دەبوو دەستی بەرز دەکردەوە، کەس پرکێشیی نەدەکرد دەستی بگرێت.

جارێك لە جارەکان جوێنێکی ناشیرینم ئاڕاستەی خوشکە بچووکەکەم کرد و ئەویش گوێی لێبوو، بۆیە پەلکێشی کردم بۆ ناو دیوەخانەکە تا توانی بە چەپۆك و شەپازلە لێیدام، بەڵام تەسکینی نەهات، ئینجا بەهەر دوو دەستی لێینەویم و بەرزمی کردەوە بۆ سەر سەری و کێشامی بە زەوییەکەدا، من یەکەمین کوتانە زەوییم ئاگا لێبوو، ئیتر بوورامەوە، نازانم ماوەی چەندێ لە هۆش خۆم چووم، کە بە ئاگاهاتم روانیم یەك تەشت خوێناو لەبەر لووتمدا دانراوە و (کاك فەتاح میمکە وەنەوش) کە دایکم هانای بۆ بردبوو تا بێت دەستی باوکم بگرێت، بەسەرمەوە راوەستاوە و باوکیشم پاڵی داوەتە دیوارەکەوە و خەریکی جگەرە کێشانە..



## ( ٨ )

بەهەمان کۆلاندا ماڵی مامە ئەولا بازوو بە جێبهێڵە و بچۆرە خوارەوە، هەر بە دەستی چەپدا ئەوە ماڵی (وەستا رحیم)ە. وەستا رەحیم یەکێك بوو لەو چەند بنەماڵەیەی ئاواییەکەمان کە خەریکی چنینی کلاشی هەورامی و دروستکردنی جاشکەوش بوون. (مامە مەلا)م ریزی زۆری لێدەگرتن و پێیدەگوتن: منداڵەکانی خۆمانیان بە (هۆستاگەل) ناوی دەبردن.. کورە گەورەی هۆستا رەحیم ساڵێك وەرزێری ماڵی ئێمە بوو باوکم لە خۆشەویستیدا پێیدەگوت (حەمە گێل). منیش بە دوای دەمی ئەودا پێمدەگوت: حەمە گوێ لوول، بەڵام من گێل و نەفام بووم نەك حەمەی هۆستا رەحیم، بۆیە چووم ئەو بێنەقلییەم دەربارەی ماڵی هۆستا رەحیم کرد و ئۆینێکم نایەوە، کەتن بوو کردم کەتن.. ئەو رۆژە لە ماڵ دەرچووم و نزیك ماڵی وەستا رەحیم بوومەوە، بەردەلاستیکەکەم گرت بە دەستمەوە و شۆڕبوومەوە لەئەو دەلاقانەوە، کە دیانڕوانییە سەرکۆلانەکەدا، ئەو کوونە باچانەی کە بە زستان سواخ دەدران و بە هاوینان بۆ ئەوەی ژوورەکە بای شەماڵ بیگرێتەوە دەکرانەوە، ئالەوێوە سەرم نا بە کونێکەوە و تەماشام کرد ماڵی وەستا خەریکی چا خواردنەوەن. حەزێکی نەفامانە دەستی راکێشام بۆ ناو باخەڵی کراسەکەم، خڕە بەردێکم دەرهێنا و خستمە ناو کەفی بەردەلاستیکەکەوە، نیشانم لە پیاڵەیێك گرت و دەستم بۆی راکێشا، کاتێکم زانی پیاڵا هەپڕوون هەپڕوون بوو، پاشان تێمقووچاند بۆ مزگەوتەکە و خۆم کردە بەرهەیوانەکەدا و بەبێڕاوەستان دەستم برد (جوزئی عەمە)م هێنا و وەکو فەقێیەکی ژیر و سەلار رووەو قیبلە دانیشتم و دەستم کرد بە دەورکردنەوەی. زۆری پێنەچوو کاتێکم زانی زرمەیەکی بەهێز لە تەوقی سەرمەوەهات و بەرچاوم لێڵ بوو، پیاکێشانەکە ئەوەندە کاریگەر بوو بە ئاستەم توانیم بەلای راستدا لابکەمەوە لەگەڵ ئەو نەختە لاکردنەوەدا لەئەو سەری هەیوانە درێژەکەوە کە لێیدانشتبووم هالاوێکی گەرم بەرەو رووم هات، پاشان بوو بە شالاوی ئاگرێکی سووری تۆقێنەر و لەئەم سەری هەیوانەکەوە پەنکی خواردەوە و بوورامەوە، کە هاتمە هۆش خۆمدا روانیم سەر و سینە و بەرۆکم خەڵتانی خوێن بووە، نازانم چۆن بوو (رابە) ئەو کچە چاونەترسەی (وەستا رەحیم) زانیبووی من ئەو کەتنەم کردووە،

بۆیە بۆ تۆڵەسەندنەوەی ئەو دەسدرێژییە بە دوامدا هاتووە، خەرە بەردێکی بە قەد هێلکەیەکی مریشك گەورەی کێشاوەتە سەرمدا و خۆم ئاسا ئەویش بە جوانی نیشانی خۆی پێکاوە و بە شێنەیی گەڕاوەتەوە ماڵ.

دایکم بۆ سەرزەنشتکردنی (رابە) چووە ماڵی وەستا رەحیم، کەچی ئەو پیاوە خانەدانە داوای لێبووردنی لە دایکم کردبوو، وتبووی: رابە دەکەمە قوربان سەعید، بۆ رابە نازانیٚ ئێمە و ئێوە خۆشەویستی یەکترین، ئێمە خۆمان بەبرا بچووك و خزمەتکاری مامە مەلا ئەولقادر و لالە حەمە عەزیز دەزانین.. ئینجا دایکم بە لێبووردنەوە گەڕایەوە بۆ ماڵ.

لە ماڵی وەستا رەحیمەوە چەند شەقاوێك بەلای راستدا بەرەو خوار بڕۆ ئەوە ماڵی (مەجە گلاڵیی)یە.. میمکە مەجە ئافرەتێکی سووکەڵەی سوور و سپی چاو شین بوو. ئەم ئافرەتە هەردەم کراسێکی شینی لەبەر دەکرد، وەکو پیاوەکانی ئاوایی سەری پاك بە مووس دەتاشی. هەرکاتێك نۆبەی سەرتاشینەکەی بهاتایە یان لە رێگای کانی چاوەڕوانی دایکمی دەکرد یان دەهاتە نزیك ماڵ و بانگی دەکرد، دەیگوت: هۆهۆ رەعنا.. خوشکە رەعنا ئەوە من بەرتاش (مووس)ەکەم هاوردووە، دەتۆش مێکوتەکە (مەکینە)ی حەمە فەرەج بێرە، سەری ئەم خوێشکەی خۆت بتاشە.. دایکیشم دەچوو سەری بە ئاو و سابوون دەخووساند و بۆی دەتاشی..

ئەم ژنە شەو و رۆژ لەبەر خۆییەوە قسەی دەکرد و دەیبۆلاند. خەڵکی ئاوایی دەیانگوت ماڵەکەی پڕە لە جنۆکە و هاڵ و شەوە، بۆیە بەردەوام بیگرە و بەردە و شەڕیەتی لەگەڵیاندا.

(دەرویش عەلی) کوڕی میمکەمەجە، پیاوێکی سوور و سپی بالآبەرزی چاوشین و شێتۆکە بوو، کە حاڵی لێدەهات دەیدایە گریان و گوڕاڵکە تاڵەی وەك بەڕوولە خەیار دادەکرماند. رۆژیٚ ژنە جوان و میهرەبانەکەی مرد و دوو کچی بە ناوی ئامینە و مەلیعەی لە پاش بەجێما. ئەم باوکە هەردوو کەنیشکەکەی ئەوەندەی یەك دونیا خۆش دەویست. ئەو هەردەم کچە بچکۆلە ٥- ٦ ساڵانەکەی بە دەنگی بەرز بانگ دەکرد و دەیگوت: مەلە.. مەلە.. هۆهۆ قیقی داوداوەکەم مەلەگیان بیٚ بۆ لای باوکت.. مەلەش بە راکردن بەرەو رووی دەچوو، ئەویش لە دوورەوە باوەشی بۆ دەکردەوە و دەینوساند بە سنگییەوە، ئینجا وەك شەمامە بۆنی پێوە دەکرد و دەیگوت: ئۆخەی مەلەگیان باوکەکەم ئۆخەی قیقی داوداوەکەم..

(عەلە مەجە) یەك دوو ساڵێك بەئەم شێوەیە ژیانی بردە سەر، بەڵام کە ئامینەی کچی توولەك بوو، تەمەنی گەشتە ١٢- ١٣ ساڵ ئیتر ئاڵۆشی تێچوو و بەڕاست و چەپدا چاوی بۆ یەکێك دەگێڕا ژن بە ژنی لەگەڵدا بکات تا بۆی رێککەوت، (خەلیل برایم زارك)ی دۆزییەوە و گەورە و بچووکی لەگەڵدا کرد.

دەرویش ژنی خۆی گواستەوە و خەلیلیش دەبوایە سێ سەد و شەست رۆژ بژمێرێت تا ئامینەی شۆخوشەنگ بکاتە هاوسەری خۆی.

خەلیل لاوێکی کورتەباڵای گەنمڕەنگی چاوڕەشی سمێڵ قوتی وریا و زێتەڵە بوو، چونکە ئاوایییەکەیان هاوسنووری دێ عارەبەکانی نزیك چیای حەمرین بوو، زمانی عارەبی بە چاکیی دەزانی و زۆربەی کاتی لە بەغدا بە کرێکاری بەسەر دەبرد. باوکیشی پیاوێکی دەمڕاست و ناسراو و دیوەخاندار بوو، ئەم ژینگەیە خەلیلی کردبوو بە پیاوێکی قسەزان و بوێر و چاوکراوە، بۆیە بە هەڵسوکەوتی ژیرانەی خۆی پاش یەك دوو مانگێك دوای گواستنەوەی خوشکەکەی، ئامینەی مارەبڕی لە خشتە برد و تەنگی بە دەروێش هەڵچنی تا بووکی بداتە دەست و بیگوازێتەوە، بۆ ئەم بابەتەش خوشکەکەی پاڵپشت و یاریدەدەرێکی سەرسەختی بوو، بەڵام دەروێش کە حاڵی بوو لە ئەم کەین و بەینە و بۆی دەرکەوت ئەم داوەی کە بۆی نراوەتەوە سەرێکی ها بە دەستی زاواکەیەوە و ئەو سەرکەیشی ها بە دەست ژنەکەیەوە و کچە توولەکەکەیشی حەز دەکات ملی پێوە ببێ، ئەوەندەی تر شێت و دەهری دەبوو، هەر بۆیە دەستی دەکردە گریان و پەلاماری ژنەکەی دەدا. ئەو قەت نەیدەزانی وەك پیاوە کوتەك وەشینەکانی ئاوایی بکات بە دارێکدا و ژنەکەی دارکاری بکات، هەرکاتێك تووڕە ببوایە پەلاماری دەدا و بە قەپ شانومل و مەچەکی شین و مۆر دەکردەوە، دەیگوت: ئاخر پیزە خوا بەرداری نییە، ئەو کەنیشکە مندالە، هێشتا خێر و شەڕی خۆی نازانێت و لێکیان جیاناکاتەوە.

ئەم شەڕ و ئاژاوە و بیگرە و بەردەیە چەند مانگێك درێژەی کێشا، بەڵام خەلیل کوڵی نەدا تا حاڵ گەیشتە شکاتکردن لەلای (مەلا سابیری سەڵتەزەرد)، کە ئەوکاتە کادیری پارتی بوو لە ناوچەکەدا، شکات و شکاتکاری و ناوبژیوانیش چەند مانگێکی خایاند تا دەرویش عەلی بە ناچاریی چۆکی دادا و کچەکەیان لە ژێر دەستی دەرهێنا.

کە خزم و کەسی زاوا هاتن بۆ گواستنەوەی بووك، ئەم پیاوە چاوی بەرایی نەدا لە حەوشەشدا بمێنێتەوە، ئەو رۆژە کراسێکی عارەبی چڵکن و شۆڕی بەرۆك دادڕاوی لەبەر

کردبوو، پشتوێنێکی پەڕۆی لە پشت بەستبوو، بە باوکە ڕۆ و (خلە) ڕۆ، کە زاواکەی بوو، دەرچووە دەرەوە و بەسەر سرکەوانەکەی پێش ماڵی خۆیانەوە دەستی چەپی کردبووە ژێر پشتوێنەکەیدا و بە دەستی ڕاستی دەیکێشا بەسەریدا. ئەم کابرایە ئەوە حاڵی بوو تا بووکیان لە ماڵ دەرکرد. کەلای کردەوە و چاوی بە کچەکەی کەوت، ئەو کەنیشکەی کە دەتگوت خونچەگوڵە و تازە پشکوتووە، دەروێش بانگی لێبەرز بووەوە بە دەم گریانەوە وتی: بڕۆ نامەگیان بڕۆ.. باخلە بتبات بزانم چیت لێدەکات؟ ئەو مەبەستی ئەوە بوو بڵێت: تۆی منداڵ و بێ دایك و باوك لە ئەو غەریبییەدا هەڵناکەیت و ماڵداریت پێناکرێت..

باوکم ڕووی دەمی لە دەرویش کرد و وتی: عەلە.. عەلە چی لێدەکات؟ تۆ چیت کرد لە (پیزە)ی خوشکی ئەو، ئەویش وا لە (نامە)ی کچت دەکات، لێیمەترسە عەلە، ئەو کەنیشکە لە تۆ زۆر ژیر و ئاقڵترە..



چەم و کەندرێکی باریك ناوایی کانیماران بە درێژی دەکات بە دوو بەشەوە. مزگەوت و کانی ژنان و شەش حەوت ماڵێك دەکەونە دەستی ئەوبەرەوە. لە یادی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژدا، کە زۆربەی گوندنشینەکان بە (ساڵی چەپڵەکە) ناوزەدیان کردبوو، بەئەو بۆنەیەوە خەڵکی ناوایی لە حەوشەی مزگەوتەکەدا کۆبوونەوە و ئاهەنگیان گێڕا.

(ئەولقادر بارام)ی کوتاڵفرۆش یەکێك بوو لە شیوعییە سەرسەختەکانی ئەو دەمەی کانیماران و ئەو ڕۆژە هەڵسوڕێنەری سەرەکی ئاهەنگەکە بوو. بۆیە هەرچی پارچە قوماشی ژنانە لە دووکانەکەیدا هەبوو هەر هەمووی هێنا و دار و دیواری حەوشەی مزگەوتی پێڕازاندەوە، ئینجا وەکو دیکۆریستێکی کارامە پارچەکانی جێگۆڕکێ پێکرد و وێنەیەکی بچکۆلانەی سەرەك وەزیرانی یەکێتی سۆڤیەت (خرۆشۆف)ی لەبەر باخەڵ دەرهێنا، بە دەرزییەکی سنگپۆش بە پارچە قوماشێکی سوورەوە هەڵیواسی، لە ناو حەوشەی مزگەوتەکەدا کوڕوکاڵ دەستیان گرت و هەڵپەڕکێ گەرم بوو. ئەولقادر سەرچۆپی گرت، گەزێك پارچەی سووری گرتە دەستەوە و وەکو دەسەسڕ بایدا. ئەم کوڕە هەرزەکارێکی بالآبەرز و قووچی ددان گڕبوو، بە بەڵێنە چەور و حازر بە دەستەکانی حیزبی شیوعی عیراق گەزگەز باڵای دەکرد و بەدەم هەڵپەڕکێوە پێدەکەنی، بەلآم پێکەنینێکی بێدەنگ، کە تەماشات دەکرد واتدەزانی تەماشای وێنەیەکی فۆتۆگراف دەکەیت، منداڵەکانیش بە دوای یەکدا بە دەور مزگەوتەکەدا دەسووڕانەوە. (محەی کەریم دوو فلس) کە (حەمە)ی برا گەورەی شیوعی بوو لە پێشیانەوە دەڕۆیشت و دژ بە ئاغا و دەرەبەگ دروشمی دەووتەوە و منداڵەکانیش لە دووی دەمی ئەوەوە دووبارەیان دەکردەوە. ئەودەمە یەکێك لە (مەلا) شیوعییەکانی ئەو گەرمیانە لە کۆڕێکی جەماوەریدا وتبووی: هاوڕێیان خوشکان برایان، ئیتر بەسە ئەو ڕۆژە ڕۆیشت ئاغا و دەرەبەگ و زۆردار رەنجی هێز و بازوومان بخۆن و ئێمەش لە برسانا بمرین، بۆ رەوا نەبێت بۆ من، کە دوانزە سیانزە ساڵ دارێك خزمەت دەکەم، ئاوی ئەدەم و پاچە کۆڵەی دەکەم، ئاخر بۆ بەرەکەی بۆ من حەرام بێت، کە خاوەنی شەرعیم، بەلآم زاڵمێکی زۆردار بێت و بەروبوومەکەیم لێزەوت بکات و بیخوات، کەچی بەپێی شەرع و ئیسلام بۆ ئەو حەلآڵ بێت و کەسێك زات نەکات پێیبڵێت تۆ

گوناحێکی گەورە دەکەیت؟ ئەو لەئەم حەلاڵ و حەرامەدا رێك مەبەستی بەروبوومی کشتوکاڵی بوو، کە بەر لە شۆڕش ئاغا و بەگزادەکان بەشێکیان بۆ خۆیان حەلاڵ کردبوو.

نەیارەکانی حیزبی شیوعی ئاخاوتنی مەلایان بۆ قازانجی خۆیان ئاوەژوو کردەوە و دەیانگوت: ئاخر ئێمە نەمانگوت شیوعییەکان کافرن و خودا ناناسن، ئەمانەلامەزوە و رووسن رووس.. ئەوەتا ئەو مەلا شیوعییە وتوویەتی: من دوانزە سیانزە ساڵە ئەو کەنیشکەی خۆم بەخێودەکەم ئاخر بۆچی لەمن حەرام بێت و نەتوانم لە خۆمی مارە بکەم، بەڵام بۆ کابرایەکی بێگانە حەلاڵ بێت.. ئەم شیوعییانە جیاوازی لە نێوان ژن و خوشك و دایکی خۆیاندا ناکەن..

باوکم ئەم قسەیەی بۆ دایکم گێرایەوە، دایکم وتی: وەخ وەخ رۆڵە ئاخر زەمانە ئاخر زەمان.. کورە تۆ بێژیت مەلا قسەی وای کردبێت؟

- ئافرەت دەینی وەملی ئەو کەسە، کە بۆی گێرامەوە..

+ توخوا وسبە پیاوەکە وسبە.. قسەی وا مەکە گوناحە گوناح..

- جا ئافرەت خۆ نەقڵی کفر کفر نییە، گوناحی وەمل ئەو کەسەی کە بۆی گێرامەوە..

هەڵپەڕکێ و هوتافکێشان لە حەوشە و دەرەوەی حەوشەی مزگەوتدا گەرم بوو، چەند ئافرەتێك بەسەر سەرکەوانەکەی پێش ماڵی عەلە مەجەوە، کە دەیڕوانییە ناوحەوشەی مزگەوتەکەدا راوەستابوون و دەیانڕوانی، پۆل پۆل لە ماڵەکانی ئەمبەری چەمەوە ئافرەتان بۆ تەماشاکردنی ئەم شایی و بەزمە دەچوونە سەرکانی، بەپەلە ناویان پڕدەکرد و دەگەڕانەوە و نزیك بە مزگەوتەکە هەڵوەستەیەکیان دەکرد.

(مەلیحە) کچە شۆخ و نازدارەکەی دایکی، کە بە (مەلە) بانگ دەکرا، بەئەو بەرزاییەوە دەیڕوانی. (مەلە) ناوێکە لەئەو ناوە کورتکراوانەی کە بەلای منەوە لە ناوە راستەقینەکەی خۆی گەلێ جوانتر و شیرنترە. وادیاربوو دایکی بانگێکی سەرزەنشتاوی کرد، بۆیە ئەویش بە دەنگێکی فێنك، وەك سۆزەی ئەو شنە بایەی کە دەمەومەغریبی بەهاران هەڵیدەکرد بەناو قەفی گەنم و جۆ و بەسەر گیاوگوڵ و بەناو پرچی بنچکە بۆندارەکاندا دەهات و پڕ دەشتێك عەتری گوڵە شەوبۆکانی ئەودیوی دەهێنا لەبەردەم ریزە ماڵەکەی ئەو قەدپاڵەدا هەڵیدەڕشت، ئاوەها بەدەم زەردەخەنەیەکی پڕ خۆشەویستی و بەکەمێك نازەوە وەردەچەرخا، بەسەربانەکەدا رەوتە پۆڕیکی دەکرد و دەیگوت:

+ دایە گیان.. ئەو براتە چەنێ خۆشەویستە لە دڵتا، هاها توو گیانی ئەو براتە لێمگەڕێ با نەختێ تر سەیر بکەم.. دە عەیبی چییە؟ وەی، یەژی تەنیا ئەم دایکی منە کەنیشکی عازەوی هەیە..

ئینجا بۆ ناو حەوشەکە سەرێکی دادەنواند، یەك دوو چپەی دەکرد و قاقا پێدەکەنی، پاشان دەهاتەوە شوێنەکەی خۆی و دەیڕوانی..

من ئێستە لە ئەو (مەلە) دەڕوانم کە سینە و بەرۆکی بەرەولای من هەڵکێشاوە و کەوتۆتە ئەوپەڕی دونیاوە، سینە و بەرۆکی شوێن خەرمانی گوڵە و کۆترەکانی ماڵی خودا چینەی تیادا دەکەن. من لەئەو (مەلە) دەڕوانم، لە باڵندەیەکی سرك و بزێو و ئێسك سووك، لاشە توندوتۆڵ و گوشتنەکەی کە بە پەڕی رەنگاوڕەنگی ئاونگ لێنشتوو داپۆشراوە و لەبەر تیشکی رۆژدا ورینجەی دێ.

(مەلە) یەك باوەش رەنگی سروشت جیوەییە و هەر دەڵێیت نمایشکارێکی کارامەی جلوبەرگە و بە سەربانەکەدا دێت و دەچێت و نیگای تیر ئامێز دەهاوێت.

من بەسەر ستاندی قاچەکانەوە کامیرای چاوم دابەستووە و وێنەی جوولە و لەرەی جەستەی تۆمار دەکەم. ئەو کچێکی تەمەن ١٥- ١٦ساڵەی کەمێك گۆشتنە. بەژن و باڵای هەر دەڵێیت بڕنەوێکی وەسەتی دار شوشەیە، کە بە دیققەتەوە لێیدەڕوانیت تەنیا چەند بەرز و نزمییەکی ئەندازەییت بەرچاو دەکەوێ. سینگی بەرز و دوو مەمکی وێنەی دوو قۆری فەخفووری چای، برۆ رەشە نیوبازنەییەکانی، کە دەڵێیت قەڵەمی دەستی ئارایشکارێکی کارامە کێشاویەتی، برژانگەکانی.. یەك دوو پێنج دە.. بەبێ خۆماندووکردن بیانژمێرە، ئەگەر تۆ خورمایەکی عەشرەسی پێشکەش بکەیت و بەختت یاربێ و لێتوەربگرێت، ئەوا دەبێت بیکات بە دوو لەتەوە، ئەوساکە لە دەمی بنێت.

ئەمڕۆ کەڵەبادەمێکی تەڕم هێنا و لەسەر درێژی بە چەقۆیەکی تیژ کردم بە دوو لەتەوە و نزیك بە یەك هەردوو لەتەکەم لە پێش دەمی خۆمدا دانا، هەر کەرتێکی یەك دەنك ترێی رەشمیریم هۆستایانە خستە سەری، کەمێك دوور کەوتمەوە و تێمڕوانین، ئەو دوولەتە کەڵەبادەمە، کە بە دوو دەنکە ترێی رەش متووربەم کردن، رێك دوو چاوی ئەو کەنیشکە کوردە لادێیە بوون و منی تەماشاکەری بۆ لای خۆی پەلکێش دەکرد و لەئەو بەزم و ئاهەنگەی دەڕوانی.

(محەی کەریم دووفلس) مندالّەکانی ئاوایی ڕێکخستووە و ئێستە ئەوان دەزانن (مەلیك) کوژراوە. (نوری سەعید)یش کە دەسگیریان کرد، عابایەکی ڕەشی ژنانەی داوە بە سەریدا و پاشان کوشتیان. (عەبدولکەریم قاسم)یش چووەتە جێگاکەی مەلیك و لە بەغدا لەسەر تەخت دانیشتووە. هەر ئەویش قەول و بەڵێنی بە جووتیارەکان داوە، کە لەمەوپاش ببن بە خاوەن زەوی و زاری خۆیان و ئیتر تاپۆ بە ئاغا و شێخ و بەگزادەکانی جاف نەدەن، بۆیە بە ئەوپەڕی دڵخۆشییەوە بە دوای (محە)دا دەڕۆیشتن و هوتاف و دروشمەکانیان بە دوای دەمی ئەودا دووبارە دەکردەوە:

با بژی عەڤدولکەریم قاسم.. با بژی..با بژی..

ئاوایی هی خۆمانە، با لێیدەرچێ بێگانە..

من لەئەو کاتەدا خۆپێشاندان و ڕێپێوانە جەماوەرییەکەی شاری کفریم دەهاتەوە پێش چاو، کە (عەلەمحە)ی دەستوپل ئەستووری حەماڵ، پەتە ئەستوورەکەی سەرشانی، کە باری کۆڵی خۆی پێشەتەك دەدا، کردبووە مل و بە پێش شەپۆلی خەڵکەکەدا دەهات و دەچوو، پڕ بە گەرووی هاواری دەکرد و دەیگوت:

(ئەوانەی کە خائین و ملکەچن لە دەس پەتەکەی عەلەمحە بۆ کوێ دەرنەچن؟). ئەو مەبەستی بوو بڵێت: خائین و ملکەچەکان بەئەم پەتەی دەستم لەسێدارە دەدەم و هەڵیان دەواسم..

محەی کەریم دوو فلس ئەوەنە هوتافی کێشا و قیڕاندی خەریك بوو دەنگی دادەنووسا. ئاهەنگگێڕانیش لە حەوشەی مزگەوتدا ماندوو و شەکەت بوون بۆیە یەك یەك و دوو دوو دەکشانەوە و لە حەوزە ئاوەکەی مزگەوتدا دەس و دەمیان دەشۆشت و بەرەوماڵ دەبوونەوە. (مەلە) خۆی لەسەربانەکەوە شۆڕکردەوە بۆ سەر تەنووربانەکە و لەچاو ون بوو.

دوایین کەس کە حەوشەی مزگەوتەکەی بەجێهێشت (ئەولّقادر بارام) بوو، بە کۆڵێك کوتاڵی لۆچ لۆچی تۆزاوییەوە بەسەر قیرتاوی خەیاڵی شیوعییانەدا ئۆتۆمبیلەکەی بەرەو ماڵ لێدەخوڕی.

***

## (١٠)

"ئەمر هەر خودایە. حەزرەتی نوح هەشت سەد ساڵ تەمەنی کرد، ئاخری خودا عومری ئامانەتی لێوەرگرتەوە. مردن براگەورەیە و سەر بە ماڵی هەمووماندا دەکات. منداڵی نابالّق بە دایك هەتیو دەکەوێت."

ئەم قسە راست و رەوایانە بۆ ئەوە دەکرا هەتا (مردن) بکرێت بە دیاردەیەکی ئاسایی و قەبوولکردنی ئاسان بێت، بەڵام منی منداڵ کە دایکم نەخۆش دەکەوت ئیتر سەری دونیام لێدەهاتەوە یەك، وامدەزانی ئەم دێیەی ئێمە تەنیا یەك ئافرەتی تیادایە، ئەویش دایکی منە و ئێستە نەخۆشە، خوانەکەردان ئەگەر بمرێت من چ بکەم؟

ئەی ئەوە نییە دەڵێن: منداڵی نابالّق بە مردنی دایکی هەتیو دەکەوێت! واتا ئەگەر دایکم بمرێت منیش هەتیو دەکەوم.



پاش کۆتایی دەوام لە فەرمانگە گەڕامەوە ماڵ و منداڵەکان پێیانوتم: مامە ئیدریس هاتە ماڵ و وتی (نەنە) نەخۆشە با کاکم زوو بێت بۆ لای..

من دەمزانی مەرگی دایکم نزیکە و لە ئانوساتدایە، چونکە تەمەنی خۆی لە قەرەی هەشتا ساڵ دەدات و نەخۆشییە کوشندەکەشی وایلێدەکات مردنی کوتوپڕ بێت، بۆیە هەموو رۆژێك یان رۆژ نا رۆژێك سەردانیم دەکرد، بەڵام وادیارە ئێستە تەندروستی خراپە بۆیە ئیدریس بەهەڵەداوان هاتۆتە ماڵ.

بەپەلە پرووزە تیکەیەك نانم خوارد و لە ماڵ دەرچووم. لەگەڵ هاوێشتنی یەکەم هەنگاودا گەیشتمە ژوورسەری و دانیشتم. دەستم برد سەریم بەرزکردەوە و خستمە

سەر رانم. ئەو زمانی شکابوو، لە قسە کردن کەوتبوو، یەك دوو جار بە دەنگێکی نزم بانگم کرد: دایە.. دایە گیان، بەلاّم بۆ دواجار چاوی هەلّهێنا و ئیتر لێکی نەنا و رۆحی سپارد.. من وەکو پیاوێکی جەرگ قایم و بە غیرەت هیچ خۆمم تێك نەدا. گورج دەست و دەم و چاویم نایە یەك. هەتا (ئامینە)ی خوشکم کفنەکەی بۆ بڕی (ئەو کفنەی کە بیست و دوو ساڵە باوکم بە پارەی حەلاّلی خۆی بۆی کڕیوە و ئەمیش لەناو بوخچەکەیدا پاراستوویەتی!) لە مزگەوتی گەڕەکەکەمان تەتەشۆرێکم هێنایە ماڵ. جەنازەکەیان پاش شۆردن، کفن و دفن کرد..

من پێچەوانەی ئاوارەکانی شەڕی ناوخۆ، کە لە شاری هەولێر دانیشتوون، لە چوار پێنج کەسێکی نزیك بە خۆم بەولاوە خەڵکی ترم لە مەرگی دایکم ئاگادار نەکردەوە. هەر زوو ئەو ئۆتۆمبیلەی کە دەستنیشانمان کردبوو هێنامان، تەرمەکەمان بەسەر چەنچەکەوە بە حەبلێکی ئەستوور شەتەکدا و هەتا سنووری دوو دەوڵەتە کوردییەکەمان (دێگەڵە) بەڕێمان خست. پاشان خۆم بە پەلە گەڕامەوە ماڵ و بە تەلەفۆن خزمانی کفری و کەلارم ئاگادارکردەوە هەتا قەبری بۆ ئامادە بکەن. بەیانیش بۆ ماوەی تەنیا دوو رۆژ پرسەم بۆ ئەودایکە خێرلەخۆ نەدیوە دانا و هەموو شتێك کۆتایی پێهات..

چونکە ئەوەندە بیرم لە مردنی دایکم کردبووەوە، لە رووی دەروونییەوە خۆم دابوو بەدەست ئەو واقیعەوە، کە تێیدەکەوم، بۆیە نەخشەم دانابوو ئەو رۆژە، کە دایکم دەمرێت چی و چۆن بکەم و لاسایی خەڵکە ئاوارەکە نەکەمەوە، کە کەسێکیان دەمرد ئیتر بە تەلەفۆن و ناردن بەدوای ئەم و ئەودا خەڵکێکی زۆر و بەرپرسەکانیان تێدەگەیاند. کاتێکت دەزانی دەیان ئۆتۆمبیل و سەدان کەس لە بەرماڵی کابرای ئاوارەی کۆسکەوتوودا گلێر دەبوونەوە، زۆریان رووگیر و بڕێکیان ماستاوچی و ئەوانی تریان ئیتر خۆت بیری لێبکەرەوە و بزانە بۆ چی دەهاتن.. ئۆتۆمبیل بەدووی جەنازەوە لووتی دەخستە سەر قوونی ئەوی تر و تا سنووری دێگەڵە دەهاتن، لەوێ خەڵکەکە گرد دەبوونەوە و بەرپرسێك دەیکردە سەر بەرزاییەکدا و دەهات بەشان و باڵی مردووەکە و خاوەنەکەیدا.. "ئەم خوالێخۆشبووە برای، باوکی، خوشکی، دایکی.. قارەمان و پێشمەرگەی بەوەفای رێبازی کوردایەتییە و پرسەکەی لە مزگەوتی سپییە"..

من دەمزانی، ئەو کەسانەی بیروبۆچوونم نازانن چاوەڕوانن منیش ڕێك وەك ئەوانەی پێشووی خۆم بکەم، ئەگەرچی لەسەرم کەوت، بەلاّم بڕیارم دابوو وانەکەم!! ئیتر ئەو ڕۆژە ئەمڕۆ بێت یان سبەی..

کە گەیشتمە سەر کۆلاّنەکە و ڕوانیم پێش دەرگای مالّی ئیدریس خەلّکی لێکۆنەبووەتەوە، بۆیە کەمێك هێور بوومەوە. گەیشتمە بەر دەرگای ژوورەکە و ڕوانیم دایکم لەسەرلا ڕاکشاوە و قاچەکانی گورج کردووەتەوە. هەردوو ئەژنۆی لە سینگی توندکردووە و لەگەلّ میکرۆبە نەگریسەکانی ناو گەدە و ڕیخۆلّەکانیدا ململانێیەتی. بە تەنیشتییەوە دانیشتم و لەپی ڕاستیم خستە نێو لەپەوە. دەمم نایە سەر دەستە ڕەق و وشکەکەی و ماچێکی قوولّم کرد. دەستوپل و جەستەی، خۆی واتەنی: تەنیا پێشەکەی ماوە و تەتوا لەپێ کەوتووە.. بۆیە ئیدریس هەر وەکو مندالّ دەگرێتە باوەشەوە و دەشت و دەری پێدەکات.. دەمم خستە سەر ڕوومەتە چرچ و لۆچەکەی، نەختێ بۆنم پێوە کرد و پێموت:

+ دایە گیان.. دایە چۆنیت؟

چاوی بە عاستەم هەلّبڕی و وتی:

- کوڕەکەم وابزانم ئەمجارە دەمرم..

وتم :

+ نە دایە گیان.. ئیشەللاّ نامریت.

- دۆعای خێرم بۆ بکە کوڕە شیرینەکەم قەزاوەگێڕتبم.. دۆعام بۆ بکە تا لەمە زیاتر زەلیلی سەر جێگا نەبم و خودا عومری ئامانەتم لێوەربگرێتەوە.. هەشتا زۆرە کوڕەکەم..

من لێمپرسی:

- کوێت دێشێ؟

وتی:

+ (عازای عەنامم) ڕیخۆلّەکانم خەریکە دەبچڕێت، دەڕشێمەوە..

ئەو لەهەمموو تەمەنیدا دوو جار سەردانی پزیشکی کردووە، ئێستە هەرگیز ڕازی نابێت بەئەم حالّەوە بیبەم بۆ نەخۆشخانە و لەوێ بۆ چارەسەرکردن بیخەوێنم، چونکە خۆی دەلّێت: ئەمجارە نەخۆشی مەرگمە و ڕۆح دەرناکەم.. بۆیە بەناچاری پەنامان برد

بۆ ئەو برینپێچەی کە لە گەڕەکەکەدا دووکانێکی دەرمانفرۆشی دانابوو. هات و ئەخۆشییەکەی دەستنیشان کرد، کانوولەیەکی لە مەچەکی بەست و ئاو و دەرمانمان لە ماڵەوە بۆ هەڵواسیی، پاش چەند کاتژمێرێك هۆشی هاتەوە و ئازارەکەی رووی لە کەمی کرد. قاچەکانی هەڵکێشا و رووەو دەرگای ژوورەکە پاڵی دا بە دیوارەکەوە. شووشە ئاوەکە وەکو گلۆڵە بەنەکە بە ژوور سەریەوە هەڵواسرابوو، ئاوبەرە لاستیکەکەش وەکو بەنی سەر گلۆڵەکە شۆڕ ببووەوە بۆ ناو دەستی.. من لە دەم دەرگاکەدا راوەستابووم و زۆر بە وردیی تێمدەڕوانی.

دایکم ئێستە قاچی چەپی هەڵکێشاوە. قاچی راستیشی بۆ پێش خۆی راکێشاوە و خەریکی تەشی رستنە، کە روانیم زانیم وڕك گرتەنەکەم هەراسانی کردووە و خەریکە رەگە شێتییەکە دەزێتە ناوچاوانی. ئیتر خۆم بۆ پەرچەکرداری ئەو ئامادە کرد. هەر کە دەستی بۆ تاکە پیلاوەکەی تەنیشت خۆی راکێشا ئیتر من یەکسەر فرتە بکەمە دەرەوە، دایکم بە دەنگێکی هێمن و لەسەر خۆ پێیوتم:

+ دانیشە کوڕم دانیشە.. بەر دەرگاکەم لێبەردە..

- دانانیشم هەتا بەشم نەدەیت..

+ چییە کوڕم، نیازت نییە لە کەلی شەیتان بێیتە خوارەوە وابزانم خۆت بە فەلاقەکردن دەدەیت، بەر دەرگاکە بەردە لێم..

- هەر پڕ ئەو جامەی بەردەستت، جامی ئاو خواردنەوەکە..

+ باوکت پێمان بزانێت ئەوسا من سەرکۆنە دەکات و تۆش فەلاقە و میرازێکی چاکت بەردەکەوێت..

- عەمبارە گەورەکە تەنیا یەك جامی لێکەم بکات پێوە دیار نییە.. مەگەر تۆ خۆت بە باوکم بڵێیت ئەگینا ئەو چووزانێ..

+ ئەوە باوکت بۆ نان دایناوە، گەنمی باراسیاوە و سەرەن و کەو و بێژنگ کراوە و پاکە، بچۆ لە گەنمی شوێن خەرمانەکە هەر چەنێك دەبەیت بیبە.

- ئاخر دایە گیان ئەو های هایە (مامە عەلە عەودە)یە، ئەویش تەماتە بە گەنمی بن خەرمان ناگۆڕێتەوە، دە توو گیانی ئەو برا تاقانەتە، توو قورعانەکەی مامە ئەولقادر یەك جامۆڵکە گەنمی پاکم بدەرێ با بایی سێ چوار تەماتەش بێت، دە دەی دایە گیان..

کە زەردەخەنەیەکی کرد زانیم دڵی نەرم بووە. بۆیە زیاتر لێیپاڕامەوە و پێمداگرت وتم: هەتا نەمدەیتێ بەردەم ئەم دەرگایەت لێ بەرنادەم، ئەو هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی:

+ ئەی خوا مەرگم بۆ بێرە خوا.. چۆن ئەم هەتیوە، وەکو قیر پێمەوە لکاوە و لە کۆڵم نابێتەوە، دەبڕۆ هەی بەچەوازی لێت بدات).. بچۆ بیبە و لە کۆڵم بەرەوە. بە بەقاڵەکە بێژە تەماتەی جوانت بداتێ، بێژە بە کاڵیی دەیخۆم. دە برۆ بیسێنە و بیکە بە قوزەڵقوردت..

- ئەوەڵڵا دەیکەم بە زەڵاتە.

یەکەجار گوێم لێبوو کابرای تەماتەفرۆش های تەماتەی (یەك بە دوو دەکرد) ئێستە دەڵێت: های تەماتە سەر بەسەر بە گەنم.. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە تەنیا تەماتە کاڵ و رزیوەکانی ماوە، بەئەو دەردی سەرییە تا جامێك گەنمی پاکم دەست کەوت خەریك بوو قیر سپی بێت، جا خۆش ئەوەیە تا پیادەگەم تەنیا تەماتەی نیوە گەنیو مابێ..

جامۆڵکە پڕ گەنمەکەم گرت بە دەستەوە و ئەوەندە بەپەلە لە ماڵ دەرچووم، سەر سێکم دا خەریێك بوو گەنمەکە بڕژێتە سەر زەوی و لەناو ئەو خۆڵ و پشقلەدا ببێتە نسیبی قەل و مریشکەکان. هەرچۆنێك بێت خۆمم گرتەوە و سەر بەرەوخوار گلۆر بوومەوە بەرەومالّی خانەخۆیی تەماتەفرۆش، کە گەیشتمە بەر دەرگای حەوشە روانیم تەماتەفرۆش سەبەتە تووڵێنەکانی بە دیوارەکەدا هەڵسپاردووە و خەریکە دەمی هەگبە پڕ لە گەنمەکەی دەدوورێت، بەبێ ئەوەی من هێچ بڵێم، ئەو سەری بڵند کرد و وتی: تەواو.. نەما.. ئیتر منیش بە نائومێدی وەکو جەنگاوەرێکی دۆڕاوی بەرەی شەڕ، ملم شۆڕ کردەوە و پاشەوپاش بەرەوماڵ بۆی کشامەوە..

***

دایکم چاوە ماندووەکانی کردەوە. تەماشایەکی کردم و وتی: هەر بە پێوە راوەستاویت کوڕم.. دە دانیشە، من باشم.

ئەو لە خەونیشدا شاری هەولێری نەدیبوو. رۆژێك لە رۆژان بەخەیاڵیدا نەهاتبوو چەند ساڵێك لەئەوێ بەسەر ببات!! بەڵام ئێستە ئاوارەیە و خۆی واتەنی (دوورە وڵاتە و دوور لە قەوم و خوێش و هاودەمانی ژیان بەسەر دەبات)، بۆیە کە بێتاقەت دەبێت

حەز دەكات هەردوو كورِ و كچەكەی و نەوەكانی لە دەوری گلێرببنەوە. ئیتر یان ئەوان قسەی بۆ بكەن یان خۆی ئەگەر تاقەتی هەبێت بیرەوەرییەكانی كانیمارانیان بۆ بگێڕێتەوە. بۆیە پێموت: ئەریَ دایە، ئەو شەوەت لە بیرە كە من منداڵ بووم و مامم هات بۆ ئاوایی و لە باخەڵ باوكم دەریكردم و بردمی بۆ كفری؟

ئەو هەناسەیەكی قووڵی هەڵكێشا وتی: تا هەفتەیەكیش شەوانە بەدەم گریانەوە لە خەو رادەپەڕیم و تا بەیانی خەو نەدەچووە چاوم..



## (١١)

دەمەو ئێوارەی شەوێکی پاییزبوو، ئۆتۆمبیلێك لە دامێنەوە خۆی کرد بە نـاو ناواییـدا و تیشکی لایتەکەی سەربانەکانی رووناك کردەوە. گورەگورەکەی تا دەهات لە ماڵی باوکم نزیـك دەبووەوە و کاتێکمان زانی لە پێش دەرگادا راوەستا. باوکم وتی: هەبێ و نـەبێ ئـەوە (فـەقێ عەلی) برامە.. یاخوا خێربێ.

هەتا ئەم کلاشەکانی کردە سەر پێوە ئەو دەرگاکەی خستە سەرپشت و خۆی کرد بە ماڵدا. پاش نانخواردن و دەمەتەقێ مامم وتی: هاتووم ئەو کورە ببەم بۆ شار. لەوێ وەکـو کورەکـانی خۆم لە قوتابخانە دەیخەمە بەر خوێندن. برا چەند جارێکی تر ئەم ئارەزووەی خـۆمم لـەلای تـۆ درکاندووە، جا عەزیەتم مەدە و چەند رۆژێکی تر قوتابخانە دەکرێتەوە، با ئەمسالی نەفـەوتێ. پاش کەمێك بێدەنگی باوکم وتی: نامەنتوبیلاە دەسەلاتی تۆم نیبە فەقێ عەلی، بیبە، ئەگەر ئیدارە بکات باشە..

هەر ئەو شەوە سواری جێبە ئەمریکییەکەی کردم و بەرەو کفری کەوتینەرێ. من نـەمزانی چەندی خایاند و بەکام رێگادا رۆیشتین، تا گەیشتینە ئەو شوێنەی کە بەسەر شاردا دەیڕوانی، شار بەشێوەیەك دەبرسکایەوە، هەر دەتگوت کێلگەیەکی گەنمی گەورەیە و بەئەم شەوە ئاگری تێچووە و واخەریکە دادەمرکێتەوە. کە گەیشتینە مـاڵی مـامم ئەوەنـدە شـەکەت و مانـدوو بووم، نەمزانی چۆن و لەکوێدا و کێ جێی بۆ راخستووم و کەی خـەوم لێکـەوتووە. سـبەی زۆر زوو بەخەبەر هاتم، بەڵام لە ناو جێگاکەمدا خۆم وستەدا و روانیم، هەتا مامم بـانگی کـردم و وتی: هەڵسە بچۆ دەم و چاوت بشۆرە و وەرە قاوەڵتی بکە..

کە مامم لە ماڵ بەرەو بازار دەرچوو ئیتر من کەوتمە خۆ..

ئەو رۆژە وەکو کەروێشکێکی نامۆ و دابڕاو لـە رەوەکـەی، بـە ورياييـەوە چـاوم دەگێـڕا، هەنگاوێ دەرۆیـشتم و هەڵوەستـەیەکم دەکـرد، هەرچـی کونوقـوژبن و ژوور و سـەربانی ئـەو حەوشە گەورەیە هەبوو هـەموویم بەچـاو پـشکنی. دەرگـای حەوشـەکە دەرگایـەکی داریـنی گەورەی بزمار رێژ بوو. ئەو دەرگایە بە بزماری ئاسنینی سەر زل داکوترابـوو. بـەلای دەسـتی راستدا جگە لە سەرشۆرکەکە، گومەزیەکی نزم سێبەری بۆ سێ کوپـە ئـاوی قـەوزە گرتـووی

گەورە کردبوو، بە تەنیشتییەوە پێپلیکانەیەکی رکی پشتەوشکێن بۆ سەربانەکە دەڕۆیشت، ئینجا بە ژوورێکی بچووکی دار بەسەر، خانووەکە دەستی پێدەکرد، ژووری دانیشتن و میوان روو لەیەك، بەرهەیوانێك جیای کردبوونەوەوە، ژووری سێهەم و چوارهەم و پێنجهەم بەهەمان ئەندازەی ٣×٦م٢ پێپلیکانەیەك لێکی جیاکردبوونەوە، ئەم پێپلیکانە سەری بە گومەزی هاتبووە یەك و بە تەنووربانێك کۆتایی پێدەهات، لەسەربانەوە کە دەتڕوانی بەرەو باکوور و رۆژئاوا لە بن تەمەڵی ئەم خانووەوە تا چاو بڕ بکات قەبرستانێکی گەورەی کۆنت بەرچاو دەکەوت، کە بڕێکی زۆر لە گڵکۆکانی بەگومەز سەریان گیرابوو رۆژی لەدایکبوون و مردنی لە سەر کێلێکی مەرمەڕی پشت سەری تۆمار کرابوو، ئێستەش چیای باوەشاسوار وەکو (هەرەمی خۆفۆ)ی فیرعەونەکانی میسر قوت بووەتەوە و دەڕوانێتە سەر شاردا، چەمی قوشەچاپانیش بە دامێنیدا بەلای رۆژهەلاتدا شۆڕ دەبێتەوە، ئەم گەڕەکەی ئێمە بە گەڕەکی (ئیسماعیل بەگ) ناسراوە و بە یەکێك لە گەڕەکە کۆن و گەورەکانی شار دژمێردرێت.

من تا چەند رۆژێك لەئەو شارە جەنجاڵ و گەورە و چراخانەدا جۆرە سەرسامییەك دایگرتبووم. لەهەموو شتم بە وردیی دەڕوانی، قرخەقرخی دەمی بەلووعەکە و پژمەی بەهێزی پێش هاتنی ئاوەکە، پاك و خاوێنی و فێنکی ژوورە بەرفراوانەکان، کیژۆڵە بێشەرم و ژنە قوڵ رووتەکانی گەڕەك و کۆڵانە باریکەکەی رێگای بازاڕ، بۆنی کوتاڵ و چای سیلان و هەوا فێنك و شێدارەکەی ئەو قەیسەری و بازاڕە قەرەباڵغە، کە تێکەڵ بە هاتوهاوار و بێوبڕۆی دووکاندار و کڕیارەکان دەبوو، ئەمانە هەر هەموو وەکو خەون دەهاتنە پێش چاوم.

(ئەحە شەربەت) پیاوێکی کورتە باڵای گۆشتنی لادێیی ( تازە شاری) رووخۆش بوو، بە باسووقە سەوزەکەی بنهەنگڵییەوە بەناو قەیسەرییەکەدا دەڕویشت و شەربەتی مێوژی دەفرۆشت. چەند جامۆڵکەیەکی فافۆنی دەکێشا بەیەکدا و بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد: شەربەت بارید..

من کە هاتمە شارەوە بۆ یەکەمجار بایی عانەیەك شەربەتی سارد و بە تامی دەستی ئەو پیاوەم خواردەوە. لە گەڕەکەکەماندا هەرزانترین و خۆشترین خواردن، شرووبەکەی (ئامە زەردە) بوو. ئەو ژنە رەنگ زەردەی کە هاوسێکانی دەیانوت: تووشی نەخۆشی سیل بووە!! یەك سینی شرووبی سووری ئارداوی لەبەر دەرگای ماڵی خۆیاندا دادەنا و دەیفرۆشت.. منیش دەڕۆیشتم پارەکەم دەدایە دەستی و بە تەنیشت سینییەکەوە دادەنیشتم، شرووبەکەم بە پەنجەی

شایەتمان دەشکاندە ناو ئاردەکە و تێکەڵم دەکرد و هەڵمدەشێلا، ئنجا لە پەنجەم دەئالآند و لـە دەمم دەنا.. ئای کە شەربەتەکەی ئامە زەردە چەند بەتام و بەلەزەت بوو!!

ئەو رۆژانە کاتی ناونووسکردنی منداڵان لە قوتابخانە دەستی پێکردبوو. پاش نوێژی عەسر مامم لە مزگەوت گەڕایەوە ماڵ و لە سێبەری دیوارەکەدا تەنەکەیەکی بەتاڵی سەرەوخون کـرد و داوای دانیشتنی لێکردم. بە مەکینەیەکی دەستیی بەربووە قژە سـەرم و بـە نمـرە سـێ بـۆی تاشیم.. کە لێبووەوە شەپازلەیەکی کێشایە بناملمدا و وتی: هەڵسە..

هەتا لە ژێر دەستی ئەو سەرتاشە سەربازییە رزگارم بوو، چەند جارێك بە دەم هەڵکێشانی تاڵە قژەکانی سەرمەوە، کە دەمی مەکینەکە لێیگیردەبوو کرژ بوومـەوە و فرمێـسك پەڕییـە چاوەکانم، بەڵام لە ترسی ئەو مامە بەهەیبەت و ترسناکەدا نەمویرا فزە بکەم..

هەر کە مامم لە ماڵ دەرچوو (قاسم)ی ئامۆزام وتی: تۆ ئیمام باوەشاسـوارت دیـوە؟ وتم: نە.. وتی: ئەو ئیمامە زۆر موبارەکە بابچینە زیارەتی.. مەرقەدی ئیمـام بـە ناوقـەدی چیـای باوەشاسوارەوەیە و لەناو ژوورێکی چوارگۆشەی سەربە گومەزیدا راکشاوە، بەئەو توولەرێیـەدا کە بەناو گورستانە گەورەکەدا دەڕوات، سەرەوژوور هەڵکشاین و خۆمان کردە ناو ژوورەکـەدا. بە رووی دەرگای ژوورەکەوە و بە تەنیشت گۆڕە هەڵواسراوە سەوزەکەوە برێ خڕە بەردی سـەوز بەسەر سەکۆکەوە دانراوە، ئەم بەردە سەوز و خڕ و لووسـانە پـیرۆزن و دەتوانیـت لـە رێگـای تاقیکردنەوەوە، بەختی خۆت بخوێنیتەوە. من بۆ یەکەمجار بـوو ئـەم باسـەم لـە دەمـی قاسـم بیست. پاشان وتی: ئەم بەردانە زۆر موبارەکن، بۆیە هەر کەسێك بێتە ژوورەوە بەرلە هەرشتێ دەبێت ماچیان بکات و بیانخاتە سەر چاوی.. دەی تۆش ماچیان بکە. من لەگـەڵ ماچـکردنی بەردەکاندا سامێك گرتمی و ترسێك چووە دڵمەوە.. بۆیە سەرم هەڵبڕی و تەماشای قاسم کـرد، ئەو پێیوتم: لە دڵی خۆتدا نیازێك بگرە؟ وتم: نیازی چی؟

- نیازی چی، چوزانم خۆت ئەزانی.. نیازی ئەوە بگرە بزانە ئەمساڵ لـە مەکتـەب نـاجیح دەبیت یان نا.. کەمێك سەرم بۆ لای سەکۆکە نەوی کرد و وتم: باشە، ئەوا نیـازم گـرت. ئـەو وتی:

- دەی بەردەکان لە گەورەوە بۆ بچووك لەسەر یەك دابنێ، ئینجا وەکـو ئـەوەی بنگوسـت بگریت ئاوا پەنجەکانی دەستت بکەرەوە و پەنجە تووتەی دەستی چەپت بخەرە سەر ئـاخر بـەرد، پەنجە تووتەی دەستی راستت بخەرە سەر پەنجە کەڵەی دەسـتی چـەپت، پەنجـە کەڵـەی دەسـتی

راستت بخەرە ژێر چەنەت و راوەستە، ئەگەر بەردەکان بەر لەوەی برِوخێن سوورِیان خوارد ئەوا مرازت دێتە دی!!

ئەو چۆن رێنمایی کردم ئاوا بەو شێوە کارەکەم ئەنجامدا، بەڵام ئای چەندە کڵۆڵ و بەدبەخت خۆم هاتە پێش چاو، ئاخر بەر لەوەی پەنجە کەڵەم لە چەناگەم تەواو گیر بکەم بەردەکان بەبێ سوورِخواردن بەسەر یەکدا هەرِۆژان، بۆیە بەتیلەی چاو روانیمە قاسم تا کاردانەوەی بزانم، پێیوتم: هاوارت لە ئیمام باوەشاسوار کرد؟ وتم نە، هاواری چ بکەم؟

وتی: هەی عەشایەر چۆن دەبێت هاوار نەکەیت؟ ئەبێت لێیشی بپارِێیتەوە..

من لە پارِانەوە و دۆعاکردندا دەستانێکم هەبوو، چونکە باوکم فێری دۆعا و پارِانەوەی زۆری کردبووم، بەڵام پارِانەوە لە خودا نەك لە باوەشاسوار، هەرچۆنێك بێت لەوبارەوە دەسەپاچە نەبووم بۆیە بەر لە رێکخستنی بەردەکان وتم: باوەشاسوار گیان هاوارە، باوەشاسوار خۆتۆ دەزانیت من کورِی پیاوێکی موسڵمان و نوێژ و تاعەت دروستم، خۆیشم مندالێکی نابالقم و تەنانەت لەلای خوداش دۆعا و پارِانەوەی منداڵ گیرا دەبێت، توخوا باوەشاسوار گیان رەحمم پێبکە و بە بەردە موبارکەکانت بێژە با بەدەوری خۆیاندا بسوورِێنەوە ئەوسا بکەونە سەر سەکۆکە..

بیسمیلایەکم کرد و کارەکەم دووبارە ئەنجامدا. ئەمجارە دوو سێ بەردیان سوورِ و نیوە سوورِیان خوارد و لاربوونەوە. قاسم وتی: تا سێ جار ئەتوانیت خۆت تاقیبکەیتەوە.. بۆیە هیوایەك لە دڵ و دەروونمدا چووزەڵەی کرد و بۆ دواجار پارِانەوەکەم دووبارە کردەوە و کەمێکی تریشم خستە سەری وتم: باوەشاسوار گیان ئێستە من لەئەم شارەدا وەکو هەتیو وام، سواڵکەرێکم و هاتوومەتە خزمەتی تۆ، هاتوومەتە بەردەم ئەم مەرقەدە موبارەکەی تۆ، باوەشاسوار ئەی باوکی لێقەوماو و سەرلێشێواوان، بەساقەتبم، ئەگەر لەمەکتەب ناجیحم بکەیت ئەوا شەرتبێ بە دایکم بڵێم خێرێکت بۆ بکات، پێی یەژم یەك کەڵەشێری گەورەت بۆ بکاتە خێر و خۆمیش پاش هەموو نوێژەکانم فاتیحا بۆ رۆحیانەتت رەوانە بکەم.. هاوارە باوەشاسوار گیان هاوااااارە..

ئەمجارە بەبرِوایەکی زیاترەوە چوومە پێش، هێمنتر لە دووجاری پێشوو، بەردەکانم یەك لە دوای یەك، گەورە، بچووك، بچووك و بچووکتر، پان، خرِ و خرِتر، لەسەر یەکم دانان و پەنجەکانم کردەوە و لەسەرخۆ خستمە سەر دوا بەرد، پەنجەکەڵەی دەستی راستم خستە ژێر چەناکەم و بە چاویش لەبەردەکانم روانی و هەوڵمدا باشتر لەنگەریان بگرم، تەماشام کرد بەردەکان بەبێجووڵە

لە ژێر چەناکەم و هێزی پەنجەکانمدا ماوەیەکی باش گیریانخوارد، ئینجا کەمێ پەنجەکانم بۆ شل کرد، کە روانیم هەسوونە بەردی تاین وەکو میزراح، تاوێکی باش سووڕیان خوارد و کەوتنە سەر سەکۆکە، من زۆر بە دڵخۆشییەوە لە قاسمم روانی، ئەو وتی: بەختت باشە، باوەشاسوار خۆشی گەرەکی..

وادیار بوو لە ماڵ دەرچوون و دوورکەوتنەوەمان زۆری خایاندبوو، بۆیە مامم پێش ئێمە گەڕابووەوە و لە هەواڵی ئێمەی پرسی بوو. کە لە دەرگای حەوشە چووینە ژوورەوە بانگی کردین. من زۆر ئاسایی بەرەو لای چووم، بەڵام قاسم لە پێپلیکانەکەی ئەمبەرەوە پڕتاو رایکردە سەریان و خۆی بە دەستەوە نەدا، کە لێینزیك بوومەوە بە پەنجە کەڵە و دۆشاومژەی دەستی راستی، گوێچکەی چەپی توند گرتم و گوشی، ئینجا توندتر بایدا و وتی:

ئێرە ئاوایی نییە، شاااارە شاااار، شاریش منداڵی زۆڵ و بێئەدەبی تیایە، جارێکی تر لە ماڵ دوور نەکەویتەوە هاااا..



به مەبەستی وێنــەگرتن بــۆ تــەواوکردنی مامەڵــەی وەرگــرتنم لــە قوتابخانــە، ڕۆژێ یــەکێك لــە خزمــەکانم کەوتــە پێــشمەوە بــۆ ئەوســەری بــازاڕ و لــەوێ بردەمییــە لای وێنەگرێکی تورکمان و پێیوت: چەند وێنەیەکی ئەم منداڵەم بۆ بگــرە. کــابرای وێنــەگر بەسەر سێپاکەوە کامیرا سنوقییەکەی دامەزراندبوو، بەرانبــەر چــاوی کامیراکــە پارچــە پەڕۆیەکی ڕەشی بە دیوارەکەوە هەڵواسیبوو، هێمای بۆ کورسییە دارینەکەی پێش خۆی کرد و داوای دانیشتنی لێکردم، منیش دانیشتم، بەر لەوەی ئەو وێنەی من بگرێت مــن وێنەیم لە مێشکمدا ڕەنگڕێژ کرد.

ئەو کابرایەکی باڵابەرزی کەمێك سنگ قوپاو بوو، قایشی سەر پانتۆڵە ڕەشەکەی لە ژێر ناوکییەوە بەستبوو، قۆڵی کراســە سـپییەکەی تــا ســەر قوڕەنیــسکی هــەڵکردبوو، نینۆك و پەنجەکانی دەستی ڕاستی وەکو ئەوەی لە خەنەی گرتبێــت و کــاڵ بووبێتنــەوە، ئاوا مۆر دەیاننواند، تەوێڵی سێ چوار لۆچی تێکەوتبوو، تەرازووی چــاوەکانی کــەمێك لارەسەنگ دەبینران، سوێڵەکانی وەکو قەیتانی ڕەش و باریك بــە لای گۆناکانیــدا شــۆڕ بووبوونەوە و هەر ئەو بەیانییەش ریشی پاك تاشیبوو، جگەرەکەی بــەلا لێــوی گرتبــوو سووتکەکەی خەریك بوو بەردەبووەوە ســەر زەوی و جارجارێــك لیــك بەلالغاوەیــدا شــۆڕ دەبووەوە، کەمێك ڕووی وەردەچەرخاند و لەگــەڵ لابردنــی جگەرەکــەی دەمــی، تفێکــی ڕۆدەکردە سەر زەوی.. ئەو پێیوتم: سەیری من بکە ئاقڵ، حەرەکە مەکە..

کە چاوم بڕییە ناوچەوانی، هاڕەی دەڕابەی دووکانەکــەی لای ڕاســتم ڕایــچڵەکاندم و لام کردەوە، لەبەردەم دووکانەکەی ئەم لاترەوە بڕێ تەماتە و کۆمەڵێك دۆمەڵانی گەورە و لووسم بەرچاو کەوت، کابرای وێنەگر دەستی لەناو توورەکە ڕەشەکەی پشت کامیراکــە دەرهێنا و لیمنزیك بوودوە و بە دەستێکی سەری گرتم، ئەو دەستەکەی تری خــستە ژێــر چەناگەم و وتی: ئاااا.. ئاوا مەجووڵێ.. باشە ئەفارم..

پاشەوپاش کشایە دواوە، چوو لە پشت سنوقەکەوە ڕاوەســتا و بڕێــك خــەریك بــوو، ئینجا تەماشایەکی منی کرد، کە لەو کاتەدا بە تیلەی چاو لــە کۆمەڵــە دۆمەڵانەکــەم دەڕوانی. ئەو وتی: سەیری من بکە هاها سەیر بان دەستم بکە (دەســتی ڕاســتی بەســەر

قەباخی چاوی کامێراکەوە بوو)، تەماشایکرد، بەڵام ئەو پشت کامێراکەی بەردا و هاتەوە بۆ لام، دووبارە سەروملی ڕێکخستمەوە و وتی: ملت لار مەکە با لە ڕەسمەکەتدا لار دەرنەچێت.. دیسان گەڕایەوە جێگەی خۆی، وادیار بوو برە دۆمەلان سەرنجمیان بۆ لای خۆی ڕاکێشابووەوە، بۆیە بە کەمێك تووڕەییەوە بەرەو لام هات و وتی: بابە من یەژم حەرەکە مەکە بارەسمەکەت نەسووتێ.. دیسان سەروملی ڕێکخستمەوە و بە تووڕەییەوە داوای لێکردم هیچ نەجووڵێم و تەماشای چاوی کامێراکە بکەم. دەستی ڕاکێشا، بە سێ پەنجەی زۆر لەسەرخۆ سەرقاپی چاوی کامێراکەی لادا و پاشان سەرقاپەکەی دانایەوە شوێنەکەی خۆی و وتی: تەواو هەڵسە..

کە ئازادی کردم تێر تەماشای دۆمەڵانەکانم کرد و چوومە نزیك وێنەگرەکەوە ڕاوەستام. ئەو ماوەیەك دەستی هەر لەناو کیسە ڕەشەکەدا بوو، پاشان چەکمەجە بچکۆلانەکەی ڕاکێشا و پارچەیەك مقەبای لە ناو دەرمانەکەدا ئەمدیو و ئەودیو کرد، کە مقەباکەم بە ڕەشیی بەر چاوکەوت وامزانی وێنەکەم سووتاوە و خەتاکەش هی منە، چونکە بە قسەی ئەوم نەکرد و زۆر جووڵامەتەوە، دوایی زانیم ئەوە پێچەوانە (عەکس)ەکەیەتی، کە لێبوەوە و وێنەکانمان لێوەرگرت، سەبارەت بە دۆمەڵانەکە لە هاوەڵەکەمم پرسی ئەو وتی: ئەوە دۆمەڵان نییە.. پەتاتەیە!!

ئەو ساڵە کە چوومە شار لە قوتابخانەی (ئوولا)ی سەرەتایی وەرگیرام و پۆلەکانی یەك تا چوارم بڕی. لە پۆلی پێنج لە وانەیەك کەوتم، بەڵام لەبەر ئاڵۆزی شار و دڕندایەتی حەرەس قەومی و هێرشی سوپای عێراق بۆ لادێکانمان، دەرفەتی ئەوەم بۆ نەڕەخسا بەشداری تاقیکردنەوە بکەم، بۆیە لە پۆلی پێنج مامەوە. لە پۆلی پێنج چەندێ حەزم لەزمانی ئینگلیزی دەکرد، ئەوندەش مامۆستای وانەبێژەکەم خۆش دەویست. مامۆستا (نازم)ی هێمن و میهرەبان، پیاوێکی باڵاناوەندی ڕەقەڵەی ڕەگەز تورکمان بوو. ئەو چاویلکەی پزیشکی دەکردە چاوی، لەبەر هەتاویش ناوێنەی ڕەش (شەمسی) لەسەر دەبەست، بۆ ڕوونکردنەوەی وانەکەی سینییەکی فافۆنی بچووك، کە چەقۆیەکی قەڵەمبڕ و لاستیکێکی خەتڕەشکەرەوە و چەند لەتێ ئانەڕەق و قەڵەمێکی بەسەرەوە بوو، دەگرتە دەستەوە و دەهاتە پۆلەوە. ئەو لە نووسینی وشە و ڕستەی ئینگلیزیدا حەرفەکانی تێکەڵ (مەزج) نەدەکرد. هەر قوتابییەك بە تێکەڵ بینووسیبایە، پێیدەووت: ئەوە زنجیرە و باوکتی پێدەبەستیتەوە، بە مەبەستی ناسینی

پیتەکان و فێربوونی نووسین و خوێندنەوە ڕێگەی لێدەگرتین لە تێکەڵکردنی حەرفەکان، هەردەم دەیگوت: کوڕەکانم (it) بۆ هەموو شتێك بەکار دێت، بۆ بەرد، دار، ئاژەل، تەنیا بۆ مرۆڤ بەکار نایەت. جارێك دەستی بۆ وێنەی (زەکی) ناو کتێبەکە برد و لە قوتابییەکی پرسی: (Ho this is?) ئەویش بەبێ بیرکردنەوە و بە پەلە وتی: (it).. و مامۆستا نەیهێشت تەواوی بکات، پێیوت: دانیشە.. باوکت "ئیتە"..

هەوڵ و ماندووبوونی مامۆستا نازم لە یەکەم ساڵی خوێندنی ئینگلیزیدا بۆ من بوو بە بناغەیەکی چاك، بۆیە لە پۆلی شەشدا یەکێك بووم لە قوتابییە هەرە زیرەکەکانی زمانی ئینگلیزی، کوڕە گەورەکەی حاکمی شاریش یەکێك بوو لە قوتابییە تەمەڵەکانی پۆلی پێنج..

ڕۆژێك بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان هاتە پۆلەوە و داوای لە مامۆستای وانەبێژ کرد، کە زیرەکترین قوتابی لە زمانی ئینلگیزیدا بۆ دەسنیشان بکات، ئەویش پەنجەی بۆ ڕاکێشام و داوای لێکردم هەڵسمە سەر پێ، منیش هەڵسام و ڕاوەستام، بەڕێوەبەر پێیوتم: حاکم داوای لێکردووم قوتابییەکی زیرەك و ژیری بۆ دەسنیشان بکەم، تا لە ماڵی خۆیاندا ڕۆژی یەك دوو کاتژمێر وانە بە کوڕەکەی بڵێتەوە، تۆ قوتابییەکی زیرەك و جێی باوەڕی ئێمەیت، بۆیە داوات لێدەکەم بەئەو ئەرکە هەڵسیت، من دڵنیام حاکم مانگانە شتێکتیش بۆ دەبڕێتەوە، تۆش منداڵە هەژاریت و سوود لەئەو پارمەتییە وەردەگریت..

ئینجا وتی: دانیشە کوڕم..

من سەرەتا کەمێك شپرزە بووم. چپە و ورتەی قوتابییەکان سەرنجی مامۆستای ڕاکێشا، بۆیە دووسێ جار نووکی دارەکەی دەستی کێشا بە تەختە ڕەشەکەدا و وتی: بۆی.. دۆنت فۆیز..

ئەو ڕۆژە، کە لە قوتابخانە بەربووین بەدەم ڕێگاوە خەیاڵ بردمییەوە: حاکم و ماڵی حاکم و وانەوتنەوە.. ئیتر حاکم بەسەریی دەمناسێت، مانگانەکەش شتی چاکە و بۆ خۆم کەلوپەلی پێدەکڕم، ئەگەر کوڕی حاکم ئەمساڵ بە نمرەیەکی باشەوە لە وانەکەی سەرکەوێت، کێ دەڵێت بە خاوخێزانەوە سەردانی ماڵی باوکم ناکات، خۆ ئەگەر سەردانیشمان بکات ئەوا دڵنیام باوکم کاوڕێکی قەڵەویان بۆ سەر ئەبڕێت، دەمەتەقێی خۆشیشی بۆ دەکات، باسی ئەو ساڵەی بۆ دەکات کە "قورە"ی عەسکەری هات و

"جەلب"یان کردەسەری، دەمەقاڵەکەی خۆی و (عاسم باشچاوش)یشی بە دوور و درێژی بۆ دەگێڕێتەوە، باسی شەڕی (قاتەکانی کفری) بۆ دەکات، ئەو شەڕەی کە خۆی وەك پێشمەرگەیەکی میللی بەشداری تیادا کردبوو. دایکیشم بە وردیی لە ژنی حاکم دەڕوانێت و دەڵێت: وەی خوایە ژنی حاکم چەندێ جوانە، تەماشای ئەو پاوپوزە سفت و سۆڵەی بکە، ئەی قەد و باڵای، هەر بەژیت داری عەرعەرە و بەرەو ئاسمان هەڵچووە، ئەی ئەو کوڕەی چەندێ نەرمونۆڵ و خرپنە هەر دەڵێیت بەرخە کۆرپەی تێر شیری بەهارە..

من لەئەم خەیاڵپلاوییەدا بووم، یەکێك لە هاوپۆلەکانم تەماشای منی کرد و بە هاوەڵەکەی وت: لێی دا!!

من وتم: چی؟ کێ لە کێی دا؟

ئەو وتی: تۆ لە کوڕی حاکم..

وتم: بۆ.. یانی مەبەستت چییە؟

+ مەبەستم چییە؟ بۆ خۆت نازانیت هەم نان و هەم "...."نت دەرچوو!!

هەر کە ئەو قسە ناشیرینانەم بیست بەر چاوم تاریك بوو نەمزانی کتێبەکانم دا بەدەستی چ قوتابییەکەوە و بە بێڕاوەستان پەلامارمدا و دوو سێ مشتم ناراستەی دەم و چاو و سینگی کرد، ئەو دەستی کردە بۆڕەبۆڕ و جوێندان، بەڵام من باوکانە و بەئەوپەڕی ئەدەبەوە پێموت: حەرامزادی توخمی نابیسمیلا جوێن مەدە..

ئەو دوور راوەستابوو هەرچی جوێنی پیس بەدەمیدا هات، پێیدام و نەیگێڕایەوە، بۆیە دووبارە من پەلامارمدا و دووسێ مشت و پاشان شەقێکی مزرم لە دواوە تێهەڵدا..

ئەو رۆژە بۆ عەسرەکەی (یاسین) کوڕە گەورەکەی مامم، کە هەمووومان بە (کاکە) بانگمان دەکرد، لە مزگەوت گەڕابووەوە بۆ ماڵ، بەدەم رێگاوە هەتیوەکەی هاوپۆلم رێی لێگرتبوو و شکاتی منی لەلاکرد بوو. ئەو کاتە کە کاکم لە نوێژی عەسر دەگەڕایەوە بۆ ماڵ، من لەبەر دەرگادا راوەستابووم، کاتێکم زانی کاکم لە دوورەوە بانگی لێکردم و منیش بەرەو رووی چووم، بە بێهیچ پێشینەیەك پێیوتم:

- وەرە وەرە هەی خوێڕی..

وتم: چییە کاکە؟

- چییە هەی بەرەڵا؟ ئەوە بۆ لەو کوڕەت داوە؟
+ کاکە قسەی بێئەدەبی پێکردم..
- هەی بێئەدەب ئەگەر تۆ مانای ئەدەبت بزانیایە لەئەو کوڕەت نەئەدا..
+ ئاخر کاکە قسەی ئەدەبسزیی کرد..

کاکم بە پێش چاوی منداڵەکانی گەڕەکەوە دوو سێ شەپازلەی کێشایە بنا گوێمـدا، ئینجا پەلی گرتم و بە لێدان بەرەوماڵ پەڵکێشی کردم. هەر لەو کاتەدا مـامم بـە دوای کاکمدا دەهاتەوە ماڵ، ئەو بە بێنـەوەی لـە گونـاه و تاوانەکـەم بکۆڵێتـەوە و بزانێـت مەسەلە چییە بە دەنگێکی بەرز وتی: تێیهەڵدە یاسین تێیهەڵدە، چاك چاك تێیهەڵـدە.. دوایی وتی: نانا بەدڵم نییە، بە دڵم نییە. کە نزیك بووەوە وتی: بیدەرە خۆم..

مامم لێمنزیك بووەوە، گوێچکەی توند گرتم و بایدا و بەرەوماڵ رایکێشام، ئەوەندە توند گوێی باهەڵدام قرتەیەکی وای لێهەڵسا وامزانی گوێم لێبووەوە، بۆیە لە حەیبەتدا ملم خوار کردەوە و لابەلا بەدوای دەستیدا رۆیشم هەتا کردمییـە حەوشـەکەوە، ئینجـا وتی: ئادەی یاسین ئەمجا تێیهەڵدە..

کـاکم قوتـابی قۆنـاغی ناوەنـدی بـوو. ئـەو کـوڕێکی چوارشـانەی وەرزشـەوان و مشتوەشێن بوو، چاوی زۆربەی کوڕە شەڕانییەکانی شاری شکاندبوو. بۆیە لە حەوشـەدا وەکو تۆپی پێ تێیهەڵدەدام و باوکی بۆی دەسەندەوە، جارناجارێك کاکم گۆڵی دەکـرد و دەیدام بە دیوارەکەدا، بەر لەئـەم فەلاقـەکردن و سـەگ بـە حەوشـەیە، کـە بـە ناهـەق پێیانکردم، مامم زۆر جاری تر بە تاوان و بـە بێتـاوان بـە دار و قایـشی پـشتوێنەکەی خۆم لێیدابووم و فەلاقەی کردبووم. تەنانەت جارێکیـان بـە نیوگـەزە ئاسـنینەکەی کـە قوماشی پێدەپێوا ئەوەندەی پیاکێشام نیوگەزەکە بە دەستییەوە چەمییەوە، لە هـەموو حاڵەتەکانـدا پێـچەوانەی منداڵـەکانی خـۆی، کـە مـیرازی دەکـردین و ئـەوان بـەدەم دەستییەوە دەیان زیراند و هەڵدەهاتن، من نـەدەگریام و نـە لـە بندەسـتی هەڵـدەهاتم، بەڵکو هەردەم پشتم تێدەکرد و بە دەست تەنها سەروچاوی خۆم دەپاراست، بەڵام ئەمجارە ئەوەندە ئازاریاندام و ئێشیان بەجەستەم گەیانـد، رێـك وەکـو گوێرەکەیـەك بـۆ قۆچـی قوربان بدرێتە زەویدا و ببۆڕێنێ، ئاوا بۆڕاندم و بەسەر زەویی ئـاو حەوشـەکەوە تـەخت بووم..

دادەم کە خوشکی دایك و باوکیی کاکم و لە ژنە گەورەکەی مامم، کە مردبوو بە جێمابوون، ئەو ئافرەتە بەرێز و زۆرمیهرەبانە، کە هەموو ئەندامەکانی بنەماڵە بە چاوی حورمەتەوە تێیاندەڕوانی، فریام کەوت و لە ژوورەکەی خۆی دەرچوو وتی: بەسە بەسە یاسین، باوە باوە بەسە.. گوناحە ئەو بەسەزوانە چی کردووە وا خەریکن دەیکوژن!! ئیتر ئەوان کە گوێیان لە دەنگی دادەم بوو، وەکو دوو یاریزانی گوێڕایەڵی نێو گۆڕەپانەکە، کە ناوبژیوان کارتی سووری بۆ بەرزکردبنەوە، ئاوەها کشانە دواوە گەمەکە، کە منی تیا ببووم بە فوتبۆڵ کۆتایی پێهات. هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە منیش پرۆژەی وانەوتنەوەکەم سەرنەگرێت..

*** 

ئێمە شەش حەوت برا و ئامۆزا بووین لەئەو ماڵە گەورەیەدا، پێکەوە سبەینان دەچووین بۆ قوتابخانە و دەگەڕاینەوە. لە ماڵیش پاش نانخواردن و کەمێك پشوودان بە فەرمانی مامم دەبوایە بەردەوام سەعیمان بکردایە و کتێب بە دەستمانەوە بوایە. چوونە کۆڵان و تێکەڵاوبوون لەگەڵ منداڵانی گەڕەك بۆ ئێمە حەرام بوو، جا تاچەندێ خۆمان لە ئەو حەرامە دەپاراست ئەوە شتێکی تر بوو. بۆ دڵنیایی خۆی و چاودێریکردنمان زۆر جار مامم لە ناوەختدا دەستی لەکار هەڵدەگرت و دەهاتەوە بۆ ماڵ و لەئەو سەری کۆڵانە تەنگ و دوورەکەوە دەستی دەخستە سەرچاوی و بۆ ئەمسەر دەیڕوانی، ئەگەر یەکێکمانی بەرچاو بکەوتایە لە دەرەوەی ماڵێن و کتێبمان بەدەستەوە نییە، جا ئەگەر کتێبیشمان بەدەستەوە بوایە، ئەو دەیگوت: کۆڵان و کتێب!! ئیتر زەلالەتمان بۆ دەهات و خودا خراپی بۆ دەکردین. دەهاتە ژوورەوە بە شەپازلە، یان بە پشتوێنە قایشەکەی تاوانبار خۆی، فەلاقەیەکی مزری دەکرد و بۆ سەعیکردن دووبارە دابەشی دەکردینەوە سەر شوێن و جێگاکانی خۆماندا و بە دەنگی بەرز دەیگوت: تۆ بچۆرە ئەوێ، تۆش هاااا ئا لەوێدا سەعی دەکەیت، تۆ.. تۆ سەگ و حەرامزادەیت، دووریان دانیشە، برۆ هاها.. بۆ ئەوێ، ئالەوێدا سەعی بکە و لەماڵ دەرنەچن، سەعی بکەن کورە سەعی بکەن بابێن بەشت، بە ئەو قورئانەی کە بیسمیلام لێکردووە نەخوێنن دەتانکوژم!!

ئینجا پشتی هەڵدەکرد و بەرلەوەی لە دەرگای حەوشە بچێتە دەرەوە هەڵدەگەڕایەوە، تەماشایەکی هەڕەشەئامێزی دابەش دەکردە سەرماندا و ئینجا دەچووەوە بۆ سەر دووکان.

من جگە لە سەعیکردن و خۆماندووکردن هیچ ڕێگایەکی ترم لە پێشدا نەبوو، شەوانەش هەتا خەوم لێدەکەوت بەسەر جێگای نووستنەوە خەریکی خوێندنەوەی وانەکان دەبووم، زۆرجار کە بیری ماڵی باوکمم دەکرد، وەڕس و بێزار دەبووم و کتێبەکەم ئەنایە ژوور سەرم، خۆم دەخزاندە ژێر لێفەکەم و دەستم دەکردە گریان، گریانێکی بە کوڵ و بێدەنگ، دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکی گەرمم دەڕشتە سەر سەرینەکەم، تا خەوم لێدەکەوت.

ئاخر منداڵێکی وەکو منی بەنازپەروەردەی نوێژکەر و قورئانخوێن و پیاو!! لەناکاوێکدا لە باوەشی پڕ مەحەبەتی باوك و دایکێکی میهرەبان دەربکرێت و لە زیندانێکی گەورەدا یەخسیر بێت، بەردەوامیش وەکو تاوانبار و لەخووت و خوڕایی جەستە و ڕۆحی سزا بدرێت، لە خۆخواردنەوە و بچووکبوونەوە زیاتر ئەبێ چاوەڕوانی چی تر بکات.

کە پۆلی شەشی سەرەتاییم بە سەرکەوتوویی بڕی و چوومە ناوەندی، لە زۆر ڕووەوە بۆ من قۆناغێکی نوێ بوو. مامم بە بۆچوونی خۆی ئەو جۆرە چاودێری و سزادان و تەمبیە توندوتیژانەی لە بەرژەوەندی ئێمەدا بوو، بەڵام تا چەندێ کاری نێگەتیڤانەی کردە سەر باری دەروونی و کەسایەتی ئێمەی منداڵ، ئەوە شتێکی ترە و پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زانستی قووڵ هەیە..

لە پۆلی یەکەمی قۆناغی ناوەندی جۆرە ئازادییەکم پێدرا. (عوسمان)ی پوورزام ئەو کوڕە ژیر و وردبین و قسەزانە، لە کاتی شیاودا جۆرە پاڵپشتییەکی لێدەکردم. ئەو بە مامی دەگوت: خاڵۆ، سەعید گەورە بووە و وریا و ژیرە، لەقوتابخانەش زیرەکی خۆی سەلماندووە بۆیە حەقە لەمەولا ڕێگای بدەیت بە ئارەزووی خۆی دەشت و دەر بکا، من وریایی دەکەم..

عوسمانی پوورزا و زاوام، شەوانە تا نیوەشەو لە دووکانەکەیدا خەیاتی دەکرد، منیشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆ سەر دووکان. شەوێك لە شەوەکان عوسمان پێیوتم :

(کەمال چایچی) تەلەفزیۆنی لە چایخانە داناوە، ئەمشەو بە دزیی خالۆمەوە دەچین بۆ سەیرکردنی تەلەفزیۆن..

کەمال چایچی بۆ یەکەمین جار تەلەفزیۆنی هێنایە شاری کفرییەوە و بەرامبەر بە چوونە ژوورەوەی چایخانەی تەلەفزیۆندار دەبوایە هەر یەکەو پێنج فلس بدات. ئەو شەوە لەگەڵ عوسماندا چووینە چایخانە و بۆ یەکەمین جار تەلەفزیۆنمان بینی، هەر یەکەو لەنەو چایخانە گەورەیەدا بەرامبەر بە ئامێری تەلەفزیۆنەکە دادەنیشتن، شاشەکە باران (ئەمەش)ی زۆری دەکرد، بەڵام بۆ ئێمە شتێکی نوێ و تازە بوو چاومان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکە بەچرکەش لانەدەدا.. کاتێکمان زانی پێشکەشکاری بەرنامەکە قسەیەکی کرد و وتی: "ئێستەش لەگەڵ گۆرانیبێژی ناوداری عارەب عەوەز الدۆخی- دا دەبن"..
هەر کە پێشکەشکار ئەم قسە ئەفسووناوییەی لە دەم دەرچوو هەموو عارەبیزان و مامۆستاکان بە یەك دەنگ وتیان: ئەڵلالالالاهھ.. ئێمەش خۆمان ئامادەکرد بۆ بینینی ئەو گۆرانیبێژە، کاتێکمان زانی عارەبێکی رەشی عەگاڵ بەسەر هاتە سەر شاشە و دەستی بە گۆرانیوتن کرد. گۆرانییەکەش بە ناونیشانی (سۆتل سەهارە) بوو، ئەو کاتە ئێمە هیچ چێژێکمان لێوەرنەگرت، بەڵام پاشان و هەتا هەنووکەش بۆ منی زمانزانی عارەبی و هونەردۆست بەچێژ و بەتامترین گۆرانی عارەبی دەزانم و بە گوێلێگرتنی تاموچێژێکی نوێ و شیرینم پێدەبەخشێ.

پشتگیریکردنی عوسمان بۆ من، جۆرە سەربەخۆییەکی پێبەخشیم. سەربەستی لە چەند و چۆنیی سەعیکردن و شوێن هەڵبژاردن، بەڵام کام شوێن؟ تەنیا شوێنی خوێندن. ئەو شوێنەش سەربانیماڵە گەورەبوو، ئەگەرچی لەوێش تا دڵنیابوونی، مامم هەر چاودێری دەکردم، کە دەچوومە سەربان لە سێبەری ستارە بەرزەکەدا بە دەم هاتوچۆوە دەمخوێند. جارجاریش لە دەلاقەکانەوە کە دەیانڕوانییە سەرشەقام و ناو کۆڵان و سەربانی ماڵەکاندا تەماشام دەکرد، بەڵام لەئەوەدا بەختم یار بوو، کە ئەو چەند جارەی مامم بەپاپلیکانە درێژ و دوورەکەدا سەر دەکەوت بۆ تاقیبکردنم، دەیبینی خەریکی سەعیکردنم، ئیتر دڵنیابوو لەوەی کە چەواشەی ناکەم و نایخەڵەتێنم، بۆیە لە ئەو گوشارەش رزگارم بوو.

هەر لەو سەربانەوە بە جفرەی جووڵەی دەست بە قۆداهێنان پەیوەندی سۆزداریم لەگەڵ کچە قوتابییەکدا بەست و دەستمان کرد بەنامە گۆڕینەوە. نامەکانیشمان بە

زمانی عارەبی دەنووسی و بە ڕێگای تایبەتدا دەمانگەیاندە یەکتری. من پاش خوێندنەوەی نامەکان لە ترسی ئاشکرابووندا زوو دەمدڕین و وردوردم دەکردن، ئینجا لەسەربانەکەوە بۆ ناو گۆڕستانەکە دەمدا بە دەم باوە. ئێمە هەردووکمان پیتی (س)مان لە بری ناوەکانمان بۆ یەك دانابوو.

(س) ئەو کچە باڵا قەڵەمییە شیرین و ڕۆحسووك و نازدارە، کە لە نزیکەوە لێمدەڕوانی ڕێك دەچووە پێستی ئەو (وەڵەگ)ەوە کە خاڵۆم لە ناو تۆقێکی گەنمی دەشتی کانیمارانـدا بۆی گرتبووم. کوتومت دەتگوت ئەو بەچکە ئاسکە ناسك و نەرمۆڵەیە و هۆگری یەکتر بووینە. لەبەر خاتری ئەو، ڕێگای چوونە قوتابخانەم گۆڕی، تا ڕۆژی یەکجار لە نزیکەوە و ڕووبەڕوو چاومان بەیەك بکەوێت، هەر بەدەم ڕێوە یەك دوو چپەی تەڕ و منداڵانەمان دەکرد، بەڵام زۆری نەخایاند ئەو دیدارە ڕاگوزارییەمان لێحەرام بوو، چۆن؟

ناسیاوێکی خۆمان لەئەو کەین و بەین و ڕێگا گۆڕینەی من گومانی کردبوو، بە مامی وتبوو گوایە من زۆر بەئەو کۆڵانەدا دێم و دەچم، بۆیە دەبێت وریا بێت و هەوڵ بدات ئەو ڕێگایەم لێقەدەغە بکات، نەوەکو گرفت و سەرئێشەی بۆ پەیا ببێ.

نیوەڕوانێك دەستم لەناو لەنگەنێك ئانەگوشەی تەماتە و بامیدا بوو، مامم هات، دەستێکی بەئەمبەر و ئەویتریشی بەئەوبەری دەرگای ژوورەکەوە نا و بەسەر سەرمەوە سێبەری کرد، کە سەرم هەڵبڕی و تەماشای ناوچاوانیم کرد، نارەزایی و جۆرێك لە تووڕەبوونم تیادا خوێندەوە، ئەو بە بێهیچ پێشەکییەك وتی: کوڕە هێی ئەو کۆڵانەی کە پیادا دەڕۆیت بۆ قوتابخانە قوڕ و لیتەیە و چڵپاوە و گیانت پیس دەکات، تەرکیکە ئەگینا خراپت پێدەکەم هاااا.. ئەو ئەوەندەی وت و ڕۆیشت. من لە ترسی هەڕەشەکەی مامدا کۆلانەکەم تەرك کرد، بەڵام.. چیتان پێبێژم؟ ئاخر ئێستەش هەر دەترسم!!

***

## (١٣)

هەیوانەکە کەوتۆتە نێوان ژووری نیشتمان و ژووری میوانەوە. هەتا کەشوهەوا ساردی نەکردایە من لەنەو هەیوانەدا دەنووستم، کە ساردیشی دەکرد لە ژووری میواندا و نزیك دەرگاکە بەسەر چوار پایەیەکی ئاسنینەوە دەخەوتم. شەوی واهەبوو دیوەخان جمەی دەهات لە میوانــە دەشــتەکییەکانی دوورەشار. دێهاتییەکانی دۆڵی قەرەداخ کــاروان بــارە خــەلووز و تــووتن و ترێــی رەشــیان دەهێنایە شار. دێهاتییەکانی بنەی جافیش بارە گەنم و جۆ و مەڕومالاتیان دەهێنا و لە خانــەکانی بازاڕ و مەیدانەکەدا دەیانفرۆشت. دۆست و ئاسیاو و خزمەکان لە نەو دیوەخانەدا بــە قــسەوباس و گاڵتەوگەپ شــەویان دەبردەســەر. جگەرەکێــشەکان، ئــەوە هــەر مەپرســە، لــە پەســا ســیگاریان دەپێچایەوە و دەیانکێــشا، کــە لێدەبوونــەوە ئاگرەکــەیان دوور فڕێــدەدا، یــان دار ســیگارەکانیان بەدەمەوە دەگرت و (فتت) فتێکی بەهێزیان بۆ دەم دەرگاکە دەکرد، نەو بەردەرگایەی کە کــلاش و پێلاوەکانیان لەوێدا کەڵەکە کرابوو، من بــە نیــازی نووســتن دەچــوومە ســەر جێگاکــەم و بــە دەم بیگرەوبەردە و قاڵەقاڵ و دووکەڵی سیگارەوە گێژوکاس دەبووم و خەوم لێدەکەوت.

شەوێك لە دەنگی (ها.. کوڕە سووتا.. ئاوبهێنن، ئەی هاوار وە ماڵم..) بەخەبــەر هــاتم، کــە روانیم چڕە دووکەڵ لە لێفەکەم هەڵدەستێ، بەپەلــە لــە نــاو پێخەفەکــە دەرچــووم تــا ئاگرەکــەیان کوژاندەوە، وادیار بوو یەکێك لە جگەرەکێشەکان بە دارسیگارەکەی نیــشانی لــە دەمــی دەرگاکــە گرتبوو، بەڵام باش ئامانجی خۆی نەپێکابوو، ئاگرەکە کەوتبووە سەر پێخەفەکەی من و لــە بــۆنی بۆسۆدا بەئاگا هاتبوون.



لە پۆلی پێنجی سەرەتاییدا بووم، دیوەخان گوازرایەوە بۆ ژووری سێهەمی سەر سەردابەکە و بە فەرمانی مامم منیش قەرەوێڵە و کتێب و دەفتەرەکانم گواستەوە بۆ ژێرزەمینەکە، بەنیازی ئەوەی کە دووربم لە قاڵەقاڵ و هەراوهۆریای میوان و چاکتر وانەکانم بخوێنم. نازانم لەنەو ژێرزەمینەدا چەند شەو بە ئاسوودەیی نووستم، ئەگەرچی زرمەی پێ و قاقای پێکەنین زۆر شەو خەوی دەزڕاندم، بەڵام ئەم مەنزڵەم لە ژووری یەکەم باشتر بوو، هــەتا مردووەکــان لــێم نەهاتنــە دەنــگ و نەکەوتبوونــە شەڕکردنم، لەنەو ژێرزەمینەدا من سێ چوار شەو بەبێبواردن لەســەریەك خــەونم دەدی، شــەو دوای شەو خەونەکانم ئاڵۆزتر و ترسناکتر دەبوونەوە. لە خەومدا من نووستووم، چەند کەسێکی کفنپــۆش

دەهاتن و هەڵیاندەساندم پەلیاندەگرتم و دەیانبردمە سەر گۆڕێکی تازە لێدراو و بە نیشارەت لەگەڵ یەکدا دەدوان، بە نیازی زندەچاڵکردنم رایاندەکێشام بۆ لێواری گۆڕەکە.. شەوی دووهەم و سێهەم و چوارەمیش نەفەرە سپیپۆشەکان پتر دەبوون و هەمان رەفتاریان بە تووڕەییەوە دووبارە دەکردەوە.. دواشەو کە بۆ سبەی خەونەکانم گێڕایەوە، بۆ شەوی ئایندە مردووکان هاتنەوە گیانم، بەڵام ئەمجارە سەرتاپا رەشیان پۆشیبوو، ئەوان تەنها ددانە کەڵپە ئاساکانیان سپییان دەکردەوە، یەك لە دوای یەك دەهاتنە پێشەوە، هەتا هێزیان تیادابوو بە قامچییە رەشە گورزە هۆنەکەی دەستیان سەروگوێلاکیان کوتام.. دوامردوو کە نۆرەی هات من بە لێوار گۆڕەکەوە راوەستابووم و ئەو بەهەموو توانای خۆی شەقێکی تێهەڵدام و فرێی دامە ناو گۆڕەکەوە. من لە خەونەکەمدا وەك ئاینەمەل دەمزریکاند، کە لە دەنگی خۆمدا بەخەبەر هاتم سەرتاپا گیانم کەوتبووە لەرز و هەشۆکە. بۆیە تا مەلابانگدان خەوم لێنەکەوتەوە و بەسەر قەرەوێڵەکەوە کرۆشکەم کرد.

دوو سێ جار خەونەکانم بۆ عوسمانی پورزام گێڕایەوە. دواجار لێیپرسیم: هەموو شەوێك هەر خەونی وادەبینیت؟

کە بە ئەرێ وەڵامم دایەوە وتی: بە خاڵۆم دەڵێم جێی خەوەکەت بگۆڕێت.. هەر ئەو رۆژە عەسرەکەی ترۆتفاقم گواستەوە بۆ ژووری پێنجەم، کە سیخناخ بوو بە فەردە گەنمی خەتسور و تەنها لەلای دەرگاکەوە جێی قەرەوێڵەکەم بووەوە، من تا دوو سێ شەوێکیش ئەو خەونانەم بە ئاسایی لێکدەدایەوە و نەدەترسام، بیرم بۆ ئەوەش نەدەچوو، کە لە کاتی بناغە هەڵکەندنی ئەم خانووەدا لورلاقە دەست و قاچ و کەللەسەری بنیادەم بەدەم بێل و خاکەنازەوە هاتووە، کە هەواڵی خەوبینینەکەم بڵاوبووەوە و گەیشتە دەم ئەموئەو بەتایبەت ژنەکان، دەیانگوت: هەر باشە مردووەکان دەستیان لێنەوەشاندووە و ئەو منداڵە بەستەزمانەیان شێت نەکردووە.. ئاخر کێ دەڵێت ئەو مردوانە ئەسحابە و پیاو چاك نەبوونە، خۆ ئەگەر گوناحباریش بووبێتن ئێستە لە گوناح پاك بوونەتەوە.. ئەی کێ دەڵێت ئەم کوڕە باڵق نەبووە و گوناحی نەکردووە، هەر وایشە، بۆیە مردووەکان ترساندوویانە و ویستوویانە لە خۆیانی دوور بخەنەوە.

***

لەناو منداڵەکانی شاردا، من منداڵێکی پیاوی ئیماندار و لە خواترس بووم. سەرم بچوویایە نوێژم نەدەچوو. بەیانیان کەمێك دوور لە مامم دادەنیشتم و وەکو ئەو قورعانم دەوردەکردەوە، وەکو منداڵەکانی گەرەك حەزم لەگەمە و لاساریی دەکرد، بەڵام جوێنفرۆش و دەمپیس نەبووم، لە ترسی خودا و مامدا شێتەکانم ئازار نەئەدا. (فلیچە)ی گاوان و بەردەقانی هاوێژم تووڕە نەدەکرد. خۆ

ئەگەر جارجارێکیش حەزی منداڵانە هانی بدابایەم و کارێکی لەو بابەتانەم ئەنجام بدایە، ئەوا زوو پەشیمان دەبوومەوە و بە خۆدا دەچوومەوە، هەروەك مێردمنداڵەکانی شار نەزەرم دەکرد، لە بەرۆك و قاچ و قولی رووتی نافرەت و کچە شارییەکانم دەڕوانی، بەڵام زوو هەستم بە گوناح و تاوان دەکرد و پەشیمان دەبوومەوە. من وای بۆ دەچووم، کە خودای گەورە بەرامبەر بەشارستانییەکان زۆر بەسەبر و تەحەمولە، جێدەستی تۆڵەی پێچەوانەی ناوایی نەدەبینرا، لەوێ خودا کوتوپڕ دەستی تۆڵەی دەگەیشتە گوناحباران.. ئاگری بەردەدایە خەلە و خەرمانی، یان نەخۆشی دەکەوتە ناو ئاژەڵەکان، یان گڕ بەردەبووە ماڵەکەیان و زەرەر و زیانی زۆری لێدەدان، جاری واش هەبوو کوڕێك کچێك یان گوناحبار خۆی، تووشی نەخۆشییەکی قورس و کوشندە دەبوو، خەڵکی ئاوایی بەگەورە و گچکەیانەوە، بەنێر و مێیانەوە، نوێژ و تاعەت دروست و لە خواترس بوون، نافرەتیان بە کەوای شۆڕ و بەسەرپۆش و چارۆکە و لەچکەکانیان جەستەیان دادەپۆشی و سینگ و بەرۆکیان لە نەزەری پیاوان دەپاراست، ئەوساکەش هەر مویتەلای دەردوبەڵا دەبوون، کەچی لەشار خەڵکێکی زۆر نوێژ ناکەن و رۆژوو ناگرن، جوێنی پیس پیس بە یەك دەدەن، ناو و ناتۆرەی ناشرین لەیەك دەنێن و تانەوتەشەر دەگرنە یەك، ئافرەت و کچە عازەبەکانیان قاچوقول رووت دەکەن، قژە شانەکراوەکانیان بەسەر شان و ملدا پەخش دەکەن، سینگ و بەرۆکیان بۆ نامەحرەم رووت دەکەن، دەرمان و سووراو و سپیاو لە روومەتیان دەسوون و ماڵەوماڵ دەگەڕێن، ئافرەتی وایان تیادایە دەرگای حەوشە دەخاتە سەرپشت و لەبەردەم بەلووعە ئاوەکەدا خۆی هەڵدەکات و پاوپووزی هەتا لەپە پەڕۆ رەنگاوڕەنگەکەش بۆ هاتوچۆکەرانی پێش ماڵ بەدەر دەخات و لە خوداش ناترسێت، لە ئاگری جەهەننەمیش سڵ ناکاتەوە، کەچی بەئەو هەموو گوناحەشیانەوە تا دێت جوانتر و شیرینتر دەبن!!

نازانم خودای گەورە چۆن ئەو شارەی نەفرۆ نەدەکرد؟ ئاخر مەلا دەیگوت: یارڕەبی تۆیە نەعووزوبیلا لەئەم شارەدا پاشماوەی قەومی لووتیش بێترس و خۆف وەبەر چاوی حوکمەتەوە تەراتێن دەکەن..

دووکاندار و کوتاڵفرۆش و چەرچییەکانی شار، کەمیان هەبوو قەرزی سەر جووتیارەکانیان بە دووقات و سێ قات نەنووسیبایە و لەوسەریش دانەوێڵە و مەڕوماڵاتیان بە نرخێکی هەرزان لەدەست دەرنەکردنایە.

گوندنشینە دڵساف و سادەکان، لە فڕوفێڵی شۆفێری پاسەدارینەکان بێبەش نەبوون. (قالە مویارەك)ی شۆفێر پاسەکەی لە نەفەری ئەو دەشتە ئاخنیبوو لە شارەوە کەوتبووە رێ، بۆ دیهاتەکانی بنەی جافایەتی، پاش عەسر گەیشتبووە نزیك دێی کانیماران بە دەستی ئەنقەس و بە

راوتەکبیر لەگەڵ شاگردەکەیدا پاسەکە پەك دەخەن و بە سەرنشینەکان دەڵێن: هیچ چارەمان نییە، ئەمشەو ئۆتۆمبیلەکەمان لەئەم دەشتە بەجێدەهێڵین و خۆمان بە پا دەگەڕێینەوە بۆ شار. خەڵکە هەژارەکەش بڕوایان پێدەکەن، لەپاس دادەبەزن و بەپێ دەشت دەدەنە بەر بەبێ ئەوەی لەڕوویان بێ داوای باقی کرێکانیان بکەن.. شۆفێر و سەکنی پاسە شڕ، هەر ئەوەندە چاوەڕێ دەکەن تا سەرنشینە گوندییەکان لە چاو گوم دەبن، ئیتر بە یەك سلف پاس دەخەنە گڕ و بەرەو دوا پایدۆزی لێدەکەن.

عەسرێکی درەنگ دەچنە (بن بوغاز)، بۆ عارەقخواردنەوە. شەویش بەسەرخۆشی دەخزێنە باوەش ژنە مەکر بازەکانیانەوە.

***

پشووی سەرساڵ بوو، چاوەڕوانی باوکمم دەکرد، بەڵام نەهات بۆ شار. (بلە شۆفرلێت) پاسەکەی لە نزیك بازاڕ و قەیسەرییەکەدا راگرت. (عەباسە کەچەڵی) دەڵاڵ، کە پیاوێکی کورتەباڵای گرژومۆن و تووڕە بوو، پاش نیوەڕۆ کەوتە ناو بازاڕ و بە دەم هاتوچۆوە بە دەنگی بەرز دەیگوت: پاسەکەی بنەی جاف ئەمڕۆ لە شار دەرئەچێت، سەعاتێکی تر لە شار دەرئەچێت، ئەوەی دەڕواتەوە بۆ ئاوایی با پەلە بکات و خۆی بگەیەنێتە لای دووکانەکەی (مەحموود عەلە باوەش ئاسنگەر)..

بەرلەچەند رۆژێك دەرگای قوتابخانە داخرابوو، منیش شەوانە خەونم بە ماڵی باوکم و راوە کوڕکوڕی دەشت و دەر و چاوەشارکێ و قەرەقەرەی کۆڵانەکانی بەر مانگەشەو و ئاشە تەنوورەی کانیمارانەوە دەدی. باوکیشم هەر نەهات، بۆیە ئیزنم لە مامم خواست و بەپەلە خۆم گەیاندە لای پاسەکە. وردەوردە گوندنشینەکان لە دەوری پاسەکە گردبوونەوە و کەلوپەل و تفاقەکانیان بارکرد و سواربوون. ئەو رۆژە من چەندێ پەلەم بوو، بلە شۆفرلێتی خاوەن پاس و شۆفێر پێچەوانەی حەز و ئارەزووم خاو دەجووڵایەوە. ئەوەندە خاوەخاوی کرد، نەفەرەکان کەوتنە گللەیی و گازاندە، بەهەرحاڵ عەباسە کەچەڵ کرێکەی لە نەفەرەکان وەرگرت و بەشی خۆی گلدایەوە، پاشان سواربووین و پاسەکە بە نەڕەنەر کەوتە رێ و لە شار دەرچوو.

نێوان قاتەکانی کفری تەنیا رێگایەك بوو، کە پاسە نەفەر هەڵگرەکان و جێبە ئەمریکی و لۆرییە بارهەڵگر و ماتۆڕ (تەپتەپە)کانی پیادا دەڕۆیشت. ئەو رۆژە چەند سەرنشینێکی پاسەکە دۆست و ناسیاو و میوانی ئێمە بوون. (بارام)ی کەمدوو و شارەزای شاری کەرکوك، یەکێك بوو لەوان. یەکێك لە نەفەرەکان رووی دەمی لێکرد وتی: ئێ.. بارام دەنگوباسی کەرکوك؟ ئەم تەنها بە (باشە) وەڵامی دایەوە. ئەو وتی: ئاخر چۆن باشە؟ کەمێکمان بۆ باس بکە.. ئەو وتی: باشییەکەی ئەوەیە بۆ ئێمەی کورد کرێکارییەکەمان دەست دەکەوێت، ئەو چەند رۆژە بە نۆڕسکان و دامە دامە لە سێبەری دیواری مزگەوتەکەدا ناکوژین..

+ ئەی دوایی؟

- دوایی.. ئەگەر خودا بۆم بکات، ئەم زستانە لە کانیماران بەسەر نابەم، بار دەکەم بۆ کەرکوک، خۆ ئەگەر هیچم لە دەست نەیەت ژن و منداڵەکانم لە قوڕکاری و دووسواخەی سەربان و مەلۆنانەوە رزگار دەکەم..

ئەو بە پێکەنینێکی تەوساوییەوە وتی:

+ هەڵدەکەوێت بارام بەگ هەڵدەکەوێت.. ئەگەر رۆژێك رێمان کەوتە کەرکوك خۆ سەگمان پێوە نانێیت؟

- بڕواناکەم پیاوی وەك تۆ رێی بکەوێتە کەرکوك.. تۆ و ئەمسالی تۆ لە نێوان مزگەوت و ماڵی موختاردا نەمرن، عومرتان بە زایع دەچێت..

سەرنشینی پاسەکە قڕوقپیان لێکردبوو، گوێیان لەئەو دوو دژە گرتبوو.

لەناکاوێکدا (حەمە حەسەن پەڵخە) هاتە دەنگ و وتی:

دە..دە..دە.. سەڵاواتی لێ ێ ێ بدەن!!

(حەمە حەسەن) کوڕەلاوێکی تێکسمڕاوی ئەسمەری مووڕەش بوو. هەروەکو خەڵکانی ئاوایی کە دەهاتە شارەوە جلوبەرگی پاك و پوختە و نوێی لەبەر دەکرد. ریشی پاك دەتاشی و بەرسمێڵی دەگرت. هەردەم ئاوێنەیەکی بچکۆلانەی لەبەر باخەڵدابوو بۆ هەل دەگەڕا تا لەناو ئەو ئاوێنە بچکۆلەدا لە خۆی بڕوانێت. بۆ دواجار کە هاتە شارەوە وەکو جاران رووی لە ماڵی مامم کرد، ئەوەی چاوەڕوان نەکراوبوو ئەمجارەی سەرنجی هەمووی راکێشا جەقەنە ریشەکەی بوو، (مامە حەمەعەزیز)ی قسە نەستەق و خۆشمەعشەر، کە چاوی پێکەوت لێیپرسی:

- حەمە حەسەن، ئەوە بۆ ریشەکەت نەتاشیوە، خێرە؟ خوانەکەردان کەسێکتان لێمردووە و ئێمە نەمانزانیوە؟

ئەو کە دەمی لە قسەکردندا تەتەڵەی دەکرد، وتی:

+ نە نەوەڵا..لاڵاڵا.. لالەگیان ئەوە شێخ هیممەت و بەرەکەتی حازربێ دەستی موبارەکی بەریشمدا هێ هێ هێنا..!!

مامەحەمە عەزیزی بەدەم زەردەخەنەیەکەوە وتی: کورە رۆڵە هەی عەمرت درێژ بێت شێخ رۆژی چەندجارێك دەس بە پاش و پێشی خۆیدا دەهێنێت، ئێ خۆ کفری خوای نەکرد جارێك دەستی بەریشی تۆیشدا هێنا!!

لەگـەڵ ســەلاوات لێـدانیٚ حەمــە حەســەندا، پاســەکە یــەك دوو ئەزنــەکی دا و کوژایــەوە. سەرنشینەکان قڕوقپیان لێکرد.

یەکێك وتی: بە خودا پەکی نەکەوێت باشە! شـۆفێرەکە بێـدەنگ بـوو. ســەکنەکەی دابـەزی. بۆنیتەکەی بەرز کردەوە. سەری بۆ ناو مەکینەکە شۆڕ کـرد و دەسـتی درێـژ کـرد، پـاش تاوێـك خۆخەریککردن بۆنیتەکەی دادایەوە و بە شۆفێرەکەی وت: هیچ نەبوو سـلفیٚ لێـدە، بەیـەك سـلف پاسەکە کەوتە ئیش و بەڕێ کەوت. چەند شەقاوێك ڕۆیشت و بەدەم ڕێوە چەند ئەزنەکێکی تری دا و دیسان کوژایەوە. نەفەرێك وتی: بەخوا وابزانم پەکی کـەوت.. شـۆفێرەکە دەرگاکـەی کـردەوە و دابەزی. شاگردەکەی گورج بۆنیتەکەی هەڵدایەوە. ئەو دەستی برد و بریٚ خەریك بوو، پاشان داوای لە سەکنەکەی کرد تا بچێتە شوێنی ئەو و سلفێك لێبدات، بەلاّم بێسوود بوو. بلە شۆفرلێت خـۆی هات و لە ژێر کوشنەکەیدا چەکوشێکی دەرهێنا و چووە ژێر پاسەکەوە و لەسەر پـشت ڕاکـشا. دوو سیٚ چەکووشی کێشایە شوێنێکی ژێر ئۆتۆمبیلەکەدا و هەڵسایە سەر پیٚ.

نەفەرێك وتی: بەخودا وابزانم ئەمجارە تەواو پەکی کەوت.

سەکنەکە وتی: خەمت نەبیٚ بلە شۆفرلێت ڕۆح دەکاتە بەر ئاسندا. پیرەپاس ئـەمجارە بـە یـەك سـلف کەوتـەوە کـار، نەفـەرەکان بەسـەر سـوڕمان و خۆشـحاڵییەوە لـە یـەکیان ڕوانـی، بـەلاّم دڵخۆشییەکەیان زۆری نەخایاند، پاسەکە لە پڕ گڕی گرت و کوژایەوە. بلە شـۆفرلێت وتـی: بـەخوا پەکی یەکجارەکی کەوت، وادیارە ئەمشەو لەئەم دەشتەدا بەجێیـدەهێڵم و دەگەڕێمـەوە بـۆ شـار. مقۆمقۆ کەوتە ناو سەرنشینەکانەوە، ئەوانەی کە گوندەکانیان نزیك بوو، دەیانتوانی بەپیٚ بگەنەوە ماڵ، بەلاّم دەبوایە خـەڵکی گونـدە دوورە دەسـتەکان کەلوپـەل و تفاقـەکانیان لـە کانیمـاران بـە دۆستێکی خۆیان بسپێرن و سبەی بە ولاّخ بیگوازنەوە. نەفەرەکان بە هەناسەی سـاردەوە یـەك لـە دوای یەك دابەزین و کەلوپەلەکانیان دا بە کۆڵدا، بەرەو کانیماران..

کە لە پاسەکە دوور کەوتینەوە بلە شۆفرلێت بانگی کـردن و وتـی: وەرن بـانیوەی کرێکانتـان بدەمەوە، بەلاّم کەس ئاوڕی لێنەدایەوە. کە شۆڕ بووینەوە بـۆ نـشێوەکە، گوڕەگـوڕی پاسـەکەمان ژنەوت، لەئەو بەرەوە کە ڕوانیمان وەکو نەخۆشێك فیٚ بەریدابێت پاسی تاین تیژ بەرەو شار دەڕوات و گەردەلوولێك بە دوایدا دەکشێت.



ئەو ساتانەی کە تەنیایی دێتە ژوورەکەمەوە دەمدوێنێت، کانی دەبێتە مەراقێکی گەورەم. بوێری و ژیریی و سەلاریی ئەو هەست و هۆشم داگیر دەکات، دواییش وزە و توانایەکی رۆحیم پێدەبەخشێت تا بیر لە دۆزینەوەی ماڵیان بکەمەوە. ئاخر بێمەلامەت و بێمەبەست نەبوو، ئەو رۆژەی وا بەپەلە و بەچەند رستەیەکی کورت و رەوان خۆی پێناساندم، ئەو پێیخۆش نەبوو لە چەقی ئەو رێگایەدا رابوەستێت و دەرگای پرسیارم بۆ بکاتەوە، ئەگەر ئەو رۆژە بواری پێمبدایە ئەوا لێمدەپرسی: چۆن دەمناسیت؟ لە کوێ منت دیوە؟ ئەی شەم ئێستە لە کوێیە؟ ئەی باوکت لە ژیاندا ماوە یا نە؟ بەڵام لەوانەیە دواپرسیارم ناڕاستەی نەکردایە، چونکە ئەگەر باوکی کۆچی دوایی نەکردبێ نەیدەگوت: (دایکم دەڵێت ئێمەش گەرمیانین).. هەروەها لە هۆ و ساڵ و نیشتەجێبوونیانم لەئەم شارە دەپرسی، بەڵام ئەم پرسیارەش وەڵامی هەیە و روونە، ئاخر لە سی و پێنج ساڵی رابوردوودا کێ لە شوێنی خۆیدا مایەوە؟ کێ بەدبەختی و ماڵوێرانی و کارەساتی بەسەردا نەهات؟

بەڵێ بۆ ئەوەی ئەم مەراقە لە دڵی خوم دەربکەم دەبێت سۆراخێکی کانی بکەم، بەڵام چۆن؟ خۆ بۆ من ناشێت بەسەر ئەو شەقامەوە رێگای لێبگرم و بیدەمە بەر رێژنەی پرسیار.. نا ئەو ئەحمەقییە ناکەم.

ئەو رۆژە ژیرانە ناونیشانی خۆی دامێ. ئەو بە مەبەستەوە پێیوتم: لە بەرێوەبەرایەتی.. فەرمانبەرم. جا کەوایە بۆ تەلەفۆنی بۆ نەکەم و ناونیشانی ماڵیانی لێوەرنەگرم.. تۆ بڵێیت (١٠٢) ژمارەی تەلەفۆنی ئەو بەرێوەبەرایەتییەی لەلا پەیدا نەبێت؟ هەروا چاك و ئاسانترە بە تەلەفۆن سۆراخی بکەم. دەچمە ژوورەوە دەرگاکە لە خۆم دادەخەم و دەست بۆ تەلەفۆنەکە دەبەم.

کانی و شەمی خوشکی هەر دەڵێیت سێوێکن و کراون بە دوو لەتەوە. بەرلەوەی کانی خۆی بناسێنێ پێم، من دووراودوور زۆر هەرزەکارانە لێمدەڕوانی و نەمدەزانی جگە لە جوانی و سەلارییەکەی چ سیحرێکی ترە وا بەئەو هێزە بۆ لای خۆی سەرنجم رادەکێشی، بەڵام ئێستە دەزانم بەرائەت و ئولفەتی شەمە، لە ئەقڵی شاراوەمدا دەمبزوێنێ، لەناو ئەم تاریکستانی رۆحەدا پەیدا دەبێت و وەکو چرا دیوارکۆکەی نیشتمانەکەی دایکم دادەگیرسێت و منداڵم

دەکاتەوە و دەمباتەوە بۆ ئەو رۆژانەی کە بە هەموو پاکی و بەرانەتەوە دەهاتە ماڵمان، بەدەم دەرگاکەوە رادەوەستا و دەتریقایەوە، بەچاو نیشارەتی بۆ دەکردم و دەیگوت وەرە دەرەوە، وەرە با برۆینە سەر سەکۆکە.. لەوێ لێومان بە مەحەببەت کەمێك تەڕ بکەین، دایکم بەدەم زەردەخەنەیەکی پڕ لە سۆزەوە پێیدەگوت: کچە هەی (عەرسوو) تۆ خەریکیت گەورە دەبێت، وابزانم ئەم منداڵە دەدەیتە فەلاقەکردنی باوکیدا.. کەچی شەم وەڵامی دەدایەوە و دەیگوت: میمکە، وەڵلا ئەوەندەی برایەکی خۆم خۆشمگەرەکە.. دەباشە ئێستە دەرۆمەوە، بەڵام بەخوا شەو دێمەوە.. ئەگەر ئێستە بەئەم گەورەییەم شەمی منداڵ، منداڵەکەی ئەوسا ببینمەوە پێیدەڵێم: کانی ببوورن، پێیدەڵێم: (شەم)ە گیان.. وەرە پەلم بگرە و بمبەرەوە بۆ کانیماران، بۆ سەر سەکۆی ئەو ماڵە پڕ لە بەرانەتە، کە لە سایەیدا ئولفەتمان بە یەکەوە گرت.. وەرە ئەم ژوورە تاریکەی رۆحم رۆشن بکەرەوە، من ئێستە پڕم لە تەنیایی، پڕم لە غەدری ئەم رۆژگارە سۆزانییە، تووڕە و وەڕسم لە ستایشی درۆزنانەی هاوڕێیەتی، تژیم لە ژەهری پێوەدانی زمانی نیفاق و قەڵەمی بەدگۆیی و دووڕوویی.. وەرە (ئەی خانمی گوڵ) هەر ئەمشەو بەتاڵم بکەرەوە لە هەموو سیفەتی پیاوانەی ئەم رۆژگارە و دووبارە دارماڵم بکە لە سادەیی، لە بێگەردیی، لە منداڵی، هەتا منیش لە زەمزمزەی دەمت دەسنوێژ بگرم و لە سێبەری رۆحتدا مەسحەفی رەشی چاوەکانت بخوێنمەوە، بمبەرەوە بۆ ئێوارەی ئەو رۆژە، کە خۆر ئاوا نەبوو بوو، گەشتینە ماڵ.

ئەو شەوە، شەوێك بوو لە شەوەکانی ئەو هاوینە، دەنگی قەرەقەرە و قریوەی منداڵەکان لەناو ئاواییدا بەرز بووەوە، من بەپەلە و بە ئەسپایی لە ماڵ دەرچووم و بەکۆڵانە تەنگەبەرەکەدا شۆڕبوومەوە. تریفەی مانگەشەو ناو ئاوایی و سەربانەکانی رووناك کردبووەوە، لە دەرگای حەوشەکەیان نزیك بوومەوە، روانیم ئەو پاڵی بە دیوارەکەوە داوە، کە زانی منم وتی: راوەستە.. زوو دێمەوە. خویکرد بە ژووردا و زۆری پێنەچوو گەڕایەوە، ئەو لێیپرسیم، کە ئایا ماڵمان دەزانێت لێرەم؟ وتم: نە.. وتی: دەباشە منیش بە دایکم وت ئەگەر نیشی پێمبوو ئەوا بەسەر سەکۆکەی بەرماڵەوە دانیشتووم، دەچینە سەر سەکۆکە و نزیك یەك دادەنشین. ئەو کاتە مانگ جێگای چێشتەنگاوی خۆری داگیر کردبوو، شەم وتی: ئەگەر تۆ نەهاتایەیت ئەوا من ئیزنم لە دایکم دەخواست و دەهاتم بۆ ماڵی ئێوە. بەسەر زەوییە رووتەکەوە دانیشتین. ئەو بەپەلە هەڵسا، خۆی کرد بە ژووردا، کۆنە فەرەنجییەکی هێنا و رایخست. ئینجا وتی: ئێ..

دەی باسی شار و مەکتەبم بۆ بکە، شار و مەکتەب خۆشە، کەنیشك لەوێ دەچێتە مەکتەب؟ دەدەی قسەم بۆ بکە..

من وتم: شار خۆشە و خۆشیش نییە.. ئەگەر ماڵمان بار بکات بۆ شار ئەوا زۆر خۆشە، مەکتەبیش ئەگەر ئەفەنییەکان بە دار لە منداڵ نەدەن ئا.. خۆشە. لەوێ مەکتەبی کوڕ جیایە و هی کچیش بەجیایە، بەڵام لە (متەوەستە) کچ و کوڕ تێکەڵاون. من ئەگەر ناجیح ببم ئەوا دوو ساڵی تر ئەچمە متەوەستە.

ئەو دەڵێت دەدەی قسەی خۆشم بۆ بکە. من دەڵێم:

+ جارێ نۆرەی تۆیە..

ئەو دەڵێت:

- دە باشە مەتەڵت بۆ دائەدەم بزانم دەیزانیت؟

ئەو مەتەڵ دادەهێنێت و من هەڵیدەهێنم. زۆربەی مەتەڵەکانی لەسەر مەل و باڵندە بوو، ئەوەیم بزانیایە دەیگوت ئافەرین، لە پای هەر مەتەڵێکدا کە دایدەهێنا و من نەمدەزانی گازێکی لەسەر خۆی لەناو لەپم یان لە گۆنام دەگرت و دەیگوت: ئەوە ئەو باڵندەیە بوو کە نەتناسی بۆیە دەنووکت لێدەدا. شەم سەری هەڵبڕی، تەماشای ئاسمانی کرد و وتی:

+ تەماشاکە هاها ئەو دوو هەسێرە (لەیل و مەجنون)ن.. یەژن ئەوان دوو دڵدار بوونە، زۆر یەکتریان خۆشویستووە، بەڵام بۆ یەك نەبوونە، بۆیە خوای گەورە هەردووکیانی کردووەتە هەسێرە و بردوویانییەتی بۆ ئاسمان. ئەوان بە ئەمری خودا ساڵی یەکجار بە تاقی ئەو ئاسمانەوە دەگەنە یەك و باوش بەیەکا دەکەن دوایش کە لێکجیا دەبنەوە، لەیل بەرەو گەرمیان و مەجنون بەرەو کوێستان دەچێ. ئەو دوو هەسێرە تەواو لێکنزیك بوونەتەوە، بەڵام نازانی کەی لێکدەئالێن و بەئەو ئاسمانەوە جووت دەبن، ئەزانی لە کاتی جووتبوونیاندا داوای هەرچی لەخودا بکەیت دەیبارێنێ بەسەرتدا.

یەژن جارێك کوڕەشوانێك بە دیار لەیل و مەجنوونەوە دادەنیشێت و شەوخونی دەکات، تا لێکدەئالێن، ئەو لە جیاتی ئەوەی لە خودا بپارێتەوە و داوای ژنێکی جوان و مەڕ و بزنی زۆری لێبکات دەڵێت: خوای گەورە بیکەرە خاتری گەورەیی خۆت و پاکی و بێگەردیی ئەو دوو دڵدارە، رۆحلەبەری زۆرم پێببەخشیت، بەیانی لە خەو هەڵدەسێت کە دەڕوانێت چ ببینێت باشە؟ تەماشا دەکات ماڵەکەی چمەی دێ لە ئەسپێ و کێچ، ئیتر بەئەو حاڵەوە ساڵ دەباتە

سەر تا دووبارە لەیل و مەجنون لێکدەناڵێن، ئەمجارە داوا لە خودا دەکات تا لە دەستی ئەو هەموو کێچ و ئەسپێیە رزگاری بکات..

لەئەو شەوەدا جارناجارێك بایەك لە شەماڵەوە هەڵیدەکرد و فێنکی دەکردینەوە، تاوناتاوێکیش زەنگی ملی ناژەڵێك، وادیار بوو بە شاخی خۆی دەخوراند دەلەرییەوە، دەنگێکی خۆشی دەدایە گوێماندا.

ئەو وتی: ئەمجارە نۆرەی تۆیە باسی قوتابخانەم بۆ بکە، باسی شار بکە.. منیش باسی بازاڕ و کۆڵان و شێتەکانم بۆ کرد، سەبارەت بە قوتابخانەکەم وتم:

- مامۆستایەکی تورکمانمان هەیە ناوی (فوئاد تەها)یە، ئەو مامۆستایەکی زۆر ناپیاوە رۆژێك بە دارە گرێگرێکەی دەستی، ناولەپی سوور و شین کردەوە..

شەم وتی: دەك دەستی بشکێ کوا ناو لەپت..

- من باسی زوو دەکەم خۆ ئێستە شوێن دارەکان دیار نییە..

+ قەیناکات با سەیری بکەم..

سەر ئەوی دەکاتەوە و لەپی راستم هەڵدەبڕێت و تەماشای دەکات دوایی لەپی چەپیشم بە هەمان شێوە بەرز دەکاتەوە و دەڕوانێت.. راستە ئێستە مانگەشەوە، بەڵام ئەگەر ناو لەپم شین و مۆریش بووبێتەوە ئەو نایبینێ. دەمی دەخاتە سەر لەپم وەك ئەوەی من لەپم نابێتە سەر دەمیدا، تا رێی قسەکردنی لێبگرم ئاوەها تەوس دەیباتەوە پاشان لەپم دەخاتە سەر رانی و ئەو لەپەکەی ترم بەرزدەکاتەوە لەگەڵ هەڵکێشانی هەناسەیەکی قوڵدا دەمی دەخاتە سەر، هەناسەکانی ئەوەندە بەتین بوو ناو لەپی گەرم دەکردمەوە، هەر دەتگوت ئەو فوانەیە، کە خۆم پاش دارپیاکێشانی مامۆستا دەمکردە ناو لەپم.

- مودیرەکەمان ناوی (خالید ئەفەنییە)، ئەو منی خۆشدەوێت، مامە مەلایشی خۆشدەوێت، چونکە رۆژانی هەینی بەسەر قەبری (موفتی) باوکییەوە قورعان دەخوێنێت. (شەمە) دەزانیت ئەو جارەکەی تر کە هاتمەوە بۆ ئاوایی خالید ئەفەنی پارەی دامێ تا هێلکەی بۆ بکڕم؟ دایکم پڕ بەیەك زەمیلە هێلکەی بۆ کڕی و من بۆم بردەوە بۆ شار، سی هێلکە بوو، کەچی ئەو وتی: بۆ بیست و نۆ هێلکەیە؟! مامۆستا کە پێیوتم هێلکەیەکی نوقسانە لەگیانی خۆم زۆر تەریق بوومەوە و دەمم چووە کلیلا و هیچم نەوت! شەمە ئەی تۆ نازانی ئەفەنییەکانی شار و منداڵەکانیان بەیانیان هێلکەورۆن دەخۆن. ئەو جارێك وتی: کوڕم بۆیە خۆشمگەرەکی، چونکە منداڵێکی ئاقڵ و زیرەکی..

شەم دەڵێت: مادام ئەو خۆشیگەرەکی منیش خۆشگەرەکە، ئەمە کێیە وا تۆی خۆشدەوێت.. ناوی چییە؟

- خالید ئەفەنی.. یەژم مودیری مەکتەبەکەمانە، ئەی گوێت لێمنەبوو باسی کێم بۆت دەکرد؟

+ دەی مادام ئەو تۆی خۆشگەرەکە منیش ئەومە قوربانی.

شەم ئەزنەکێك ئەدات و کەمێ لێمنزیك دەبێتەوە، بە ئاستەم رانی لە رانم دەخشێ و دەکشێتە دواوە.. پاش تاوێك بێدەنگی دەڵێت:

- ئێ؟ کێی تر خۆشتی گەرەکە؟

+ تەنیا (فوئاد تاها) منی خۆش ناوێت.. نازانم بۆ قینی لێمە؟ نا.. کەوتە بیرم مامۆستا (برایم عەجەم) گشت قوتابییەکانی خۆشگەرەکە.. ئەو پیاوێکی قسەخۆش و دەم بە پێکەنینە، دەڵێن کاتی خۆی کە "دارولموعەلیمین" تەواو دەکات حکومەت تەعینی ناکات و پێییەژن گوایە ئەو ئێرانییە بۆیە (جنسییە ئێراقی) پێنابەخشن، ناچار دەڵێت: من زوڵم و باوکی خۆم ناناسم.. ئەوساکە جنسییە ئێراقی بۆ دەردەچێت و دادەمەزرێ.. ئای چ پیاوێکی بە رەحم و قسەخۆشە.. شەمە، دەڵێن رۆژێك لە رۆژان سەری بۆ خوا نەناوەتە زەوی و رۆژوو ناگرێت و عارەقخۆریشە!! بەڵام زۆر پیاوێکی هێمن و دەمپاك و راستگۆیە، قوتابی هەرچەند لاسار و بێگوێ بێ، قەت بەدار لێینادات..

ئەو رۆژە من بەردێکم کێشایە سەر کوڕەکەیدا و خوێن بە تەوێڵیدا هاتە خوارەوە، (شەم پێدەکەنێ)، بۆ پێدەکەنی؟ بەو قورعانەی ها لەومزگەوتدا درۆناکەم شەمە.. لەگەڵ کوڕە تورکمانێکدا بوو بە شەڕمان و ئەو رۆژە خڕە بەردێکم تێگرت، بەڵام ئەوی نەپێکا و نووسا بە تەوێڵی کوڕەکەی مامۆستا برایمەوە، سەرەڕای ئەوەش، کە بردمیان بۆ لای، دەستی هێنا بەسەرمدا و وتی: قەیناکا کوڕم، بەڵام جارێکی تر بەردەفڕکێ نەکەیت، شەڕیش نەکەیت، ئەگینا دوایی لێتخۆش نابم.. بەڵام ئەو ئەفەنییە لووتبەرز و جوێنفرۆشە.. فوئاد تاها بانگی کردم و بە دار ناو هەردوو لەپی شینومۆر کردەوە.. نازانم ئەو رۆژە چۆن پێشەی دەست و پەنجەکانم نەشکا.. من نازانم ئەو رۆژە ئەگەر قوتابییە سەرشکاوەکە کوڕی ئەو بوایە چی بەسەرا دەهێنام؟!

شەم هەر لەپێکمی خستە سەر رانێکی و بەهەردوو دەستی قورساییەکی خستە سەر و وتی:

- ئەی تۆ چیت کرد وەختێك ئەو کافربابە لێی ئەدایت؟

+ لە پێشدا دانم بە خۆدا گرت، کەچی ئەو شێت و هارتر بوو، پاشان وامهەست دەکرد کە لەپم لە دەستم جویّ بۆتەوە، بۆیە گریام، کاتێکم زانی مامۆستا برایم عەجەم هات و لە ژێر چنگی دەری کردم..

شەم هەر بە دانیشتنەوە باوەشی پیادا کردم و توند نووساندمی بە سنگی خۆیەوە، یەك دووجار گۆنای لە گونام خشاند و بەریدام..

روانیم مانگ بە تاقی ئاسمانەوە جوولەی لەخۆ بریوە، هەر دەتگوت چاوی خودایە تریفەی دەهات و بەسەر سەکۆی ئەو بەرماڵەوە لە ئێمە دەڕوانێت.. من باوێشکێکی قوولّم دا، ئەو وتی: شل بوویتە وا دیارە خەوت دیّ؟ شلەشاری هەڵسە، بچۆرەوە بۆ ماڵ.



## (١٥)

من هەر بە پێوە راوەستابووم. دایکم بەلای دەرگاکەدا رووی وەرچەرخاند، چاوە ماندووەکانی کەمێك کردەوە و وتی:

هەر بە پێوەیت کورم؟ ماندوو بوویت، دە دانیشە.. دووبارە چاوم بریبە رووخساری و بەبێ تروکاندن لێمروانی. ئەو چاوەکانی زیاتر کردەوە، برۆکانی گەورەتر و پرتر دەیاننواند، هەر دوو کونەلووتی زۆرتر کرانەوە و مووی رەش و سپی درێژ و ئەستووری تیادا دەبینرا و رووخساری پانوپۆرتر و تەواو دەنگی نێر بوو. یەك دوو بۆڵەی کرد و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بەلای راست و چەپی قەرەوێڵەکەدا چاوی گێرا.. دیار بوو کەمێك هۆشی هاتبووە سەرخۆ، بۆیە وتی: ئای رۆڵەرۆ.. ئای ماڵکاول و رەنجەرۆ خۆم.. پێمووت چۆنی؟ ئەو تەنها تەماشایەکی کردم و هیچی نەوت. سێهەمین کیسەی ئاوە هەڵواسراوەکە لە تەواو بووندا بوو، دکتۆرە ئافرەتەکە لە دەرگای قاوشەکەوە سەرێکی کێشا و من بەپەلە هەڵسامە پێ، تا سەرنجی بۆ لای خۆم رابکێشم، یان راستتر بڵێم بۆ لای ئەم نەخۆشە تاقانەیە، بۆ لای ئەم رۆحە شەکەت و بریندارە، کە تك تك زووخاوی لێدەچۆڕێ، تا بێت بۆ لای ئەم کۆتەرە دار بەرووەی کە هەرچی لق و چڵ و چرۆی پێوەبوو (سەدام حوسێن) هەر هەمووی بە تەوری (ئەنفال) داپاچی و سووتاندی.. تا بێت بۆ لای ئەم پیرە ئەسپەی کەوا دەسکەوتەکانی (مۆدێرنیتە) لە سمکۆڵان و حیلەی خستووە و بەسەر ئەم چوار پایەوە چوارمێخەی کێشاوەتەوە.

دکتۆرەکە لێی نزیك بووەوە، بە هێمایەکی ئەو، قوڵیم هەڵماڵی و بە پێوەرەکە، پاڵەپەستۆی خوێنی پێوا و ئینجا لێدانی دڵی ژمارد و لەپی خستە سەر تەوێڵی، تەماشایەکی ئاوە هەڵواسراوەکەی کرد و وتی: ئاوی لەشی زۆر کەمیکردووە، بۆیە دەبێت چەند کیسە ئاوێکی تری بۆ هەڵبواسین.. تەندروستیی خراپ نییە و مەترسە، ئای ئەو قسانەی بۆ من چ مژدەیەکی خۆش بوو.. تەماشایەکی چاوە رەش و روومەتە رەنگ مێوژییەکەی ئەو فریشتەیەم کرد و تەنها بەسەر دانواندنێك سوپاسیم کرد. ئەویش زەردەخەنەیەکی بۆ ئەو پیرەبەرانە کرد، کە لە چەقۆی قەسابەکەی عۆجە رزگاری ببوو.

ئەو رۆژە لە (نوگرە سەلمان) گەڕایەوە و من لە چاوەڕوانیدا بووم، کە چاوم پێکەوت روانیم جەستەی وشکهەڵهاتووە و هەرچی ئاو و گۆشت و بەزی هەیە، لەوێ تێکەڵ بە ئەو گەرما پرووکێنەرە و لمی بیابانە بووە و تەواو پێستی جەستەی بە ئێسقانە ئەستوورەکانییەوە نووساوە، بۆیە بەپەلە

گەیاندمە نەخۆشخانەی (کەلار). ئەو شەوە تا درەنگانێک چوار کیسە ئاویان کردە لەشییەوە، ئەوساکە تەواو هۆشی هاتەوە.

خاڵۆم سەرێکی جووڵاند و چاوە شێتەکانی هەڵبڕی. پێموت: خاڵۆ گیان چۆنی؟ ئەو وتی:

+ باش ماوە رۆڵە گیان؟ باش نیم.. پاشان پێڵووەکانی لێکنا، وامزانی دەنوێت، تومەز نوقمی بیرکردنەوە بووە.. کەمێکی پێچوو چاوی هەڵهێنایەوە، ویستی وەکو چاوەکانی پێش ئەنفال، کە تووڕە دەبوو، پڕیان بکات لە شەیتان و شێتانە هاوار بکات و بنەڕێنێ، بەڵام پێینەکرا و ئەزنەکێکی دا، من دەستم خستە سەرشانی و نەمهێشت، لەپم هەر بەسەر شانییەوە بوو، پێموت: هێز مەدەرە خۆت و مەجووڵێ، با کانوولەکە ئاوت نەکا.. بە قسەی کردم و هێور بووەوە. دووبارە پێڵووەکانی لێکنایەوە. زۆری پێنەچوو کردنییەوە و بە وردی لێیڕوانیم، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی:

- برا..

وتم: خاڵۆ گیان..

ئەو پرسی: (ئازادی فەقێ عەلی)یان کوشت؟

وتم: بەڵێ کوشتیان..

ئەو پاش کەمێ بێدەنگی وتی:

- ( کەلە) کوشتی؟

+ وا یەژن..

ئم ئم.. ئمێکی کرد و بەردەوامی بە پرسیارەکانی دا، وتی:

تۆ وای بۆ دەچی؟

من وەڵامم نەبوو!

پاشان وتی:

- باشە کوڕم پرسیارێکی تر..

+ بەڵێ لالە گیان فەرموو..

- خوا هەیە؟

+ ها.. چۆن نییە؟

ئەو دوو سێ چوک چوکی تێکەڵ بە زەردەخەنەیەکی تەوساوی کرد و وتی:

- نە خوا نییە.. من یەژم نییە!! ئەگەر هەشبێت ئەوا (..).. ئاخر چونکە خۆی منداڵی نییە بزانە بەزەیی بە منداڵەکانی مندا هاتەوە؟

من وەکو (حەوجۆش)ەکەی ئەوسای (ئەنە نازە)م کولاّم.. سەرم بەرز کردەوە و چاوم پڕ بوو لە فرمێسك.. ناخم تژی لە داخ و حەسرەت و قین. ئالەوێدا (وەخ رۆڵە رۆکەی ئامەی خالۆژن و فیزاح و قیژەقیژی هەردوو کچە عازەبەکەی.. گریان و کڕووزانەوە و حەپەساوی حەمە و عەلەی کوڕە کێوی و منداڵ.. هوڕژمیان کردە ناو مێشکمەوە، هەر وەکو ئەوەی بەسەر شارە مێروولەیەکەوە خەوتبێتم و دوو کەڵەمێرووله لە هەردوو کونی گوێچکەمەوە چوبێتنە ژوورەوە و خەریکی هەڵکۆڵینی مۆخ و کەللەم بن، ئاوەها کەللەم هاژەی هات و سەرم قورس بوو، چاوم بڕییە ئەو دڵۆپە ئاوانەی کە تك تك لە کیسە نایلۆنەکەوە دەتکانە خوارەوە و بەنێو دەمارە لاستیکەکەدا دەڕۆیشتن و لە کانوولەکەوە تێکەڵ بە ئەو خوێنەکەمەی لەشی دەبوو، کەمێك سەروتر روانیم، دایکم چاوی لێکناوە و خەوی لێکەوتووە..

دوای ئەوەی چەند کیسە ئاوەی کە کردمان بە لەشییەوە، رەنگ و بۆی پێش نەخۆشییەکەی بۆ روومەتە چرچ و لۆچەکەی گەڕایەوە. ئەو شەو و رۆژە بە زۆر شەربەتی مێوژ و شۆربامان بە کەوچك کرد بە دەمییەوە، بەڵام دوایی بە تەواوی لە خواردن و خواردنەوە کەوت.

(سوعاد) ئەو خوشکە شیرین و بەجەرگەم، کە لە شارەزوورەوە بە دەم نەخۆشییەکەی دایکمەوە هاتبوو، لە هەڵسانەدا هاتە دەرەوە و پڕ چاوەکانی لە فرمێسك بوو، وتی: ئەمجارە دایکم رۆح دەرناکات و دەمرێت..

(خالۆ مارف)یش وەکو دایکم پاش خواردنی یەك دوو کەوچك مرخاو نیشتیەهای بەسترا و زۆری نەبرد مرد..

ئەو عەسرە دایکم خەوی لێدەکەوێ، لە خەونیدا دوو کەسی سپیپۆش دێنە سەردانی، یەکێکیان گوڵێکی سووری گەش و تەڕی بەدەستەوە گرتووە، ئەویتریان پشتوێنێکی سپی گوڵگوڵی لە پشت بەستووە، ئەویان لەلای دەستی ڕاستەوە و ئەمیان لەلای چەپەوە دادەنیشن تێرتێر هەردوو دەستی، چاوەکانی، هەردوو کوڵمی ماچ دەکەن، وەکو رەشەرەیحانە بۆن دەکەن بەپەرچەمییەوە، ئەو پێیاندەڵێت:

کوڕەکانم یا خوا بە خێر بێن ئەوە بۆ دیار نین بۆ ئەوەندە بێڕەحم بوونە؟ ئەوان لەگەڵ داوای لێبوردندا دەکەونە دڵنەواییکردنی و خولکی دەکەن تا بیبەن بۆ ماڵەکەی خۆیان بۆ ئەو ماڵە هەمیشەییەی کە دایکم پێیدەڵێت: (مەغریبسان).. پێیدەڵێن: دایە گیان ئەگەر رازی بیت ئەوا ناهێڵین یەك هەنگاو چییە بە پێ بڕۆیت.. بە نۆرە دەتگرین بە کۆڵەوە یان دار تەرمێکت لە بەلاَلۆك و

سەرینێکت لە رەشمەرەیحانە بۆ دەبەستین لە ئەو رەشمەریحانەیەی کە خۆت بە جوانی هەردەم چەپکێکت لێدەکردە توێی پۆشینەکەتدا، وەك کەژاوە دەتخەینە سەرشان و هەتا ئەویێ راناوەستین.

ئاخر ئەم دوو کورەی خۆشەویستی خودان و (شەهید)ن.. ئەوان ئێستە داوای هەر چی لە خودا بکەن بۆیان فەراهەم دەکات.. ئەم دوو شەهیدە مافی ئەوەیان هەیە بۆ گواستنەوەی دایکیان داوای بووراقێکی لێبکەن، بووراقێك لە وێنەی ئەو دولدولەی سەر دەرگای سنوقە دارینەکەی ئەوساو دایکم.. ئەو سنووقەی هەر کە دەمی دەکردەوە نیشتمانەکەی پڕدەکرد لە بۆنی سمڵ و میخەك و رازیانە.. بەلێ دولدولێك وەك ئەسپەکەی ئیمامی عەلی، یان ئەسپێ لە شێوەی ئەسپە بۆرەی کوێرئۆغلی. ئاخری دایکیان پیرازی ناکرێت.. ئەو پێیاندەلێت: توخوا کورە شیرینەکانم لێمگەرێن، بە خودا دەزانم لەئەو رێگاویانەدا دەمرم و دەبمە خەفەتیش بۆ ئێوە. کەلار لە کوێ و هەولێر لە کوێ! رێگاکە دوورە دوور! لێمگەرێن با بەئەم دەردی خۆمەوە بتلێمەوە تا دەمرم.

دایکم سیاسی نەبوو، بەڵام ئەم قسانەشی کردبوو، ئەوان پێیدەلێن: مادام لەگەلماندا نایەیت دەپێمان بلێ حەزت لە چییە؟ ئا دەزانین حەزت لە خواردنی میوەیە، هەر ئێستە یەك سینی میوەی رەنگاورەنگت بۆ دەهێنین.. دایکم لە خەونەکەیدا دەروانێت یەك سینی میوەی لە پێشدا دانراوە.

(سوعاد)ی خوشکم بە دیار دایکمەوە بوو، کە خەوبردبوویەوە. ئەو وتی: دایکم وەکو ئەوەی شت بخوات دەمی دەجوولاند، کە لە خەوهەلسا پێیوتم: دووکەس هاتنە لام و یەك سینی میوەی جۆراوجۆریان نایە بەردەستم و خەریك بووم دەمخوارد، بەلام زاقوزیقی مندالەکان بە ئاگایان هێنام.. رۆلەگیان ئیستە هەست بە نیوە تێرییەك دەکەم..

ئێستە ئەم نەخۆشە دلپڕ لە دەرد و کەسەرە، کە لە ئەم دونیایەدا بەبێ بۆکرووز و بۆسۆ، تاسەر ئێسقان سووتاوە و پشتی داوەتە سەر دوو سەریندا و گوێ لە قسەوباسی کچەکانی دەگرێت.. خۆیشی کەم کەم بۆیان دەدوێت، ئەو سەرەرای ناساغییەکەشی بەئەو تەمەنە درێژەوە، کە قسەخۆش و بەتامە پڕ لە بەرانەتەکانی ژن و پیاوەکانی ئەوسای گوندی کانیمارانی دەخەینەوە یاد پێدەکەنێت و خێل دەبیاتەوە.. بەدەم پێکەنینەوە کۆخە دەیگرێت، ئەوەند دەکۆخێت روومەتی شین و مۆر هەلدەگەرێت، بەپەلە و لەسەریەك دەلێت: وەی وەی باوکەرۆ، کەرەسکۆم بڕیێ وابڕا، وەی وەی وەی..

رۆلەکانم ئەمشەو کەمێك خەو چووە چاوم و باوکتان هاتە خەوم، هەر ئەتوت پیاوەکەی ئەوساکەو کانیمارانە، ئەو پێیوتم: ئافرەت هەلسە با برۆین.. وتم: بۆ کوێ کورە لاچۆ لاچۆ، بەخوا نایەم، کورەکانم باوکتان وازم لێناهێنێ.

***

( ١٦ )

دونیای ئەوسا و منداڵیم لە مەودای بینینی چاو، کەمێ فراوانتر و گەورەتر بوو. دونیایەك بوو پڕ لە ترس و دڵەڕاوکە و مەرگ. بیستنی بەردەوامی وشەی (مەرگ) یا (مردن) بۆ منداڵێکی ساوا، ترسناك و تۆقێنەرە، بەڵام بۆ مرۆڤێکی کامڵ و ئیماندار لەوانەیە فڕندەیەکی ئێسك سووك بێت و بە دووباڵی دڵنیاییەوە بیباتەوە لای خودای خۆی. بۆ ئەو بەهەشتە پڕ لە ناز و نیعمەتە، کە هەردەم دۆعا دەکات خودا بیکات بە قسمەت و نسیبی. لە وەخت و ناوەختدا هەردەم گوێم لێدەبوو، دەیانگوت: مرۆڤی ئیماندار دایم خوای لەبیرە، ئەوەی لە خودا غافڵە بێشك کافرە، کەسی لەخواترس هەردەم مردنی لە بیرە، مردنی پاك و چاك، ئەگەر خودا بیکاتە نسیبی بەنەی خۆی، گەورەترین نیعمەتە.

لە یەکەمین شەڕی قاتەکەی کفریدا، لە ساڵی (حەرەس قەومی)یەکە، باوکم وەکو بەرگری میلی بەشداری تیاکرد، کە هەواڵی شەهیدبوونیمان پێگەیشت، لە ترسی سوپا و حەرەس قەومیدا ناواییمان چۆڵ کرد و پەنامان بردە بەر ئەو هەردەوهەڵەتە. ئێمە لە (کەلۆزەکەی بارام)دا بە نیگەرانییەوە رۆژمان دەگوزەراند. (سەرکەوت)ی کۆرپە نەخۆش کەوت. دایکم گوێرەکەیەکی کردە مەولوودی پێغەمبەر و بەدەم گریانەوە نییەتی کرد و وتی: خودای گشت عالەم ئەو گوێرەکە سوورە مەولوودی پێغەمبەر بێ ئەم پیاوە بەسەلامەتی بێتەوە ناو منداڵەکان و ئەم کۆرپەیەشم چاك بێتەوە، پێغەمبەری خودا ئەم مەولوودەم لێقەبووڵ بکەیت..

رۆژانە لەبن ئەو کەلۆزەدا بەدەم لانك راژەندنی کۆرپەکەیەوە، لۆرەلۆری دەکرد و دەگریا، بە دەنگێکی پڕ لە سۆز و خرۆشەوە دەیگوت:

دەترسم بمرم قەورەکەم غاربێ — قەورکەن لە دەستم گەلێ بێزاربێ
دەترسم بمرم لە بۆرەبانێ — قەل و داڵ بمخوا کەس پێمنەزانێ
دەترسم بمرم هەر وەم دەردەوە — سەر بنێنم وەلای سەنگی سەردەوە

کە لە گریان و لۆرەلۆرەکەی دەبووەوە، بەدەم هەڵکێشانی هەناسەیەکی قووڵی سووتێنەرەوە دەیگوت: وەخ وەخ وەخ، رۆڵە گیان وەخخخ.. خوا دەخیلتوم خوا هاوارە..

لەگەڵ وەخ وەخەکەیدا من سەری دونیام لێدەهاتەوە یەك و خەریکبوو زارەتـەرەك بـبم. جەستەم گەرم دادەهات وامهەست دەکرد، هەر ئێستە گڕم تێدەچێت، هەر وەکو ئـەوەی تـۆ دەستت کردبێت بەدەممدا و چنگت لە دڵم بەند کردبێ ئاوا دڵم دەگوشـرا، مـنی منـداڵ لـە ترسا جێ نەبوو خۆمی تیا بگرم..

چەند رۆژێك بەسەر شەڕی قاتەکەی کفریدا تێپەڕی و کەسێك نەبوو سـۆراخێکی بـاوکم بکات، هەموومان لە فەزایەکی ترس و چاوەڕوانیدا دەژیاین، تا عەسرانێکی درەنگ بـاوکم لەناکاودا پەیدا بوو، خۆی کردە ناو کەلۆزەکـەدا، ئەوسـاکە خۆشـیی و شـادی کەوتـە نـاو ماڵمانەوە، بەڵام پاش دوو رۆژ (سەرکەوت)ی کۆرپە لە کۆشی دایکمدا وەکـو کەنارییـەکی نەخۆش، دو سێ جار دەمی دا بەیەکدا و مرد..

* * *

لەسەردەمی منداڵیمدا دایکم زۆرجار باسی دوورە وڵاتی و مردنی پاك و چاکی لەناو قەوم و خوێشدا بۆ دەکردین. ئاخر ئەو تەنها دێکەی بە وڵاتی خۆی دەزانی، مەبەست لە (قەوم)ەکەشی تەنیا برا و کەسوکارەکەی بوو.. هەر بۆیە ئێستە لێرە لە (هەولێر) دەڵێت: کوڕەکانم زەوی لەهەر کوێ بێ هەر زەوی خودایە، بەڵام گۆڕ غەریبیش ناخۆشە، توخوا ئەگەر مردم بمبەنەوە بۆ (کەلار) و لەوێ لەلای کوڕەکانم بە خاکم بسپێرن..

دایکم بەر لەئەم نەخۆشکەوتنەی جارناجارێك لە جێدا دەکەوت و کە دەچوومە سەردانی دەمدواند، چونکە دەمزانی زۆرجار هۆی ناساغییەکەی دەروونی و ئەنجامی تەنیایی و خەفەتخواردنە، ناهەقیشی نەبوو.. ئاخر جگە لە دوو کوڕی شەهیدی، شەڕی ناوخۆیش کردبووی بە دوو لەتەوە، لەتێکی لێرە و ئەو لەتەکەی تری لە گەرمیان بەجێهێشتبوو. لێرەش هاوڕێ و هاودەمی نەبوو قسەی دڵی خۆی بۆ بکات و بە کوڵ داخی دڵی خۆی بۆ هەڵڕێژێ، بۆیە ناخی پەنگی دەخواردەوە و لە جێدا دەیخست.

ئەو رۆژە چوومە سەردانی، لەبەر دەرگای حەوشەدا باری تەندروستیم لە ئیدریسی برام پرسی. ئەو وتی: خراپە و لە من پڕ و تووڕەیە!

کە چوومە ژوورەوە، روانیم وەکو پیشەی هەمیشەیی جێگاکەی رووەو دەرگای حەوشەکە بۆ راخرابوو، تا چاوی لە دەرەوە بێ، ئەو لەسەرلا راکشابوو، هەردوو ئەژنۆی نابوو بە سینگییەوە. چووم بە تەنیشتیەوە دانیشتم و وردە وردە ویستم بیدوێنم. من زۆرم هەوڵدا بیهێنمە گۆ، بەڵام بێفایدەبوو، دەستیم گرت لەپێم خستە ناو لەپمەوە و وتم: دایە چۆنی؟ کوێت دێشێ دایە؟ دە قسە بکە بزانم چیتە؟

ئەو جووڵەی لەخۆ بڕیبوو، ورتەی نەدەکرد.

وتم: دە دەی دایە.. بڵێ بزانم کوێت ژاندەکا.. ها دە قسەیەك بکە.. من لە پەسا پرسیارم لێدەکرد، بەڵام ئەو تەنانەت تەماشایشی نەدەکردم. دەمزانی لە پزیشك و نەخۆشخانە زۆر دەترسێ، هەر لەئەم رێگایەشەوە دەتوانم بیجوڵێنم و بیهێنمە قسە. بۆیە وتم: دە باشە مادامۆایە با بتبەم بۆ لای دکتۆر، یا بتبەم بۆ خەستەخانە و لەوێ بتخەوێنم..

هەر کە گوێی لە دکتۆر و خەستەخانە بوو یەکسەر جوولایەوە و هاتە گۆ. بە تووڕەییەوە وتی: نە..نە دختۆری چی نایەم.. نایەم، لیمگەڕێ با بمرم.. با بمرم.

وتم: دایە گیان یا خوا نەمریت، بۆ بمریت؟ بە خوا هەر پڕ چنگێکت بمێنێ دەتخەمە ناو قەفسێکەوە و وەك بولبول بەخێوت دەکەین، دەی کە وایە برێ قسەم بۆ بکە.

- قسەی چی بکەم؟ نازانم چی بێژم، هیچم لەبیر نییە.. ئاخر کوڕم دەمم گەنی خۆ خێرەومەنێك نییە بێتە لامەوە و دەمەتەقێیەکم بۆ بکا و دوو قسەی بۆ بکەم. کوڕم من ئاخرشەڕم ئاخرشەڕ، خوا خراوی بۆم کردووە.. ئەی نەتبیستووە یەکێ وە یەکێ یەژی خوا خراوت بۆ بکا.. تۆ بێژە دایە خوا بتکوژێ بەشکو لەکۆڵ ئێوەش ببمەوە..

+ نە..نە یاخوا نەمرێت بۆ لە کۆڵ ئێمە ببێتەوە، خوانەخواستە هیچ بووە؟ شتێك رووی داوە؟ کەس بێتاقەتی کردووی؟

دایکم کەمێك دەم دەنووقێنێت و بە دوو چاوی پڕ لە حەسرەتەوە بەرەولای ئیدریس نیگا دەکات. من دەزانم دیەوێت شتێك دەربارەی خۆی بلێت و داخی دڵی بە ئیدریس هەڵبڕێژێ، بەڵام جارێ بواری نادەم و دەکەومە قسە. بیرەوەرییەکانی خۆم و کانیمارانی بۆ دەگێڕمەوە، ئەو گوێ دەگرێت، بەڵام هیچ ناڵێت، بۆیە دێمە سەر باسی ئەو کەسایەتییانەی کە ئەو رێز و خۆشەویستی زۆری هەیە بۆیان. سەرەتا یەك دوو قسەی خۆشی (مامە حەمە عەزیز)ی بۆ دەگێڕمەوە و دەڵێم: ئەوە تۆ (خوا کەرەمی گولەڕەش)ت لەبیرە؟ ئەو پیاوەی کە ماڵی باری کرد بۆ کفری و ژنبەژنی لەگەڵ (مامۆستا و ئیمامی ) مزگەوتی شارەکەماندا کرد؟ ئیتر لە مزگەوتدا بە شانازییەوە نزیك مامۆستا دادەنیشت.. پیاوێکی زۆر سوکەڵە و ئەسمەرێکی تۆخ بوو.. (دایکم هیچ ناڵێت)..

من لەسەر گێڕانەوەی قسەکەم بەردەوام دەبم و دەڵێم: عەسرانێك مامم هاتە مزگەوت بۆ دەسنوێژگرتن، کڵاشەکانی داکەند و جوتێ قاپقاپی کردەپێوە، بەڵام بچکۆلە بوون و بە پێیەوە نەچوون، بۆیە دایکەندن و جوتێ تری لە پێ کرد، بەڵام ئەوانیش هەر گچکە بوون، دیسان جوتێ تری لە پێ کردەوە، کە چی ئەوانی تریش هەر بە پێی نەکردن، بەڵام بە ناچاری نوکی پێی لێگیر کرد و لەبەرخۆیەوە وتی: بەخوا ئەم قاپقاپانە بۆ پێی من نەکراوە، بەڵام حەق لا ئیلاهە ئیلەللا..

ئێ کێ پرکێشیی ئەوەی دەکرد قسە لە قسەی ئەو پیاوە وریا و بەهەیبەتەدا بکات؟ چەند کەسێك لە مەجلیسی سەرسەکۆی مزگەوتەکە لایان کردەوە، بەڵام هیچیان نەوت کەچی (خوا

کەرەمی گولەڕەش)، کە هەرگیز کەس بەئەو ناوەوە بانگی نەدەکرد هاتە وەڵام و وتی: جا قاپقاپەکان بە پێت ناکەن بچۆرە لای دارتاش کەمێ ئەو پێ ئاوزەنگی دارانەت بتاشە!!

مامم بەدەم ڕۆیشتنەوە بەرەولای حەوزی ئاوەکە هەنگاوی هەڵدەهێنا و قۆڵیشی هەڵدەماڵی، کە ئەو قسەیەی بیست لایەکی کردەوە و تەماشایەکی مامۆستای مزگەوتی کرد؟ ئینجا بە تەوسەوە لە کابرای ڕوانی و وتی: بەخوا ئیتر چ بێژم، خواکەرەمی گولە.. چەرموو.. (خەڵکەکە دایانە قاقای پێکەنین).

دایکم زەردەخەنەیەکی کرد و هیچی نەوت، بۆیە من بەردەوام بووم..

دایە ڕۆژێك چوومە لای شێخ حەسەن، لە کەلار، بۆ کلاش کڕین، ئەم قسەیەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش باسی قسەیەکی (مامم)ی کرد وتی: ڕۆژێ مامەحەمە عەزیز لە دۆڵی قەرەداخ بوو بە میوانی ماڵی باوکم. ئەو کەرێکی درێژەی دابووەبەر و دەیویست مامەڵە و سەودایەکی پێوە بکات. کابرایەکی خەڵکی ئاوایی کەوتە سەوداوە لەگەڵیدا تا کەرەکەی لێبکڕێت، لە سەودا و مامەڵەدا (مامەحەمە عەزیز) بە نیازی ڕەواجدانی هاتە شان و باڵی کەرە درێژەدا وتی: برا ئەگەر تۆ بزانیت ئەم کەرەی من لە چ ڕەگەزێکە، ئەوا سێ و دووی لێناکەیت و لە دەستی خۆتی نادەیت، ئەم کەرەی من کوڕی کەرە مچاری فلانەکەسە و باپیری کەرێکی بە ناوبانگی ماڵە جووتیارێکی عەشیرەتی داودەیە، پشتاوپشت دەچێتەوە سەر ئەو کەرەی کە خاوەنەکەی هەر بۆ جوانی و دەنگخۆشی زەڕینە بەسۆزەکەی لەبەر ماڵدا دەیبەستەوە و جۆی ڕووتی بە ئالیك دەکردە بەر، زەڕینەکەی زەڕین نەبوو هەر وەکو کەو دەیقاسپان، ئەم کەرە دەنگخۆشانەش بە ڕەچەڵەك دەچنەوە سەر کەرەکەی حەزرەتی عوزێر پێغەمبەر، ئەم کەرەی من کەر نییە و..

شێخ حەسەن وتی: باوکم لەناکاودا هاتە دەنگ و بەخەڵکەکەی وت: کوڕینە بەسە بەسە بیبڕنەوە، بە ئەو خوایە قەسەم ئەگەر زۆری لەسەری بڕۆن حەمەعەزیز کەرە درێژە دەکاتە نەوەی باوەگەورەی من..

دایکم ئەگەر چی زۆر کەیفی بە گوێگرتن و خستنەوە بیری ئەو جۆرە باسانە دەهات، بەڵام هەر لەبزەیەکی سارد بەولاوە پەرچە کردارێکی نەنواند..

ئینجا وتم: ئەوە تۆ (هەسەنۆکە) و (میمکە خەجەی هاوسەر)یت لەبیر نییە؟ ئەی (مامە حەمید) و (میمکە شەمە)ی خێزانی؟ ئەی (ڕەحیمە ملکە و ژنەکەی)؟ ئەوە دایە ژنەکەی ڕەحیمە ملکە ناوی چی بوو؟ (ئەو دەڵێت: نازانم)، من لە ئاڕاستەکردنی پرسیار بەردەوام دەبم

و دەڵـێم: ئـەی دایـە ئـەو ساڵەشـت هـەر لـەبیر نییـە، کـە سـەیدەکانی کـاکوڵ بـە بـەرەو حوشترەکەیانەوە هاتنە ئاوایی و تۆ دەتگوت حوشتر مـەڕی پێغەمبـەرە و سـەیدیش ئـەولادی ئەون، بۆیە دەبێت حورمەتیان لێبگیرێت؟! ئەی تۆ ئەوەشت هەر لەبیر نییە؟

باسکردنی ئەو هەموو حیکایەتانە وەك جاران کە بـۆم دەگێڕانـەوە نایـانبزوێنیٚ، تەنانـەت شـەوە شـەڕەکانی هەسـەنۆکە و ژنەکـەی، کـە بـە دەنگـی بـەرز دەیـانکرد، قـسەخۆش و نوکتەئامێزەکانی مامە حەمیدیش نایانهێنێتە پێکەنین و ناڵێت وەی وەی عـومرت درێـژ بـێ کوڕم چیت وەبیر هێنامەوە.. ئەو لەناو گـۆمی بێدەنگیـدا نـوقم بـووە، چـونکە ئـەوەی ئـەو مەبەستییەتی باسی بکات من هێشتا خۆم نەداوە لەقەرەی، بۆیە ناچـار دەبم بڵـێم دایـە خـۆ (ئدە) عاجزی نەکردوویت؟

ئیتر ئەو بەناو هێنانی ئیدریسی برام هەلێکی بۆ هەڵکەوت و لە دەستی نەدا، بۆیە گـورج خۆی بۆ لای دیوارەکە هەڵکێشا قاچەکانی راکێشا و کەوتە قسەکردن و وتی:

- کوڕم ئەم برای تۆ کەرە.. کەر..

قسەکەی پێدەبڕم و دەڵێم:

+ ئێیێ من دەزانم ئەم ئەحمەقە دڵی شکاندوویت. دە مادام وایلێهات بەر لەوەی قـسەکەم بۆ بگێڕیتەوە هەر ئێستە پەلی دەبەستمەوە و لەبەردەمتدا وەکو حەسیر بۆتی رادەخەم تۆش بە گۆچانەکەت چاك بێرە وێزەیدا، بەوخوا ئەو رۆژە هات بۆ ماڵمان و برێ قـسەی بـەرز و نزمـی کرد، منیش تووڕە بووم و پەلامارمدا، بەڵام ئەو ترسنۆکە وەکو سوێسکە لە دەرگاکەوە فرتەی کرد و هەڵهات، ئەگینا فەلاقەیەکی خاسم دەکرد.

ئەو بەگومانەوە لە من و لە ئیدریسیش دەڕوانیٚ، وەکو ئەوەی باوەڕ نەکات یان بڵیٚ چۆنت لە دڵ هات پەلاماری ئەو تاقە برایەت داوە..

ئیتر رێی بۆ خۆش دەکەم، دەکەوێتە گللەیی و بناشت و دەڵێت:

- ئەم کوڕەی من کەرە، بێنەقڵە.. ئەمە کە مق دەکات رێك یـەژێ رەحمـەتی (فەجـە)ی باوکیەتی.. (ئێمە پێدەکەنین و ئەویش پێدەکەنیٚ).. کوڕەکەم کەرێتییەکەی هەر لەوەدا نییـە، ئەوەندە بێنەقڵە دوێکە یەژێ وەڵڵا لەئەو رێگـا دوور و درێـژەوە لـە ئـەو پێچاوپێـچی چیای هەیبەت سوڵتانەوە دەتبەمەوە بۆ کەلار، منیش یەژم رۆڵە گیان کەلکی ئەو رێگاوبانە دوور و درێژەم پێوە نەماوە خۆ تۆ ئەزانیت دڵم زەعیف بووە ئەمرم، کەچی یەژێت ئینجا با بمریت، کە مردیت جەنازەکەت بە ئیسراحەت دەبەمەوە، ئەم کوڕە بێنەقڵەم وائەزانێت لە مردن ئەترسـم،

بە خوا کورِم لە مردن ناترسم، بەڵام ئەگەر مردنێکی پاك و چاك نەکەم ئەوا بۆ ئێوە دەبێتە عەیبە، ئاخر دوایی خەڵکیی جمینتان پێدەدات و (نەعلەتشۆ)تان دەکەن.. خۆ حەزدەکەم بمباتەوە بۆ ئەو گەرمیانە و لەوێ لەناو قەومەکەدا بمرم، بەڵام کورِم ئێوە خۆتان دەزانن ئەمە حاڵەکەمە، توخوا ئەگەر هەر دەمباتەوە با سەیارەیەکم بۆ بگرێت و لە رێگای کەرکوکەوە بمنێرێتەوە، ئەم رێگایە نزیکە و پێچاوپێچی تیادا نییە.

ئەو رۆژە هەرچی لەدڵدا بوو هەڵیڕشت، ئێمەش بەڵێنمان دایە، کە بە زووترین کات لە رێگای کەرکوکەوە رەوانەی لای کەسوکارەکانی گەرمیانی بکەینەوە.

کە گەرامەوە ماڵ لەسەر داوای خۆی، (ئامینە)ی خوشکم ناردە لای. ئەو شەوە تا درەنگانێك سەر دەنێن بەیەکەوە، بەدەم راز و نیازەوە خەویان لێدەکەوێ، بەڵام کە رۆژ دەبێتەوە تەندروستی تەواو دەشێوێت، بۆیە ئامینە دەیهێنێتەوە بۆ لای خۆی.

کە بیستم زۆر هیلاکە، بەپەلە خۆم گەیاندە لای، بەدەم دەرگاکەوە راوەستام و لێمڕوانی، بینیم رەنگ و بۆی مردووی لێنیشتووە. هەناسەی تەواو سوارە و بە ئاستەم قسەی بۆ دەکرێت،. چووم لەلای راستییەوە دانیشتم و دەستیم خستە ناو دەستم، هەتا گیانی سپارد و بە دەم ئازارێکی سەختەوە هەر هاواری دەکردمێ، بەڵام من لەخۆخواردنەوە و ددان بەخۆداگرتن شتێکی ترم لە دەس نەهات بیکەم.. (ئامینە)ی چەند جار کۆست کەوتوو و بە جەرگ لای راستییەوە دانیشتبوو، شایەتمان و ناوی خودای دەدا بە گوێیدا.

لەگەڵ دوا هەناسەی ئەو ئافرەتە جەرگبرژاوەدا، ئامینە دایە پرمەی گریان، منیش وتم: خوشکە دایکمان.. تەواو..

## مرۆڤێك لە مەملەكەتی گورگەكاندا

ئازارچەشتن جۆری هەیە، برسێتیی، تینوویەتی، رووت و قووتی و بێدالدە و پەنایی..هتد، گشت ئەمانە ئازاربەخشن، بەلاّم ئەو ئازارەی هەتا مردن بەكۆڵتەوەیە و لێتجیانابێتەوە، لەدەسدانی ئازیزانە.. ئازارچەشتن ئەوەیە كوڕێكت هەبێت و لەدەستی بدەیت، ئائەمە تاقە كەسەرێكە لە دونیادا، تەنانەت گەر یەكێك لە توخمی بنەماڵەكەت بزربوو، ئەوا دەگەڵ خۆیدا بەرەو كاولكاری راتدەكێشێت و ئەندامێك لە جەستەت و لە زەینت بۆگەن دەبێت.

"نیكۆس كازانتزاكیس"

## (١)

ئەو رۆژانە نیشانەی سەرنەکەوتنی دانوستاندن بەدەر کەوتبوو، لەناو شاردا دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم چاودێریی زیاتر و گوشاری زۆرتری خستبووە سەر خەڵك، ئەودەمە من لەدێی (کەواچەرموو)ی نزیکە شار، بە نیگەرانییەوە کاتم دەگوزەراند. بۆ خۆپارستن لەهەر ئەگەرێکی کوتوپڕ و چاوەڕواننەکراو بڕیارمدا منداڵەکانم بۆ شوێنێکی دوورەدەست و ئەمین بگوازمەوە، بۆ ئەو مەبەستە، داوام لەخزمێکی خۆم کرد بەئەو ئەرکە هەڵبسێت و ئەو خەمەم لە کۆڵ بکاتەوە، بەلاّم نەمزانی هۆی نەهاتنی چی بوو!!

شەوێك لەو شەوانەی کە ئاوایی وەك زمانزانێك بۆنی ترسی کردبێت، بە وریاییەوە، لەناو تاریکیدا راکشابوو، بەچاوی نووقاو و دڵی وریاوە رۆژی دەکردەوە، ئەو شەوە درەنگوەخت گوێم لە چپە و ورتەورت و ترپەی پێ بوو، کۆمەڵە کەسێك بەپشت ماڵی خانەخوێکەمدا گوزەریان دەکرد، ئەو خەڵکە کەسانێك بوون لەخۆیان دەترسان بۆیە لەماڵ دەردەچوون و روویان دەکردە هەردەوهەڵەتەکەی دوور ئاوایی. من لەئەو باوەڕەدا نەبووم بەو شەوە، کە کورد دەڵێت: قەلاّی مێردانە.. رژێم گێچەڵ بە خەڵکی لادێکان بکات. سەرەڕای ئەوەش خۆم گورج کردەوە، بەلاّم لەماڵ دەرنەچووم، کە رۆژ بووەوە دەرکەوت هیچ مەترسییەك لە ئارادا نییە، بەلاّم هەر وریا و گوێقولاّخ بووم.

نیوەڕۆ خۆم بەستبوو، لەژوورەوە دانیشتبووم، لەناکاودا دەنگەدەنگ و هاتوهاواری خێزانی خانە خوێ، دەزوولەی بیری پچڕیم و رایچەڵەکاندم، هەتا من هەڵسامە سەر پێ ئەو بە پەشۆکاوییەوە بەردەرگاکەی لێگرتم و وتی: براکەمیت عەسکەریی گەییە ناو ئاوایی، گورج بە فریای خۆت بکەوە! لەوکاتەدا هەستم بەکارەساتێك کرد بەرێوەیە و بەرەوڕووی من دێت.. ئاخر ئەگەر وابێ سەرباز رژابێتە ناو ئاوایی، ئێستە دەورووبەری گوندیش گیراوە و کاتێکت زانی دەس دەکەن بە پشکنینی ماڵ بە ماڵ.. ئەی چار چییە؟

بەرەنگاربوونەوەی سوپایەکی گەورە، بە دەمانچەیەکی چواردەخۆر و نارنجۆکێکی دەستییەوە، خۆکوشتنێکی حەتمییە.. ئەی ئەنجامی خۆبەدەستەوەدان چۆن دەبێت و بە

کوێم دەگەیەنێ؟ هەروەکو بروسکە، بەدەم راکردنەوە بەرەو دەرگای حەوشە گەورەکە ئەو پرسیارانەم بەمێشکدا هات، لەوێدا بڕیارمدا خۆم بکەمە بچووکترین کەلێن و کەللەبەردا، کە لەئەو ئابلۆقەیەدا بەدیی دەکەم، دەرەنجامیش یا دەبم بەدەم گوللەی دەسرێژەوە یا رزگارم دەبێت، لە هەردوو حاڵەتدا دەربازبوونێکی شکۆمەندانەیە، کە گەشتمە بەر دەرگای حەوشە، روانیم برێك ئافرەتی شپرزەی لێکەڵەکە بووە، تێمخوڕین و بەپەلە دڕنمپێدان، لە دەرگاکە سەرم کێشایە دەرەوە و بەرەو دەشتاییەکەی نێوان ماڵەکانی ئاوایی و شاری کەلار هەڵوەستەیەکەم کرد و بەبێ خۆخەریککردن بەدەستە چەپدا بۆ لای دۆڵ و کەندرەکە پڕتاو رامکرد، لەئەوبەری کەندرەکە تا دەگەیتە بەرزاییەکەی بەرانبەر و ئاودیو دەبێت، ماوەیی سێسەد مەترێك دەبوو، بەدەم راکردنەوە، بەلای دەستی راستدا ئاوڕێکی بەپەلەم دایەوە، روانیم زرێپۆشێك بەرەو بەرزاییەکەی ئەولاتر مل دەنێت، لەوێدا ئەوەم بەمێشکدا هات، کە هەڵنەیەم و بەشێنەیی بەرەوپێش بڕۆم، چونکە زانیم ئەو چەکدارانە کە بەسەر زرێپۆشەکەوە کەڵەکەببوون، ئەگەر لێمبکەونە گومانەوە و بزانن هەڵدێم، ئەوا دەسرێژم لێدەکەن و پێوەدەبم، بۆیە خۆم هێور کردەوە، هەربەدەم رێوە قایشەکەم لەپشت کردەوە و ئاڵاندم بەدەمانچە و نارنجۆکەکەوە و وەك پریاسکە گرتم بەدەستی چەپمەوە، لەئەو کاتە زۆر ناسکەدا ئەوەی زیاتر فریام کەوت، رانە مەڕێکی بێشوان بوو، رێچکەی گرتبوو بەرەو ئاوایی دەگەڕایەوە، لەکاتی تەنگانەدا بۆ رزگاربوون لە ئەومەترسییەی کە بەرەو رووت دەبێتەوە، لەوانەیە چەند رێ و شوێنێك بروسکە ئاسا بەمێشکدا بێت، بەلام بە زووترین کات، باشترین و نزیکترین رێگا بۆ دەربازبوون زەینت داگیر دەکات و دەیگرێتەبەر، بۆیە بەکەمترین بیر کردنەوە، زانیم ئەم رێکەوتە هەلێکە و نابێت لەدەستی بدەم، کێ پێیگوتم؟ چۆن گەیشتم بەئەو قەناعەتە، کە ئاسانترین و راستترین رێگا بۆ دەربازبوونم تەنیا ئەوەیە خۆم بکەم بەشوانی ئەو رانەمەڕە؟ نازانم.. بەلام وامکرد، رێك وەك شوانی گەلەمەڕەکە بەتێخوڕین و دەس بەرزکردنەوە و یخە و عاعا، بەرایی رانەکەم بەرەو هەردەو سوورکەکە شکاندەوە، وادیاربوو سەرنشینانی سەر زرێپۆشەکەش بە شوانیان زانیم، یان هەر هۆیەکی تر بوو، دەسرێژ و تەقەیان لێنەکردم، تەنانەت دەستێکیشیان لێهەڵنەتەکاندم، کە گەیشتمە ناو هەردەوهەڵەتەکە شنەبایەك لەدڵنیایی مێشکی خاووفێنك کردمەوە و مەترسییەکەی چەند ساتێك بەرلە ئەوکاتە

وەك سەگی خوێڕی کلکی کردە ناو گەڵیدا و لێمدوور کەوتەوە، ئەو مەترسییەی ئەگەر ڕێکەوت ڕزگاری نەکردایەم سەری دەخواردم! لەهەموو سەیر و سەرسوڕهێنەرتر لەوێدا کە بینیم، ئەو کەسانە بوون، کە شەو لە ئاوایی دەرچووبوون و هەر لەئەو دەشتە مابوونەوە!!

دەمەو مەغریب گەڕامەوە بۆ ماڵ، شەو نیگەرانی و دڵەڕاوکەیەکی وا دایگرتم، هەتا بەیانی خەوم لێنەکەوت.. ئاخر مانەوەی گوندنشینە هەڵهاتووەکان لەودەشت و دۆڵە، گەیاندمییە ئەو قەناعەتەی کە لەلایەن کەسانی باوەڕپێکراوی ڕژێمەوە ئاگادار کراونەتەوە لە نیازی خراپی سووپا.. ئیتر دەبوایە بڕیار بدەم و چارەسەرێکی منداڵەکانم بکەم، دەبوایە بەهەر شێوەیەك بێت لەگەڵ خۆمدا دەریان بکەم، یان هەر بەو شەوە خۆم بەسەڵتی لە دێ دەرچم و پاشان لە دەرفەتێکدا بنێرم بەدووی ئەواندا، بەلام (کەریم)ی برام، کە بۆ سەردانی ماڵی باوکم چووبووە شار و ئەو ڕۆژە ناردم بەدوویدا، دەست و پێی بەستمەوە.

بۆ بەیانی کەریم گەیشتە لام و باسی تێکچوونی بارودۆخی ناو شاری بۆ کردم. ئەو دوو کەسی لەگەڵ خۆدا هێنابوو. (ئیسماعیل) بە پیشە قوتابی و لە ڕێکخستنەکانی ناو شاردا خۆی ڕیکخستبوو. (محێدین)یش سەربازی هەڵهاتووبوو. بە گەیشتنیان لە گوند دەریانم کرد و چووین بە بەرزاییەکەی پشت ئاواییەوە دانیشتین. من باسی ڕۆژی پێشوو و هاتنی سوپا و چۆنێتی دەربازبوونی خۆمم بۆ گێڕانەوە و جەختم کردەوە، کە دەبێت هەر ئێستە و بەر لە گەڕانەوەی کاروانە سەربازییەکەی ناحیەی (تیلەکۆ-کەلار) لەڕێگا سەرەکییەکە بپەڕینەوە و ڕووبکەینە ناوچە ئازادکراوەکە، بەلام دیاربوو کەریم وای پێچاك بوو پەلە نەکەین و پاش دڵنیابوونمان لە گەڕانەوەی کاروانە سەربازییەکە لەماڵ دەربچین.

بەدوودڵییەوە بەقسەم کرد. گەڕاینەوە ناو ئاوایی و نانی نیوەڕۆمان لەماڵەوە خوارد. کوڕە تووڵەکەی خانەوادەکەمم نارد بۆ نزیك جادەکە، بۆ چاودێریکردنی کاروانە سەربازییەکە. پاش نیو کاتژمێرێك گەڕایەوە و دڵنیای کردین لە سەلامەتی ڕێگاوبان، ئەو وتی: کاروانەکە گەڕایەوە بۆ کەلار.. ئیتر ئێمەش ماڵئاوایمان کرد و لە دێ دەرچووین.

***

نێوان جادەکە و ئاودرِەکانی ئەوبەری ئاوایی، چەمێکی پانوپۆڕی وشك بوو. ئەو بەرزاییە، کە ڕێگاکەی نێوان ناحیەی تیلەکۆ و شاری کەلاری دەبڕی، دەیڕوانییە سەر ئاوایی و دەشتاییەکەدا، کە زیاد لە کیلۆمەترێك لە ئێمەوە دووربوو، لە جادەکە پەڕینەوە و پێمان نایە ناو چەمەکە. بەدەم ڕۆیشتنەوە ئاوڕم بۆ لای ڕاست دایەوە. هەروەك لەناکاوا سوژنێکی تیژ بە مێشکدا بچەقێنیت، بروسکە ژانێك کەللەمی هەژاند و هەستم بە کارەساتێك کرد، کە بەئەو بەرزییەوە خۆی لێمەلاس داوین!! وردتر ڕوانیم، دیققەتم دا چەند ئۆتۆمبێلێکی سەربازیم بەدی کرد بەتەنیشت یەکەوە ڕاگیرابوون، بۆیە بە هاوڕێکانم وت: کەمێك پێ هەلگرن.. بەگوورگە لۆقە ڕوومان کردە کەندڕ و بەرزاییەکەی ئەوبەر چەمەکە، نازانم چەندێکی پێچوو، جارێکی تر ئاوڕم دایەوە، ژمارەی ئۆتۆمبێلەکان زیادیان کرد، سەربازەکان بەئەمبەر و ئەوبەری جادەکەوە، بەسەر بەرزاییەکەدا دابەش دەبوون.. ئیتر ناچاربووم بەدەنگێکی بەرز تێیانخوڕم: کوڕینە ڕاکەن.. با لەم چەمە خۆمان دەرباز بکەین و دەستمان بگاتە ئەو هەردەوهەلەتە..

من دەمزانی کە بگەینە نزیك بەرزاییەکەی بەرانبەر ئیتر کاروانە سەربازییەکە بەدوومان ناکەوێت و دەربازدەبین، خۆ ئەگەر دوورە گوللەش بمانپێکێت مادام بەر دەستی دوژمن نەکەوین هەر دەربازبوونە، چەند شەقاوێکمان مابوو لەچەمەکە سەربکەوین، دراینەبەر دەسرێژی دۆشکە و بی.کەی.سی و شەستیر.. ڕێژنەی گوللە ژێرپێ و دەورووبەرمان و کەندرەکەی دەبێژا. لەو بیگرەوبەردەدا و لەناو قرمەژنی ئەو جبەخانە سەفەرییەی سوپایەکی تینوو بۆ خوێن، ئێمە هەر لە ڕاکردندا بووین، چونکە هیچ ڕێگایەکی ترمان لەپێشدا نەبوو، کە لە چەمەکە بەسەرکەوتین و پێمان نایە ناوجارە گەنمەکەدا، ئەو پەرێزەی کە وەکو ناوچەمەکە خڕەبەردی تیادانەبوو، ڕاکردن خۆش و ئاسانتر بوو.

محێدین و ئیسماعیل پێشکەوتبوون. کەریم پێیوتم: کاکە ڕاکە.. با خۆمان دەربازبکەین..

ئەو لە دلّی نەدەهات بە جێمبهێلێت، ئەگینا پێش ئەوانی تریش دەکەوت. دەیزانی لەوە زیاتر ناتوانم ڕابکەم، چونکە لاشەقورس و بە تەمەنتربووم، بەلام تەنگم پێهەلچنیبوون. کەریم گەڕایەوە سەرم و بەدەم ڕاکردنەوە دەمانچە و نارنجۆکەکەی

لێوەرگرتم ئینجا پەلیگرتم و جووت بەپاڵ یەکەوە راماندەکرد، بەلاّم من کە زانیم بەپێی ئەودا ناگەم، بۆیە داوای خۆدەربازبوونم لێکرد و پێمگوت: خۆی بەمنەوە خەریك نەکات. کەریم گوڕی دایە خۆی و پێشمکەوت. لەئەو کاتە زۆرناسك و سامناکەدا ئاوڕدانەوە و لاکردنەوە چ سوودێکی هەیە؟ ئاخر هەر هەنگاوێك نزیکبوونەوە لە قەدپاڵ و بەرزاییەکە فرسەتی دەربازبوونمان نزیکتر دەکاتەوە و لەمردن دوورمان دەخاتەوە..

ئالەوێدا و لەئەوکاتەدا نازانم چی وایلێکرد تا دەست بۆ باخەڵم بەرم و ئەو نامە یاساغانەی کە بۆیان ناردبووم، بەدەم راکردنەوە کوت کوت بکەم و بیدەم بەدەم باوە، هەروەها وێنەی شەهیدیکیشم لەباخەڵدابوو، تووڕمدایە ناو جاڕ و پەرێزەکە.

محێدین و ئیسماعیل تەنگیان بە گرد و بەرزاییەکە هەڵچنیبوو، کەریمیش لەدەربازبووندابوو من دابوومە پاش و دواکەوتبووم. کاتێکم زانیی چەند دەسرێژێکی نزیك بەسەر سەرمدا قرمەی هات، بۆیە ناچاربووم لابکەمە دواوە، ئەی خودایە چیم بینی؟! روانیم جێبێکی سەربازیی لەکەندڕەکەوە سەرکەوتووە و سەربازی پشت بی.کەی.س- یەکەیە تەقەم لێدەکا، ئیتر لەوێدا بۆم دەرکەوت دەربازبوونم مەحاڵە، بۆیە بەدەنگی بەرز خوڕیمە کەریم (ئیتر نازانم گوێی لێم بوو یا نە) تا خۆی دەرباز بکات، لەوەش تێگەیشتم کە ئەوڕۆ، رۆژی لێقەومانە.. بۆیە لەهەوڵدانی خۆدەربازکردن بەولاوە هیچی ترم لەپێشدا نەبوو. چەندجارێك گوێم لەدەنگی گورگە بۆرەکەی سەر جێبەکەبوو تێیدەخوڕیم و دەیوت: کوڕە هەی سەگباب راوەستە.. بەلاّم من هیچ گوێم بەئەو فەرمانە نابەجێیە نەدا. دیاربوو ئەویش چاك لەئەو راستییە حاڵی ببوو، بۆیە دەسرێژێکی خەستی بەنێو قاچوقول و دەوروبەرمدا کرد، من هەر بەرەوپێش لەراکردندابووم و ملم دەنا. چاویشم لە کەریم بوو کە تەنگی بە بەرزاییەکە هەڵچنیبوو، کاتێکم زانیی وەك کەڵە کێوییەك کوت و پڕ بپێکرێت، لەترێکی دا، دەمانچە نستیلەکەی دەستی لە بەر تیشکی خۆرەکەدا شەوقی ئەدایەوە، وەکو سوجدە بۆ خاك ببات، لەپی راستی نایە زەوی، ئینجا لەپی چەپ و ئیتر تەواو نووشتایەوە..

کە ئەو دیمەنەم بینی، پڕ بە گەرووم هاوارم کرد و بەهەموو هیز و توانام گوڕم دایە خۆم تا پیادا رابگەم.. بە بێئەوەی سوود و ئاماجی ئەم هەوڵەم بزانم، دەسرێژێکی تر هەردوولاقمی هێنا بەیەکدا و بەزەوییدا کەوتم، هێزمدایە بەرخۆم تاهەڵبسم، بەلاّم جێبە سەربازییەکە سوورێکی بازنەیی بەدەورمدا خوارد و وەك واشەیەکی برسی، کە چاو بۆ

بێهێزترین باڵندە دەگیرێت، سەربازەکە بەئەو شێوە نیشتە سەرسەرمەوە، ئەو لێنەگەڕا هەڵسم، بەدەستێکی هەوڵیدەدا دەمم بچەقێنێتە ناو خۆڵەکە و بەئەو دەستەکەی تری، ئیو قەد پشتوێنەکەی لەپشتم کردەوە و نەیپەرژایە سەرئیوەکەی تری، یان زانی بۆ بەستنەوەی دەستم ئەو ئیو پشتوێنە بەسە.. زۆر کارامە بوو لە شەتەکدانی مەچەکدا، بۆیە گورج کارەکەی خۆی بەئەنجام گەیاند، تا ئەو کاتەی ئاگام لە خۆبوو بە پۆستاڵەکەی دووسێ شەقی سرەواندە لاچەناکە و پەراسوومدا، من چاوم لە کەریم کەلانەکرد، سەربازێك کە شەش حەوت مەترێك دووری راوەستا بوو تەقەیەکی لێکرد، پاش ئەوە ئیتر هۆشم لای خۆ نەما.

***

# (٢)

من بێهۆش بووم.. بەڵام دڵم لەسەر نیوە بەخەبەر بوو. لە ناو ئەو هەردەوهەڵەتەی نزیك بناری کەژی (سەگرمە، یا کەژی زەردە )دام، نازانم.. لەئەو ڕێگایەدا بۆران هەڵدەکات و چەند تاوێك شەستە باران لێمدادەکات. ئێستە باران خۆشی کردەوە و تاڵە دەزوویەکی وشك چییە، لە بەرمدا نەماوە، بەڵام هەورێکی ڕەش و تاڵ ڕووی ئاسمانی داپۆشیوە و تەمومژێکی خەست پێدەشت و بنارەکەی تەنیوەتەوە و تا دێت چڕوخەستتر دەبێتەوە. تاریك دادێ و منیش ڕێگام وێڵ کردووە، تارمایی گەللە دەعبایەك لە قووڵایی تاریکییەوە دێت و دەورەم دەدات، تا دێت ئابلۆقەکەم لێتەنگتر دەبێتەوە، ئەوا ئێستە گەللەدەعبا تەواو نزیك بوونەتەوە، قرمیان لێخۆش کردووم و خەریکە پەلامارم ئەدەن، مڕەیان دەبیستم، گوێم لە قورووسکەیانە، ئێستە دڵم تەواو بە خەبەرە، مڕەمڕەکە وردەوردە چوارچێوە دەگرێت و دەبێتە ئەلفوبێی عارەبی، بەڵام عارەبییەکی (جلفە)ی بێتام و لەگەڵ پێکەنین و غەڵبەغەڵبی قسەکەرەکاندا تێکەڵ دەبێت و ونەدەبێت.. دەنگەدەنگێکی بێسەروبەر، تا ئەوکاتە من ئاخاوتنی واناساز و هەراسانکەرم نەبیستبوو، بە ئاگاهاتم، بەڵام لەکوێدا بووم؟

جارێکی تر مێشکم دەگوشم، ئیتر دڵنیا دەبم کە هەردوو چاوم توند شەتەك دراوە، هەردوو دەستیشم لەپشتەوە بەستراونەتەوە، بەو پێیەی کە ئۆتۆمبیلەکە خێرا دەڕۆیشت و کشپەی دەهات بۆم دەرکەوت ڕێگاکە قیرتاوە. کەمێك زیاتر بیرم گلێر کردەوە، بەڵام ئەوەندە گێژوکاس بووم شتەکانم تەواو بۆ ساغ نەبوونەوە، دەنگێك کە خاوەنەکەی بە تەنیشتمەوە دانیشتبوو دەیگوت: گەورەم بەخوا من هیچ نیم، تەنیا قوتابیم و بۆ سەردانی خزم و کەسم لەشار دەرچووم.

من خاوەن دەنگەکەم ناسییەوە.. ئیسماعیل بوو، بێهوودە شەرحی حاڵی خۆی بۆ کەسانێك دەکرد گوێی بیستنی ئەو جۆرە قسانەیان نەبوو. لەوێدا چەن دیمەنێکی ڕووداوەکەم وەك خەونێکی هەڵبزڕکاو هاتەوە یاد، ئیتر حاڵی بووم کە ماوەیەکی زۆر بێهۆش کەوتووم و ئاگام لەخۆنەماوە، تازەش کار لەکار ترازاوە و جگە لە ددان بەخۆداگرتن شتێکی تر نییە دادمان بدات و فریامان بکەوێت، بۆیە ڕانم لە ڕانی

ئیسماعیل توند کرد و پێموت: وسسبە.. ئاخر لەو کاتەدا سەربازەکان لەنەشئەی سەرکەوتندا بوون و وەك سەرخۆشگەلێکی فرەمەست قاقایان لێدەدا. من تائەو کاتە ئەم خەیالانەم بەمێشکدا هات بە ناگابووم، ئیتر نەمزانی ڕێگاکە چەندی خایاند و کەی گەیشتووینەتە مەنزڵی نەخوازراو؟

ئۆتۆمبێلەکە راوەستاوە. یەکێك پەلی گرتووم و لەسەرخۆ وەك بچپێنێت بەگوێمدا گوتی: دابەزە، یالایالا دابەزە..

کابرا لە دابەزیندا یارمەتیدام و بەسەر زەوییە چیمەنتۆکەوە، کە هێشتا تینی گەرمی هەتاوی دەردەدا داینام. گەرمیی زەوییەکە زیاتر گورجی کردمەوە. لەنەو کاتەدا لەشقورسیم نەبێت، هەستم بە هیچ ئازارێك نەکرد، وردە وردە مێشکم پارچە پارچەی دیمەنی کاڵەوەبووی لێقەومانەکەی کۆدەکردەوە و تا دەهات لە بیرمدا تۆخ و تۆختر دەبنواند، سات لەدوای سات لەشم گرانتر دەبوو، هەستم دەکرد چەناگەم قورس و قەبە دەبێت و قولەقاپەی چەپم لەناو گۆرەوییەکەدا کەمێك دەسووتێتەوە. نەختێك پێم جولاند، دیاربوو گۆرەوییەکە لکابوو بە پێستەکەوە، بەلام ئازارێکی ئەوتۆی نەبوو. لە کاتژمێرێك زیاتر لەو شوێنەدا هێشتیانمەوە. لەنەو ماوەیەدا هیچ دەنگەدەنگ و ورتەورتم نەبیست.. جگە لە تەپەی پێ، کە جاربەجارێك دەهاتە بەر گوێم. شوێنەکە ئەوەندە کپ و بێدەنگ بوو، دەتگوت (ناشێکە و ناوی کەوتووە).

یەکەم دەنگ و دوادەنگ لەو شوێنەدا، کە بیستم دەنگی کەسێك بوو وتی: هەستە.. هەستام و سواری ئۆتۆمبێلێکی کردم، هەر ئەوەندەی جگەرەیەك دابگیرسێنیت و بیکێشی ئۆتۆمبێلەکە بە ڕێگادا ڕۆیشت و پاشان دەرگایەکی بۆ کرایەوە و چووە ژوورەوە، دیسان دایانبەزاندم و سەربازەکە بەدەست و چاو بەستراوییەوە دامیە پێش خۆی و پێیوتم: مەترسە راست برۆ.. لە ڕۆیشتنمدا زانیم، کە زەوییەکە چاڵ و چۆڵی تێدا نییە، بە گۆکردنی (مەترسە) حاڵیی بووم کە سەربازەکە دەیویست پێمبڵێت: لە نوچدان و کەوتن نەترسم.. هەر سی چل هەنگاوێك بوو بڕیم، ئەو سەربازە کە دابوومییە پێش خۆی رایگرتم، وتی: ئەم بەندییە وەرگرە.. بە زرەی زنجیر و قرتەی قفڵی دەرگاکە، کە کرایەوە، تێگەیشتم ئەوێ ژووری بەندیخانەیە. دیاربوو دەرگاوانی زیندانەکە دەرگاکەی لادا و پەلی گرتم، هەتا پێم گەیشتە ناو ژوورەکە، من خۆم بۆ هیچ ئامادە نەکردبوو، کاتێکم زانی

کەللەم گرمەیەکی هەورە تریشقە ئاسای لێهەستا، هەر وەکو ئەوەی هەردوو گلێنەی چاوم هەڵکۆڵن و لە شوێنەکەیدا دووپشکۆی ئاگر بچەقێنن، ئاوەها قووڵایی هەردوو چاوم گەرم داهاتن، دەتگوت ئێستەنا تاوێکی تر دەرژێنە بەر پێم، پاسەوانی بەردەرگای زیندانەکە بوو تاخوا هێزی پێدابوو یەك مشتی سرەواندە بناگوێمدا وتی: بچۆ ژوورەوە سەگی کوڕی سەگ..

من لە ژیانمدا ئەوە یەکەم جارم بوو، کە زیندانی بکرێم، بەڵام دەربارەی گرتووخانە و ئازار و ئەشکەنجە باسوخواسی زۆرم بیستبوو. پاسەوانەکە دەرگاکەی داخست و بۆ دڵنیایی خۆی قوفڵ و زنجیرەکەی چەند جارێك راوەشاند. بەبێ تەکوجم، لەشوێنەکەی خۆمدا راوەستام. گوێم هەڵخست، ورتە لەژوورەکەوە نەدەهات، پاش کەمێك، پاسەوانەکە لەشێوەی فەرمانێکی سەربازیی وتی: سەگەکان دەستی ئەو (موخەربیبە) بکەنەوە.. دەنگێکی کز، کە بەلای چەپەوە بوو وتی: دانیشە.. لەشوێنەکەی خۆمدا دانیشتم ئینجا دەستی هێنا و پەڕۆکەی سەر چاومی کردەوە، هەردوو دەستیشمی ئاوەڵاکرد و لەپارچە مقەباکەی ژێر خۆی کەرتێکی بۆ درێژکردم و وتی: بیخەرە ژێرت لە هیچ باشترە..

هێشتا بە تەواوەتی نەهاتبوومەوە سەرخۆ، وەك لەناو رووداوی خەونێکی کارەساتاویدا بووبێتم و تازە بەئاگا هاتبێتم ئاوا لە پەلوپۆ کەوتبووم و بەگێژ و ماتی لە رووخساری بەندییەکانم دەڕوانی. پاش تاوێك بێدەنگیی، ئیسماعیل و محێدینم ناسییەوە، ئەوانیش بەنیمچە حەپەساویی پاڵیان دابوو بە دیوارەکەی بەرانبەرمەوە، لەوێدا ئەو کەسەی کە بە بیرمدا هاتەوە تەنیا (کەریم)ی برام بوو. هەواڵیم لێپرسین، ئەوان بەجووتە وتیان: بریندارە..

ناوی سەربازگەکەم لە بەندییەکەی تەنیشتم پرسیی ئەو وتی: ئێرە زیندانی ئیستخباراتی لیواکەی (بارق)ە.. من هیچی ترم نەبوو بیڵێم، یا تەنیا فریای ئەوەندە پرسیار کەوتم، دەنگێکی ناساز بەزمانی عارەبی، کە بۆنی رق و تۆڵەی لێوە دەهات ناوی بانگ کردم و داوای لێکردم هەردوو چاوی خۆم ببەستمەوە و دەربچمە دەرەوە، هەستام و کەمێك بەشلوشاویی بە پشتوێنەکەم چاوم بەستەوە و دەرچوومە دەرەوە. چەند هەنگاوێکم هاوێشت. ئەو هەستی کردبوو، کە بەر پێی خۆم دەبینم بۆیە رایگرتم و بەدەستی خۆی توند چاوی شەتەك دامەوە.. بیست سی هەنگاوێك بەرەو پێشەوە چووم و رایگرتمەوە. بەچپە و ورتەی چەند عارەبزمانێکی تر کە دیاربوو چاوەڕوانن، زانیم ئەوێ

شوێنی مەبەستە.. لەگەڵ دەنگی قرتەی کیلۆندا دەرگا کرایەوە و یەکێکیان پەلی گرتم و داوای چوونە ژوورەوەی لێکردم، بەو پێیەی هەوایەکی فێنك بەرەو رووم هات، حاڵی بووم، ئەو ژوورە ژووری بەرپرسێکی گەورەیە، پاش پێکوتانە زەویی سەربازەکەی تەنیشتم، دڵنیابووم لە راستی بۆچوونەکەم. دەنگێکی تووڕە وتی: دانیشە.. من کەمێك بە گومانبووم لەوەی کە لەگەڵ منیەتی، بۆیە بەلای چەپ و راستدا کەمێك وەرچەرخام و دانەنیشتم، تا دەستێك قورساییەکی خستە سەر شانم وتی: دانیشە..

دەنگێك کە خاوەنەکەی بەرانبەرم دانیشتبوو وتی: کورە بە بێهیچ درۆ و پێچوپەنایەك، هەرچیت لێدەپرسم بەڕاستیی وەڵامم بدەرەوە.. من هیچم نەوت.

- ناوی سیانیت؟

+ سەعید حەمەفەرەج..

- پیشەت؟

+ جووتیار..

ئەو دای لە قاقای پێکەنین وتی:

- هەی کوڕی سەگ ئەم دەست و پلەی تۆ و ئەو جلوبەرگە هی جووتیارە؟ نەمگوت درۆم لەگەڵدا مەکە هەی سەگباب؟ راست قسە بکە، ئەگینا ئەمشەو دەتکوژم، خەڵکی کوێیت؟

+ خەڵکی ئاوایی (تەپەسپی)م..

- خەڵکی تەپەسپیت چی دەکەیت لە دێی (کەواچەرموو)؟

+ بۆ سەردانی خزمەکانم هاتووم..

- کە کاروانە سەربازییەکەتان بینی بۆ هەڵهاتن؟

+ ئەوان کە ئێمەیان بەدیکرد تەقەیان لێکردین.. بۆیە هەڵهاتین. ئەی رێککەوتن نییە بۆ تەقە لە رێبواران دەکەن؟

- گوو بخۆ سەگباب.. رێککەوتنی چی؟ بیبەن..

(بیبەن)ەکەی کابرای بەرپرس بەلای منەوە مانای زۆری دەگەیاند، بەڵام بەلامەوە سەیربوو، کە بە راستی ئەوەی چاوەڕوانی بووم کەمتر دەرچوو. نازانم پاش فەرمانی بیبەنەکە چەندی خایاند، هەستم کرد هەوای گەرم و گڕەی دەوروبەر لێمدەدات.

چـەناگەم ئـازاری زۆری پێگەیـشتبوو، پەراسـووەکانم وەك بەیەکـدا چـووبێتن ئـاوا دەیانزریکاند و بەدەم هەناسەدانەوە دەچـوومەوە یـەك و دەمنـکانـد. سـەربازێك بـە ژوور سەرمەوە راوەستابوو، وتی: کاکە بەس نییە، ئەوە (قاسم)ی ئامۆزات کوژرا.. (حەمیـد)ی بـرات کـوژرا.. ئـەوەتا ئـەمڕۆش (کـەریم)ی بـرات تیاچـوو..ئـاخر بـۆ بـەزەییتان بـە خێزانەکانتاندا نایەتەوە؟ تۆ پێمبڵێ، ئاخر لەئەم ناوچەدا هەر ئێوە کـوردن؟ بەسـە کاکـە بەسە!!

ئالەو کاتەدا بۆم ئاشکرا بوو کە کەریم شـەهید بـووە. هـەواڵی تەرمەکـەیم لێپرسـی، وتی: تەرمەکەی تەسلیم بە نەخۆشخانەی کەلار کراوە.

دەنگی تەپەی پێ هـات. بۆیـە بـە دەنگێکـی بـەرز و تـووڕە ئـامێزەوە وتـی: ورتـە لەدەمتەوە نەیەت.. وسس!!

ئالەوێدا بۆم دەرکەوت لەپشت قسە سۆزاوییەکانی ئەم کابرا عارەبـەوە، کـە بەسـەریی دەمناسێت، جگە لە هاوسۆزیی، هیچ مەبەستێکی ئیستیخباراتی نییە، کە بەئەقڵی خۆی نەسیحەتم دەکات.

دەنگی کردنەوەی دەرگاکە هات، بۆم دەرکەوت ئەو شوێنە نزیك ژووری بەرپرسـەکەیە، کە پێشتر قسەی لە دەم وەرگرتم. دیسان پـەلیانگرتم و چـوومە ژوورەوە. هـەمان دەنـگ و هەمان پرسیار دووبارە بوویەوە. منیش هەمان وەڵامی پێشووم وەك تووتی دایەوە، وەلێ ئەمجارە تۆنی دەنگی کابرای پرسیارکەر هێمن و نەرمتر بوو!! ئەو پرسیی:

- کەریم برای تۆ بوو؟

+ بەڵێ..

- ئەگەر راستییەکانم بۆ باس نەکەیت ئەمشەو وەکو کەریم دەتکـوژم و تەرمەکـەت بە نەخۆشخانەی کەلار دەسپێرم.

بەڵام من کە پێمگوت هیچ نهێنییەکی ترم لا نییە تا بیدرکێنم، ئەو گوتی:

- باشە ئەگەر تۆ جووتیاریت و تێکـدەرنیت بـۆ لەگـەڵ سـەلامی فـەقێ عـەلی- دا جەولە دەکەیت؟ ئەی سەلام کە سەردەستەی تایبەتی تێکدەرانە بۆ دەچێتە سـەر خـەڵکی بەشەرەفی ناوچەکە؟ بۆ ئازاریان دەدات و ئۆتۆمبیلیان لێزەوت دەکات؟

من دەمزانی مەبەستی ئەم بەرپرسە چییە و خەڵکە بەشەرەفەکەش کێیە!! بۆیـە جگـە لە ئازانم زیاتر هیچم نەوت..

هاوەڵێکی ئەم بەرپرسە کە لە قسەکردنیدا بۆم دەرکەوت زۆر لەنزیکەوە خۆم و کەسوکارم دەناسێت، وتی: گەورەم من ئەم رەگەزە زۆر باش دەناسم، ئەگەر ئازاری زیاتری نەدەین ددان بە هیچدا نانێت و شتێکی سوودبەخشمان بۆ نادرکێنێ!

ئەفسەرەکە وەڵامی بۆ ئەو کابرا دڵسۆزە نەبوو، بەڵام بەمنی وت:

- سەربازیت کردووە؟

+ ئەو..

- موخەریب هەیە لە کەواچەرموو؟

+ نییە، بەڵام خەڵکی ئاواییەکان هەموویان چەکدارن..

- کە تێکدەر نین بۆ چەك هەڵدەگرن؟

+ نازانم..

- دواپرسیارت لێدەکەم، بێ پێچوپەنا وەڵامم بدەرەوە..

ئیسماعیل و محێدین دەناسیت؟

+ بەڵێ.. دەیانناسم ئیسماعیل قوتابییە بۆ سەردانی خزم و کەسەکانی لەشار دەرچووە..

ئەم زانیارییانەم سەبارەت بە ئیسماعیل هەمان ئەو روونکردنەوە بوو، کە خۆی دای بە گوێی سەربازەکاندا..

کاتێك بەدەم رێگاوە من هاتمە هۆش خۆمدا و پێموت: وسسبە.. دەربارەی محێدینیش وتم: ئەویش سەربازی هەڵهاتووە و برایەکی شەهیدی قادسیەیە و لەخێزانێکی هەژار و بێوەیە.

پاش کەمێك بێدەنگی یەکێك ئەوی لە پەلم و هەڵیساندم. لە دەرگاکە کردمییە دەرەوە و دامییە پێش خۆی، تا بەردەرکی زیندانەکە بردمی. چوومە ژوورەوە و بە چاوبەستراوییەوە کەمێ چاوەڕوانی فەرمانی پاسەوانەکەم کرد، بەڵام ئەو چونکە هیچی نەوت، بۆیە خۆم بەدەستی خۆم چاو پۆشەکەم لەسەرم لادا و لەشوێنەکەی خۆما دانیشتم.



## (٣)

ژوور کپ و بێدەنگ بوو. لە شوێنەکەی خۆمدا بەسەر پارچە مقەباکەوە دانیشتم. پێویستیم بە بیرکردنەوە و بەخۆداچوونەوە بوو. بەندییەکەی تەنیشتم ویستی بزانێت بۆ کوێیان بردووم و چۆن رەفتاریان لەگەڵدا کردووم؟ وتم: بڕێ پرسیاریان لێکردم. ئەو ئیتر لەسەری نەڕۆیشت. منیش پاڵم بە دیوارەکەوەدا و قاچەکانم بۆ پێشەوە راکێشا. ئیتر خۆم لێونبوو، یان راستتر بڵێم ویستم بەخۆدا بچمەوە و لەخۆم بپرسم، من چیم؟ من کێم؟ چیم بە سەردا هات؟ بۆژۆژ؟ هۆی چی بوو؟ ئەو هێزە گەورە و نادیارە چییە و کێیە واناڕاستەت دەکات و تووشی چەرمەسەرییت دەکات؟ خەتای ئەوە یا خەتای بێدەسەڵاتی و کورتبینیی و خۆشباوەڕیی سەرکردەکانە؟ یا خەتای خۆت بوو؟ ئەمانە هەموو پرسیار بوون و وەڵامەکانیان، بەلای منەوە دوور و درێژ و قورس بوون. بۆیە خۆم لێبواردن.. ئەوەی ئازاری ئەدام تیاچوونی کەریمی برام بوو، کە پێنج شەش کاتژمێر پێش ئێستاکە قسەی خۆش و بەتام و هیوابەخشی بۆ دەکردم؟! ئەی دایك و باوکم ئێستە لە چ بار و زروفێکدان؟ خێزانەکەی کەریم؟ خوشك و کەسوکارەکانم؟ ئەی هاوسەر و هەر پێنج منداڵەکەی خۆم؟ ئەبێ ئێستا ئەوان حاڵیان چی بێت؟ ئەوە باوکم ددان بە خۆیدا دەگرێت و گریان و هاتوهاواری بە عەیبە بۆ دەژمێردرێت، هەر وەکو ئەوەی پیاو بێعاتیفە و بێسۆز و بێبەزەیی بێت، بەڵام کە دەچێتە ناو پێخەفی نووستنەوە و دڵنیا دەبێت لەوەی کە کەس ئاگای لێنییە، ئەوساکە لە دایك و خوشك و کەنیشکەکان بە کوڵتر دەگرییە و دادەکورکێنێ، کەچیی لە بەرچاوی خەڵکە عەوامەکەیش بە زەردەخەنە و ورەی بەرزەوە خۆیان نمایش دەکەن و دەڵێن: ئیتر وایە، هەر پیاو لێیدەقەومێت، بەرخی نێر بۆ سەربڕینە!! دەی باشە ئەوەی باوکەکان دەیڵێن راستە و نامەنتوبیلاە.. ئەی دەبێت دایکی دوو شەهید و کوڕێکی چارەنووس نادیار لە چ حاڵێکدا بێ..؟ ئەمانە هەر هەموو بەلایەك، ئەی تۆ بڵێی ئەو پێشمەرگە ئازا و چاونەترس و رۆح زامدارانەی ئامۆزام چۆن بیر بکەنەوە و حاڵیان چی بێت؟ ئەی ئەو هاوڕێ وەفادار و بەغیرەتانە، هاوسەنگەری شەهیدەکان، چۆن چۆنی بیر بکەنەوە و چی بکەن؟! تۆ بڵێیت بۆ تۆڵەسەندنەوە کارێکی سەرچڵی نەکەن و رێ لە کاروانە سەربازییەکەی تیلەکۆ- کەلار نەگرن و گۆڵمەزێك نەنێنەوە؟ گۆڵمەزێکی وا کلکی گا رەشی تیا ببڕێت؟ ئەمانە کۆمەڵێك ختوورە و پرسیار بوون ئەو شەوە بە مێشکی منی زیندانیدا

دەهاتن و گوزەریان دەکرد.. ئاخر ئەوەی لەئەو رۆژانەدا دەرەنجامی چالاکی پێشمەرگە، خەڵکی شار گیرۆدەی دەبوون و دەیاننالآند بەدەستییەوە، ئەو چەرمەسەری و سەرئێشە و گیروگرفتانەی کە ئەوان تووشی دەبوون، پێشمەرگەکان پێی پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەهات!! ئەوەی لەهەموو زیاتر ئازاری دەدام و هەڵیدەقرچاندم حاڵی سەرجەم کەسوکارەکەم بوو، بۆیە شەو خەو لەچاوم تۆرا و لەدوورەوە وەك کەوێکی زەخەڵی فێڵباز و داوناس توخنی قەفەسێکی تەنراو بە قۆقۆی گورزەهۆنی کلکی ئەسپێکی بۆرە نەبێتەوە، ئاوەها لەئەو خەیاڵە تاڵ و وێنا تەڵخانە خۆم دەدزییەوە و هەوڵم ئەدا لە زەینمدا رەشیان بکەمەوە. ئەم خەیاڵ و بیرکردنەوانە تەقەزای بۆ رۆحم دەهێنا و هەڵدەستامە سەر پێ، بۆیە چەندجارێك پاسەوانی بەر دەرگاکە تێیدەخوڕیم و دەیوت: کوڕە هەی سەگی سەگباب بۆ ناخەویت؟ بیر لەچی دەکەیتەوە؟ ئەو بەئەو هەموو گێلیی خۆیەوە دەیویست رێگای بیرکردنەوەشم لێبگرێت و پەکم بخات..

لەکاتی تێکەوتنی کوتوپڕ و چاوەڕوان نەکراودا مرۆڤ تەنها بیر لەخۆدەربازبوون دەکاتەوە، بەڵام مـن سـەرکەوتوو نـەبووم و تێکـەوتم، ئـیتر بیرکردنـەوە لـەدەربازبوون خـۆگێلکردنێکی ساویلکانەیە و هیچی تر، هەرچەند سەرم دەهێنا و سەرم دەبرد رووداوەکـەم تـاوتوێ دەکـرد و پیادەچوومەوە، وای بۆ دەچووم، کە ئەم تێکەوتنە تەڵە و داوێك بوو پێشوەختە بە وردیی بـۆم نراوەتەوە.. ئەگینا ئەمە چ رێکەتێکە کە لەگەڵ دەرچوونماندا لەگوند، قافڵـە سـەربازییەکەش بگاتە ملەکە و بۆسەمان بۆ بنێتەوە؟! ئەی ئەگەر شتێکی لەئەو بابەتـە لـەئارادا نـەبووبێت، یاهەواڵی ئابلۆقەدانی دێ نەگەشتبێتە دەم ئەموئەو، بۆدوێنێ شەو زۆربەی خەڵکە قاچاخەکەی ئاوایی لەماڵ دەرچوون و تا ئێوارە نەگەڕانەوە؟! ئەی لەئەو هەموو بـەناو دۆسـت و ناسـیاوە، یەکێك نەقڵی پێدا نەشکا بڵێت: ئەم کابرایـە خـۆێنی بـە رژێمـی بـەعس حەلاڵـە بـا لەئـەم مەترسییە ئاگاداری بکەینەوە؟ ئەمەو دەیان خوتوورە و خەیاڵ و گومانی رەوا و نـاڕەوای تـرم بە مێشکدا هات.. ئاخر ناهەقیشم نەبوو، چونکە دەیان جاسووس و بێچوە خۆفرۆش دەهاتنـە دێ و دەڕۆیشتن.

ئەو شەوە تا رۆژبووەوە چەندجارێك پاسەوانی بەردەرگای بەندیخانەکە گۆڕا. کە بەندییەکان لەخەو هەڵسان یەکەیەکە لە رووخساریان وردبوومـەوە. ئیـسماعیل و محێـدین لـە هـەموویان نیگەرانتر بوون و ناهەقیشیان نەبوو، چونکە ئەوەی ئەوان بیریان لێنەکردبووەوە ئەم رۆژە بـوو، کە تێیکەوتبوون.

***

## (٤)

ئەو ڕۆژە تا دەهات هەستم دەکرد ئەندامەکانی لەشم وەکو ماری ئەنجن ئەنجنکراو دەزریکێنێت و ئازارم دەدات. لەبەر ئێشی پەراسووم زۆر بەزەحمەت هەناسەم پێدەدرا، جگە لەئێشێکی قورس، چەناکەم کلۆمی خواردووە و ددانەکانم قوڕقوشم ڕێژ کراون و دەمم بۆ ناکرێتەوە. بۆ بیست و چوار سەعات دەچوو، نە ئاو و نە خۆراك نەچووبووە سەر زمانم.. ئەو بەندییەی کە بە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، تۆپە پسکێتێکی لەژێر سەری دەرهێنا و لەگەڵ قوتوویەك ئاودا خستییە بەردەستم. هەوڵمدا پارچەیەکی لێبخۆم، بەڵام دەمم قوفڵی خواردبوو، نەدەکرایەوە. بۆیە ناچار بووم لەپێکم بخەمەسەر تەوێلم و ئەولەپەکەی ترم بەسەر چەناکەمەوە، هێزم دایە بەرخۆم، تا وەك مەنگەنە دەمم بەدەم ئازارەوە دابچڕیی، هاوەڵەکەمیش پارچە پسکێتەکەی کردە ناو ئاوەکەدا و خستییە سەر زمانم.. دیسان بە هێزی هەردوولەپم، تەوێلم بۆ خوار و چەناکەم بۆ سەرەوە پاڵ پێوەنا تا ددانەکانم گەیشتنە یەك، ئینجا پسکێتەکەی ناودەمم بەزمان گلماند و قووتمدا. ئەم حاڵەتە زیاد لە پێنج ڕۆژی خایاند، تا کەمکەمە ئاوسانەکەی دەم و چەناکەم دامرکایەوە.

ئەو ڕۆژانە لەناو بێدەنگییەکی سامناك و خنکێنەردا بیرم دەکردەوە، بەڵام بیرکردنەوە لە چی؟ هیچ یەك لەپیاچوونەوەکانم بۆ نەدەچوونە سەر، شەپۆلێکی تر دەهات و بۆ قووڵایی گێژەنێکی تر ڕاپێچی دەکردم.. چاوم لەسەر هەر خاڵێك لەناو ژوورەدا گیر دەکرد، کەریمی برام بە زەردەخەنە شیرین و پڕ هیواکانییەوە ئامادەبوو، لەناو تەمومژێکی خەستەوە دەردەکەوت و بەرەو رووم دەهات، کە دەمڕوانی کەریمەکەی ڕۆژێك بەرلە ئێستایە، بە دوو چاوی هەڵۆئاسا و بە بزەیەکی پڕ ماناوە، بە بێنەوەی لێو هەڵبێنێت، ڕادەوەستێت و تێمدەڕوانێت، تێڕوانینەکەی ئەوەندە بەسام و بە هەیبەت بوو، توانای خۆڕاگرتنم لەبەر دەبڕا و تەریق دەبوومەوە، بۆیە هەردوو لەپم دەخستە سەرچاوم و سەرم دادەنواند، کەچی ئەو وەك تیشکی هەتاو پێست و ئێسقانی پەنجەکانمی دەسمی و دەهاتە ناو چاوانمەوە، بە هەرلایەکدا ڕووم وەردەچەرخاند، ئەو بەهەمان ڕووخساری گەش و بە زەردەخەنە شیرینەکەیەوە، کە هەرگیز لێیدانەدەبڕا، ئامادەبوو، من لە ئەو وێنە ئازار بەخشانە خۆم نەدزییەوە، هەوڵمنەدا فەرامۆشیان بکەم، بۆیە بە وێنەی جاڵجاڵۆکە، بە دەزووی خەیاڵدا هەڵدەزنام و دەڕۆیشتمەوە ماڵی باوکم و

دەمڕوانی، بەردەم ماڵ و ناوحەوشە و ژوورەکـان جمـەیان دێـت لـە ئـافرەتی عابـا بەسـەر و ڕەشپۆش، دەنگی شیوەن و قژ ڕنینەوە، براڕۆ و باوکەڕۆ و گریانە، لەناو ئەو حەشاماتی ژنـەدا تەنیا دایکم نەدەگریا، ئاخر ئەو سەرچاوەی فرمێسکەکانی وشکی کردبوو، خۆ ئەگەر کـەمێك بەدەنگ بگریایە ئەوا هۆن هۆن فرمێسك لە دەنگییەوە دەڕژایە کۆشـی و هـەر زوو پەشـیمان دەبووەوە و دەیگوت: تۆبە خوایە.. تۆبـە لێمنـەگریت، خوایـە مـن دەزانم لەمـە خراوتریـشت هەیە.. خوا لەمە خراوترم پێپیشان نەدەیت..

لەوێشدا چاو دەگێڕم و دەڕوانم، کەریم بەسەر جێخـەوی سـەربانەکەی خۆیـەوە، بەهـەمان ڕووخساری شیرینەوە ڕاوەستاوە، وەردەچەرخێم بەرەو ڕەشماڵی هەڵدراوی پرسەی پیاوان، ئەو بە پێش دەرگای ڕەشماڵەکەوە ڕاوەستاوە و میوانەکان بە بۆنـەی مـەرگی منـەوە، سەرەخۆشـیی لێدەکەن، دەم و چاوم دەخەمە نێو هەردوو لەپم و بـە تونـدی دەیگوشـم و دەیـوڵم، کـەمێك دێمەوە سەرخۆ..

ڕووی دەم دەکەمە محێدین و دەپرسم: کەریم چۆن کوژرا؟ هاا.. دوورە گوللە پێکای؟

ئەو وتی:

- کاتێك ئێمە لە دەربازبووندا بووین و تۆ دواکەوتیت، ئەو وتی: کـاکم دەسـگیر کـرا و تیاچوو.. جا ئیتر من دونیام بۆ چییە؟ پاشان دەمانچەکەی هەڵکێشا و ئیتر نازانم..

- جا ئەگەر واش بێت، تەنیا پیاوی بوێر و بەغیرەت دەسـتی دەچـێتە خـۆی و دەتوانێـت خۆی بکوژێت..

ڕۆژێك بەر لە لێقەومانەکەمان، من باسی هاتنی سوپا و ئابڵوقەدانی گونـدم بـۆ دەکـرد، کەریم وتی: کاکە ئەمانە دڕندەن.. دڕندە. پیاو کە زانی بەردەستیان دەکەوێت گوللەیەك بنێت بە کەللەسەری خۆیەوە و خۆی بکوژێت.. پیاو مردنێکی لەپێشدایە، ئاخر بیرکردنەوە لە مردن ترسناکە نەك خوودی مردن خۆی، مردن خەوتنێکی ئاساییە، بەڵام ئەوەنـدە هەیـە بەخەبـەر نایەیتەوە..

یەکەم شەو پاش کۆتایی یەکـەم بەشـی پرسـیار و وەڵام، کـە لـە تارمەکـەدا دانرابـووم، سەربازێك لە یەکێکی تری پرسی: کێ کەریمی کوشت؟ ئەوی تر وتی: جاسم کوشتی..



## (٥)

پاش نیوەڕۆ سەربازێك هات و لە نێوان دوو شیشی سەر دەرگای زیندانەکەوە تەماشایەکی ناو ژوورەکەی کرد و پرسی:

+ کێ ناوی (سەعید)ە؟

من وەرچەرخام و وتم:

- منم؟

ئەو وتی: براکەت لە دەرەوەی سەربازگەکە راوەستاوە و داوای لێکردم، کە سۆراخت بکەم..

ئیتر هیچی تری نەوت، بەپەلە پشتی لە دەرگاکە کرد و رۆیشت. هەواڵپرسین و شێوەی قسەکردنی ئەم سەربازە زۆر سەیر و سەرسوڕهێنەر بوو بەلامەوە.. ئاخر من برای وام کوا لەئەم کات و ساتە کارەساتاوییەدا کونجی زیندانم بۆ بگەڕێت؟! تەنها ئیدریسی تەمەن دوانزە ساڵیم ماوە و بڕوایش ناکەم بوێرێت، یان گەورەکان رێگای پێبدەن نزیك ئەم شوێنە ترسناکە بکەوێتەوە.. بڕێك مێشکم ئاڵۆز بوو، بەدەم بیرکردنەوە و لێکدانەوەوە سەرم هەڵبڕی، چاوم لەسەر هەواکێشی بنمێچەکە گیرسایەوە، کە بەرانبەر بەدەرگای سەرەکی سەربازگەکە بوو، چاوێکم بۆ پاسەوانەکە گێڕا، کە بینیم دوور راوەستاوە، داوام لە بەندییەك کرد بۆم بچەمێتەوە تا بچمە سەر پشتی و تەماشایەکی دەرەوە بکەم، بەڵام بەندییەکی تر لە جیاتی من بە ئەو ئەرکە هەڵسا و گورج سەرکەوتە سەر پشتی زیندانییەکی تر و تەماشایەکی بەپەلەی کرد، هەر بەپەلەش خۆی هەڵدایە خوارەوە. وتم: هیچت بینیی؟

- تاکسییەکی جۆری کراونم لە دەرەوەی دەرگا سەرەکییەکە بینیی، پیاوێکی کەمێ قەڵەو بە تەنیشتیەوە راوەستاوە و تەماشای ئەم ژوورەی خۆمان دەکات..

من لە دڵی خۆمدا وتم: هەبێت و نەبێت ئەو کابرایە (عەبدوڵا)ی ئامۆزامە، ئەگینا کەسی ترمان نییە هێندە نەترس و چاو قایم بێت کارێکی وا سەرچڵی بکات.. ئاخر هەر ئەویش تاکسی (کرۆنا)ی هەیە و ئەم بە (کراون)ی زانیوە.. لە رووییەکەوە پێمناخۆش بوو، ئەو کارێکی ئاوا خەتەرناك ئەنجام ئەدات، بەڵام لە رووییەکی تریشەوە بۆ دڵنیایی خۆیان پێمچاك بوو، چونکە ئیتر دەزانن لە (ئێرەم و هێشتا ماوم، لەئەم تاوتوێکردنانەدا بووم سەربازێك زۆر

بە شپرزەیی، غەزەب لە ناو چاوانی دەباری، هاتە بەر دەرگای زیندانەکە، ئەم سەربازە ئەوەندە کولەبنە و گەنەڵە و فیجەڕە بوو، وادیار بوو لە سەر نووکی پەنجەکانی پێی راوەستا بوو، ئەوساکە بە ئاستەم چەناکەی گەیشتبووە سەر پەنجەرەی بان دەرگاکە، وێنەی سەگێکی هار و تەنگەتاوکراو، سەرە چەکوشییەکەی لە شیشی سەر دەرگاکە توند کرد و لمۆزی هاوردە ژوورەوە، بەبێ چاوگێڕان و هەواڵپرسین، یەکسەر رووی دەمی تێکردم و وتی:

- تۆ.. تۆ هەتیو، پێمبڵێ ئەو کەسە کێ بوو، کە هات بۆ لات و هەواڵی پرسیت؟ لە رێکخستنە نهێنییەکانی ناو شارە، وانییە؟ دەتەوێ چیت بۆ بکەن؟ وا دەزانیت دەتوانن فریات بکەون؟ دەی زوو پێمبڵێ ئەو کابرایە ناوی چییە؟ ماڵیان لە کوێیە؟ زوو قسە بکە.. دەی.

پەیتاپەیتا پرسیاری ئاڕاستە دەکردم و هەر خۆیشی وەڵامی ئەدایەوە، من بەساردییەکەوە پێمگوت:

+ رێکخستنی چی و کابرای چی؟ هیچ نازانم.. تەنها سەربازێك هات و هەواڵی ناوی پرسیم.. ئیتر هیچ نازانم.

- سەربازەکە ببینی دەیناسی؟

+ ئەو..

- هەی کوڕی سەگ، دوێنێ شەو رزگارت بوو، بەڵام بە (عەلی) قەسەم دەبێت ئەمشەو لە ژێر کێبڵدا بتکوژم..

+ بێمنەت بە..

- بێمنەت بم هەی کوڕی قەحپە؟ چاوەڕوانبە شەو خۆت دەبینیتەوە..

سەروسەکوتی ئەم سەربازە، کە لە سەگ پیستر دەرشایەوە، وەك خەیاڵ هاتە بەرچاوم، رووخسارە دزێوەکەی رووخساری هەمان ئەو سەربازە بوو، کە لە سەرەتای دەستگیرکردنمدا بەسەر پشت و ملمەوە هەڵبەز و دابەزی دەکرد و بە پێلەقە دەیشێلام و تا ئێستاش کەفوکوڵی دانەمرکاوەتەوە.. ئەگەر بۆی بکرێت لە نێوان هەردوو شیشی نێو دەرگاکەوە دێتە ژوورەوە و هەر بە زیندوویی پێستم دەگرێتەوە.. ئەو بەدەم پەنجە راوەشاندنەوە وتی: شەو خۆت دەبینیتەوە.. ئیتر هەر بەو شپرزەییەوە پشتی هەڵکرد و رۆیشت..

لامکردەوە لای هاوەڵە زیندانییەکەم و پێموت: وا دیارە ئەم گورگەبۆرە، ئەمشەو بە راستی نیوەکوژم دەکا.. دەی با ئەمجارەش خۆی تاقیبکاتەوە، من دەبێت لەم رۆژەدا لە ئەشکەنجە و جوێنی پیس و شکاندنی کەرامەت بەولاوە چاوەڕوانی چی لەئەم بوونەوەرانە

بکەم، کە بەقەد نووکی دەرزییەك رۆشنایی لەدڵ و دەروونیاندا نییە؟ دەی چی رووئەدات با بیدات.. سیروان لێتدەم دەمبەیت، لێشت نەدەم هەر دەمبەیت؟ جا ئەمە کەی سیروانە؟ ئێرە چەقی زریانی غەزەبی (سەدام)ە و بۆی بلوێ سەرچاوەی سیروانیش چیمەنتۆرێژ دەکات و نووزەی لێدەبڕێت، تا هیچ بوارێك نەمێنێتەوە بۆ ژیان.

پاش دواهەڕەشەی سەربازەکە، هەر نیوکاتژمێکی خایاند، یەك دوو فیتەی سەربازییم گوێ لێبوو، کە ئاماژە بوون بۆ گردبوونەوەی سەربازەکانی ئەو یەکەیە، گردبوونەوەکە ناوەخت بوو، بۆیە دڵم داخورپا. من لەوە دەترسام پاش کۆکردنەوەی سەربازەکان دەرمکەنە دەرەوە و داوای دەسنیشانکردنی سەربازی سۆراخکەرم لێبکەن، من لە تاوتوێکردنی ئەوەدا بووم، کە ئەگەر دەریان کردم بۆ دەسنیشانکردنی سەربازەکە، چۆن بکەم و چ بڵێم؟ کاتێکم زانی دەرگەی زیندانەکە کرایەوە و پاڵیان نا بەپیاوێکی تەمەن سەروو پەنجا ساڵییەوە، هەر کە هاتە ژوورەوە چاوێکی بەپەلەی بە ناو زیندانەکەدا گێڕا و وتی: (هیدایەت)یان نەهێناوەتە ئێرە؟ ئەی رۆڵەرۆ، دەبێت ئێستە ئەو لەکوێ بێت و چییان بەسەر دا هێنابێت؟ وا دیار بوو (مام ئەحمەد)ی بە تەمەنیش لە ئازاردان بێبەش نەکرا بوو. زۆری نەخایاند دیسان دەرگاکە کرایەوە و بەدەم زەبری پاڵنانێکی بە هێزەوە هیدایەتیش کرایە ژوورەوە. ئەم کوڕە چاوی راستی شین و مۆر هەڵگەڕابوو، لەبەر خۆیەوە جوێنی بە رژێم و دارودەستەکەی دەدا و دەیبۆڵاند، مام ئەحمەدی باوکیشی داوای ددان بە خۆدا گرتنی لێکرد و بە شێوەی فەرمان پێیگوت: دانیشە.. هیدایەت لەگەڵ دانیشتنیدا هەواڵی سەعیدی برای لە باوکی پرسی و هەر خۆیشی وەڵامی دایەوە وتی: کوا؟ خۆ لێرەش نییە..

من لە ئەو کاتەدا هەموو شتەکانم بۆ روون بوویەوە، تێگەیشتم ئەو رۆمەڵغەزایەی چەند تاوێك بەر لە ئێستە کە لەئەم سەربازگەیەدا روویدا هۆی چی بوو!! بۆیە چپاندمە گوێی هاوەڵەکەمدا و پێموت: ئەو سەعیدەی کە سەربازەکە هەواڵی پرسی، من نەبووم، بەڵکو سەعیدی کوڕی ئائەم مام ئەحمەدە و برای هیدایەتە، وا دەردەکەوێت نەشکەنجە و تێهەڵدانی ئەم شەوم بەنسیب نابێ.. سەربازەکەش کە هەڕەشەی کوشتنی لێکردم مایەپووچ و رەنج خەسار دەرچوو..

هیدایەت هەر ئاخ و ئۆفی بوو، هاواری لەپشتی دەکرد، بۆیە چوومە پێشەوە بۆ لای و چۆخەکەیم لەبەر داکەند، کراسەکەیم هەڵدایەوە بان شان و ملی، پاشان فانیلە سپییەکەیم، کە گوڵ گوڵ پەڵەی خوێنی گرتبوو، بەرەو سەرەوە هەڵماڵی، کە سەیرم کرد مافی ئەوەم پێدا

ئاخونۆف و هاوار بکات، چونکە تەختی پشتی بە کێبڵ ئەنجن ئەنجن کرابوو، زیچکەی خـوێنی دەهات، بۆ ئەوەی پشتی کزر ببێتەوە و فانیلەکەی بە پێستەکەوە نەلکێ، بە مەقەباکەی ژێری خۆم کەوتمە باوەشێنکردنی تا کەمێك ئافاقەی بۆ هات و هێور بووەوە.. ئینجا وەرچەرخام بۆ لای مام ئەحمەد و خۆم پێناساند، پاشـان هـەواڵی مـاڵی بـاوکم لێپرسـیی، ئـەویش کەوتـە قسەکردن و وتی: یەکەم شەو تەرمەکەی کەریم لە ئەخۆشـخانەی کـەلار مایـەوە، بـۆ بـەیانی وەریان گرتەوە و بە خاکمان سپارد، هەر لە پێش ماڵدا رشماڵمان هەڵـدا و پرسـەکەی یـەکجار قەرەباڵغە، باوکیشت خۆڕاگرە و وەزعی خراپ نییە، بەڵام خەمی تۆیەتی..

من ماوەیەك بوو وازم لە جگەرەکێشان هێنابوو. هیدایەت جگەرەیەکی بـۆ راکێـشام، بـە دوودڵییەوە دەستم بۆی راکێشا، چونکە لە گەڵ (سەلام)دا بەڵێنمان بەیەکتر دابوو، ئیتر جگەرە نەکێشین، ئەوەشم دەزانی و دڵنیابووم، کە ئەو لەم لێقەومانەدا جگەرەی هەڵگرتووەتەوە، بۆیە منیش بەڵێنەکەم شکاند و دامگیرساند، پاشان هۆی دەسگیرکردنیانم زانی.

دوێنێ پاش دەسگیرکردنی من، هەمان هێزی سەربازیی سەعیدی بـرای هیـدایت دەسـگیر دەکەن، بۆ هەواڵپرسینی، هیدایەت دێتـە نزیـك ئـەم سـەربازگەیە و بەرێکـەوت سـەربازێکی کوردی بەغایی کە پسوولەی موڵەتەکەی بەدەستەوە دەبێت نیازی سەفەری هـەبووە، لـە بـەر دەرگا دەبینێت و تکای لێدەکات سۆراغێکی براکەی بۆ بکات، لەگەڕانەوەیدا، کـە وتبـووی سەعیدی برای لێرە بەندە، بـە دڵخۆشـییەوە دەگەڕێتـەوە و باوکیـشی کـە لەسـەر جادەکـە چاوەڕوانی کردبوو هەڵدەگرێت و دەگەڕێتەوە بۆ ئاواییەکەی خۆیان، بەڵام کە دەگەنە بازگەکـە ئۆتۆمبێلێکی قیـادەی سـەربازیی پێـشی لێدەبڕێتـەوە، بـە قـسەی هیدایـەت، سـەربازێکی کوڵەبنەی ئەسـمەر لـە ئۆتۆمبیلەکـە دادەبـەزی و دەسـوبرد هـەردووکیان قۆڵبـەس دەکـات و دەیانهێنێت بۆ ئێرە، جا هیدایەت ترسی ئەوەی لێژیابووەوە، کـە ئـەو کامیرایـەی، کـە پێـی گیرابوو بکەنە بەڵگەیەکی خراپ و تۆمەتی قورسی بدەنە پاڵ. هیدایەت بە منی وت: کە چاوم بە تۆ کەوت ئەوسا حاڵی بووم، ئەوان وایان دەزانی ئەم هات و چۆیەم پەیوەندی بە تۆوە هەیە، بۆیە ئەو گشت تێهەڵدانەم خوارد!!

بە هیدایەتم گوت: ئەگەر ئێوەیان نەگرتایە ئەوا بڕیار بوو ئەمشەو لەژێر کێبڵـدا هەناسـەم لێبچنن، گرتنی ئێوە هێچ نەبێت منی لە سین و جیم و دار و فەلاقەی ئەمشەو رزگارکرد.



## (٦)

ئەم بەندیخانە ژوورێکە بە پانتایی دوانزە مەتر دوو جایە و نۆ گەنجی کوردی تیادا زیندانی کراوە. لەم ژوورە تەنگ و پیسەدا هەست دەکەم رۆژانە و سات لە دوای سات دەم و چەناکەم ئازاری زۆرتـرم دەدات و پەنەمانەکەی زیاتر تەشەنە دەکـات. پەراسووەکانی لای راستم وەك چووبن بەیەکدا ئاوا دەئێشێن و بەدەم هەناسەدانەوە دەچمە یەك. زۆرجار هاوەڵە زیندانییەکانم سەموونی عەسکەریی یان پسکێتم لە ناو ئاودا بۆ دەخوسێنن و پاشان خۆمیش لەپێکم دەخەمە سەر تەوێڵم و بەئەو لەپەکەی تریشم چەناکەم و دەمم دادەبچڕم ئینجا دوای ئەوەی پسکێتەکە، یان سەموونە خووساوەکە لەدەم دەنێم وەك مەنگەنە چەناکەم بۆ سەرەوە و تەوێڵم بۆ خوار پاڵ پێوە دەنێم تا دێنەوە یەك، دواتر بەزمان دەیگلێنم و قووتی دەدەم، پاش پێنج شەش رۆژێك بەرەبەرە ئازاری پەراسووەکانم کەم بووەوە و چەناکەشم وردەوردە کەوتەوە جوڵە.

لەئەو زیندانەدا رۆژی جارێك دەیانبردینە سەرئاو. ئیتر خودا خراپی بۆ ئەو کەسە دەکرد کە ژان و با یەك بە سکیدا بهاتایە، دەبوایە وەك رەشمار پێچ و لوولی بخواردایە تا دەروویەکی لێدەکرایەوە، ئەگینا قوژبنی ژووری زیندانەکە لەخزمەتیدابوو. هاوەڵەکانی بەمقەبایەك نیمچە پەرژینێکی بۆ دەکردن و تەق و هوڕ خۆی بەتاڵ دەکردەوە و بۆن لە ژوورەکەدا پەنگی دەخواردەوە.

پاش پێنجەمین رۆژ ئیسماعیل و محێدینیان لەوێ دەرکرد و نەهاتنەوە. دوا بەدوای ئەوانیش مام ئەحمەد و هیدایەت ئازاد کران. من دوغلی مام ئەحمەد بووم، تا هەواڵم بگەیەنێتە ماڵی باوکم. هیدایەت چوار پاکەت جگەرەی پێمابوو، بۆی بەجێهێشتم.

کە ئەو چوار نەفەرە وەدەرنران. ژوورەکە چۆڵی پێوە دیاربوو، بەڵام وەك هەموو بەندیخانە جیاجیاکانی رژێم نەدەبوو چۆڵبێت.. زۆری پێنەچوو عەلی مێردمنداڵ و زیتەڵەیان تەپاندە ژوورەوە. ئەو ژوورەی کە بەندیخانەی ئیستخباراتی لیواکەی بارق بوو، دوانزە رۆژی رەبەق بەبێ پرسیار و وەڵام لێیمامەوە، تا نیوەڕوانێك لەگەڵ عەلی و دوو زیندانی تردا ناویان خوێندینەوە و بەبێ دەست و چاوبەستنەوە، کە بەلای

منەوە مانایەکی خراپی نەدەبەخشی، دەریانکردینە دەرەوە، بەدەم دەرگاکەوە روانـیم ئیڤایەکی سەربازیی چەند هەنگاوێك ئەولاتر راگیراوە، لامکردەوە مامۆستا حەسەن حەیدەری هاورێی قوتابخانەم بەرچاو کەوت. پاشـان بـۆم دەرکـەوت، لـە ئـەو یەکـە سەربازییەدا شۆفێر بوو. ئەو هەر کە چاوی پێمکەوت رەنگی تێکچوو، چاوە گـەش و گەورەکانی ئەبڵەق بوون. من لە سەرسامییەکەی ئەو گەیشتم، بەلاّم کێ حەدی ئەوەی هەبوو ئا لەوێدا بڵێت: لەل.. ئاخر کورِ ئـەو کـورِە بـوو، لـەژێر دەسـەلاّتی بەعـسدا بیگوتبایـە یـان بینووسـیبایە: لـەل.. حەسـەنیش وەك مـن، کۆمـەڵێك شـەهید و پێشمەرگەی هەبوو، دەبوایە خۆی لە سێ و جیم بپارێزێت و دەس بەسـەر کلاّوەکەیـدا بگرێت، ئەوەك رەشەبای رژێم، کە هەردەم وەك گەلەگورگ دەیلووراند، بیبـات. کـە سواریان کردین چوار سەربازی چەکدار بـەر دەرگاکـەی لێگـرتین. ئیڤـا بـەرەو کفـری کەوتەرێ، کە دێی سەیجەژنی تێپەڕاند و گەیشتە نزیك دێـی ناسـالّەح، چـەن جارێـك پەلاماردانی چەکی دەستی یەکێك لە سەربازەکان و خۆهەڵدانە خـوارەوەم بەمێـشکدا هات، بـەلاّم کـە وردم دەکـردەوە دەگەیـشتمە ئـەو ئەنجامـەی کـارێکی لـەو بابەتـە خۆکوژییەکی رووت و پەتییە.. ئاخر لەو کاتەدا ئومێـدی ئـازادکردنیش وەك خونـچە گوڵێکی ژاڵەی تاڵ لەدڵمدا چـەکەرەی کردبـوو!! ئـەوەش هۆیـەك بـوو لـە بیرۆکـەی پەلاماردان پەشیمانی دەکردمەوە.. ئیڤاکە گەیشتە ناو شاری کفری و بەرەو دایـەرەی ئەمن رۆیشت، بەلاّم لەوێ لاینەدا، تا گەیشتە بەردەرگای بەڕێوەبەرایـەتی پۆلیـسی شار، لەوێ دایان بەزاندین و کردمانیان بەژووری بەندخانەکەدا.

***

بەئەو قرچەی هاوینە، لەئەو گەرمیانەدا و بەسەربردنی دوانزە رۆژ لـە ژوورێکـدا، کە پانتاییەکەی دوانزە مەتر دووجای پیس و گەنیو بێت، جگـە لـەوەی مـرۆ دەکاتـە پارچەیەك گۆشت و پێـسەی خۆشـەنەکراوی بۆگـەن، لەئـەو بـاوەڕەدام رووخـسارێکی پێدەبەخشێ، کە لە ئاژەڵی ناو گەورِی زستانان بـچێت، نـەك مـرۆڤ، هـەر بۆیـە کـە چـووینە ژوورەوە هەسـتم کـرد زیندانییـەکان لەبـەر بـۆنی ناخۆشـی ئێمـە دڵیـان هەڵدەشێوێت. یەکێك لە بەندییەکان، پاشان زانـیم پۆلیـسکی عـارەبی هـەڵهاتووە و لەوێ بەندکراوە، زۆر بێشەرمانە و بە دەنگی بەرز وتی: ئێێێیععع.. ئـەم گەنیوانـەیان لەکوێوە بۆ هێنـاوین؟ مـن بـەدەم هەڵوەسـتەوە خێـسەیەکم لێکـرد، خێـسەیەکی وا

دەبوایە دوو مشت و پێلەقەیەکی بەدوادا بهاتایە، بەلاّم یەکێك لـە بەندییـەکان، کـە ئەویش هەر عارەب بوو، پاش ئەوەی چاوی لە ئیێعکەر سوورکردەوە، پێیوت: هەتیو تۆ شەرم لەخۆت ناکەیت؟ منی کەمێك هێوری کردەوە، بۆیە بـەرەولای وەرچـەرخام و بە زەردەخەنەیەك پێزانینی خۆم بۆ هەلوێستەکەی نیشاندا، ئەو دەستی درێـژ کـرد و سەرشۆرکەکەی نیشاندام. منـیش بەپەلـە خـۆم پیـادا کـرد. دەسـشۆرکەکە دوونیـوە سابوونی بە سەرەوە بوو، بە هەلم زانـی، جلوبەرگەکـەم بەپەلـە لەبەرداکەنـد و لـەژێر خۆمدا رام خست و ناوێکم بەخۆداکرد، ئینجا یەك دوو دەسـت سـابوونم لـە جلـەکان سوی و فانیلەی بانگۆشت و دەرپێ قوتەکەم گوشـی و لەپێمکردنـەوە، پاشـان بـانگی عەلیم کرد جلەکانی تری لەگەڵدا گوشیم و هـەر بـە تـەڕیی لەبـەرم کردنـەوە، بۆیـە بەگورجی ئەم کارەم ئەنجامدا، چونکە دەمزانـی مامۆسـتا حەسـەن خـزم و کەسـەکانم ئاگادار دەکاتەوە و هەر ئێستا دێن بۆ سەردانیم. مـن لەئـەم بیرکردنەوەیـەدا بـووم، مامۆستا حەسەن، بەجلوبەرگە سەربازییەکەیەوە زوو هاتە سەردانم. پاش سەرخۆشـی لێکردنم وتی: کاتێك لەزینданی ئیستخباراتی کەلار بینیتم زۆر سـەیربوو بەلامـەوە کە نەمزانیبوو لەوێ بەند کراویـت، ئـەگینا بەهـەر نرخێـك بوایـە دەمتـوانی بێمـە دیدەنیت، کە هێناتیشیان بۆ ئێرە و بینیم چاو و دەسـتیان نەبەسـتوویتەوە، کـەمێك سەرسـامییەکەم رەوییـەوە، لـەوەش زیـاتر کـە وەختێـك زانـیم بـۆ پۆلیسـی کفـری دەتگوێزنەوە ئیتر تەواو دلنیابووم، کە مەترسـیت لەسـەر نییـە و تۆمـەتی قورسـیان نەداوەیتە پال، خۆ ئەگەر بزانیایە لە خەتـەردایت، بـاوڕ بکـە بـە سـەرباز و ئیڤـاوە دەمفڕاندیت بۆ ئاوایی (هۆمەرمل) و دەربازم دەکردیت. جا ئەوساکە هەرچـی دەبـوو بابایە، ئێستەش دەچم خزم و کەسەکان ئاگادار دەکەمەوە.



## (٧)

بەندیخانەکانی باقووبە و کفری، ماڵی دووەمــی فــەقێ عــەلی مــامم و کەســوکارەکەی بوو.

پیاوەکانی ئەمن و پۆلیس و ئیستخبارات، ئەوانەی لە ناوچەکەدا بەرپرس بــوون، وەك خۆی مامم و ئەندامانی بنەماڵەکـەیان دەناســین. مــامم هــەرکاتێك کــە لەزینــدان ئــازاد دەکرا، دەستە پێخەفەکەی لەگەڵ خۆدا نەدەبردەوە بۆ ماڵ، کە لێیاندەپرســی هــۆی چــییە پێخەفی نووستنەکەی ناباتەوە لەگەڵ خۆیدا؟ ئەو دەیوت: من دەزانم چەند ڕۆژێکی تر دێن راپێچی زیندانم دەکەنەوە و دەبم بە میوانتان، بۆیە پێمچاکە ئــەم دەســتە پێخەفــەم وەك ئامانەت لەلاتان بەجێبهێڵم و باری خۆم قورس نەکەم!! ئــەو ئەگەرچــی هــەردەم پیــاوێکی جوان و تەرپۆش بوو، بەڵام کە سووسەی گرتنــی خــۆی بکردایــە، گــورج ریــشی پــاك و پووختە دەتاشی و جوانترین و تازەترین جلوبەرگی لەبەر دەکرد. ئەو باوەڕی وابوو، کە بەو پۆشتە و پەرداخەوە، پۆلیس دەیداتە پێش خۆی و دەبینرێــت، دۆســت بــالآی پێــدەکات و ناحەزانیشی داخی پێدەخۆن..

زۆری پێنەچوو، کە خزم و کەسەکانم هــەواڵیان زانــیم بــەتاك و جــووت و بــە کۆمــەڵ، ڕوویان کردە بەندیخانە و هاتنە سەردانیم، یەکەم کەس مامم بوو لەگەڵ عەبدوڵای کوڕیــدا هات. ئەو ڕۆژەش ئەو بە سروشتی ئاسایی خۆی پیــاوێکی جوانپــۆش و بەهەیبــەت خــۆی نواند. هاتە ژووری زیندانەکە، بەوپــەڕی ڕووخۆشــییەوە، پــاش چــۆن و چــاکی لەگەڵمــدا، سڵاوی لە بەندییەکان کرد. دیاربوو نیگەرانی لەڕووخسارمدا خوێندبووەوە، بۆیــە کەوتــە دڵدانەوەم و وتی: کوڕم بەغیرەتبە، قــەت خــۆت بــە زەلیلــی نیــشان نــەدەیت، هــەر پیــاو لێیدەقەومێت، ئەمە لێقەومان نییە، بەڵکو سەربەرزییە بۆ خۆت و بنەماڵەکــەت، ئــەوەی لەناو بدات تــەڕدەبێت، خــۆ تــۆ لەدزیــدا نــەگیراویت.. لەڕاســتیدا ئــەو نەیــدەزانی مــن ئەوەندەی بیر لە کەسە نزیکــەکانی خــۆم دەکەمــەوە، کــە بوومــە بەخەفــەتێکی گــەورە و چوومەتە کۆڵیان، بیر لەخۆم ناکەمەوە.. ئێ خــۆ نەشــدەکرا لەوێــدا دڵــی خــۆمی بــۆ واڵا بکەم، بۆیە هەر بە بێدەنگی مامەوە.

عەبدوڵایش کە تەمەنێکی زۆری لەزیندانەکاندا گوزەراند بوو، هاتەبەر دەرگاکە، ئەو بەئەو تەمەنە کەمەوە، پیاوێکی بە ئەزموون و بەغیرەت بوو، بەڵام کە چاوی پێمکەوت، خۆی پێڕانەگیرا و دایە پرمەی گریان.. من لەگریانەکەیدا ئەوەم خوێندەوە، کە دەیەوێت بڵێت: ئاخر بۆ هەر بەردێك لەئاسمانەوە بکەوێتە خوارەوە دەبێت بکێشێت بەسەر یەکێك لە بنەماڵەکەی ئێمەدا!!

پاشان (عوسمان)ی پوورزای مارانگەستە، یا راستتر وایە بڵێم: (ئەمن گەستە)ی کفری هاتە پێشەوە.. عوسمانێکی وریا و ژیر و دووربین.. بەڵام لەژێر حوکم و دەسەڵاتی رژێمێکدا، کە بەبێ مژینی خوێنی مرۆڤ ناتوانێت ئیدامە بەژیانی خۆی بدات، وریا و ژیریی دادی کێ ئەدات؟ ئەو بە تۆمەتی ئەوەی جلوبەرگ بۆ خاڵۆزا پێشمەرگەکانی دەدروێت، کەوتە بەر ئازار و ئەشکەنجەی دەزگا ئەمنییەکانی شار.. هات و هەواڵی تەندروستی پرسیم، من دەمزانی بەئەو هەموو رەوانبێژیی و دووربینییەی خۆیەوە لەو کاتەدا قسەیەکی نییە بۆ وتن بشێت، بەڵام لە چاوەکانیدا شارایەك داخ و حەسرەت و کەمێك سەرزەنشتم خوێندەوە.. سەرزەنشتێك خۆی لە چەند پرسیارێك ئاڵاندبوو، دەیگوت: من چاکت دەناسم، ئاخر تۆ کەی ئەوەندە گێل و کورتبین بوویت؟ کێ هێناتییە سەر ئەو رایە تا لەم کاتە ئاڵۆز و ناسکەدا نزیك شار ببیتەوە و بێترس پشتوێنی لێشل بکەیت و هیچ حیسابێك بۆ ئەو هەموو سەگ و گورگە نەکەیت، کە بەئەو رێگایەدا دێن و دەچن و قسەی زۆری تریش. ئەو دوو کیسەی نایلۆنی بە دەستەوە بوو، بۆی راکێشام، یەکێکیان دەستێك بێجامەی بازاڕیی تیادا بوو، ئەوی تریان مریشکێکی برژاو، یەك لەدوای یەك هەردوو کیسەکەی دایە دەستمەوە و وتی: کە بۆ لای تۆ دەهاتم (س) هەواڵی پرسیت و بەپەلە ئەو مریشکە برژاوەی بۆ کڕیت و وتی: سەڵاوی گەرمی منی پێبگەیەنە، زۆریشم پێناخۆشە کە تووشی ئەو کارەساتە هاتووە و پێیبڵێ هەر سەریشی لێدەدەم..

ئەو چەند رۆژە کە لە بەندیخانەی پۆلیسی کفری مامەوە، (س) هەر نەهات!! دوایی بۆم دەرکەوت بەناردنی مریشکی برژاو دەیەوێت چی بخاتەوە بیرم.

ساڵی ١٩٧٤ بوو لەناوچەی هەورامان دەمەقاڵەیەك لەنێوانماندا روویدا. من خراپ لە روویدا وەستام، دوایی کە بۆم ساغ بووەوە و دەرکەوت غەدرم لێکردووە، پەشیمان بوومەوە، بەڵام کاتی زۆری بەسەردا تێپەڕیبوو، بۆیە پەشیمانی دادی نەدام، وا ئێستا ئەو

ئاقلانـه بـه دوو لاق و سـینگێکی سـوورەوە کـراوەی گـەرمی مریـشکێك دەزانێـت چـی دەخاتەوە بیرم! ئەگەرچی من لەژیانمدا هەرگیز باوەڕم بە تۆڵە سـەندنەوە نـەبووە، کەچـی (س) شیرینتر بوو لە بەرچاوم، چونکە تۆڵە سەندنەوەکەی سەردەمانە بوو..

ئەو رۆژە بەرپرسی بەندیخانەکە رێگای لەو کەسانە نەدەگرت کـە تـاقم تـاقم دەهاتنـە سەردانیم. پـاش عوسمـان چـەند ئافرەتێـك لـە خـزم و کەسـەکانی خـۆم بـوون و رەشـیان پۆشیبوو، خۆیان کرد بە حەوشەکەدا و لەبـەر دەرگـای ژووری زیندانەکـەدا گلێربوونـەوە، یەکێکیان خۆشکی خۆم بوو، کە چاوم پێیانکەوت بەرچـاوم تاریـك داهـات و مـەرگم بـە ئاوات دەخواست.. ئاخر هەر ئێمەی پیاوین لەهەر کوێ بین، دەسەڵاتدار یان بێدەسـەڵات، خوشك و دایکەکان تووشی دەردەسـەری و هەڵقرچان دەکەین، جگە لەوەش من نەمـدەزانی لەوکاتەدا بە چ زمانێك لەگەڵیاندا بدوێم، ئاخر داکورکانـدن و بـە کـوڵ گریـانی ئافرەتـە کۆسکەوتووەکان وەکو: هەرەی کارەبایی رۆحـم کەرتکـەرت دەکـات و خـۆم پێڕاناگیرێـت، بەڵام ئەو رۆژە وەکو پیاو ددانم بە خۆدا گرت و نەگریام، کاتێك خوشکەکەم هات و بەدەم گریانەوە، وەکو مەنجەڵی حەوتجۆش دەکوڵا و هەڵدەچوو، نازانم چۆنی بیـستبوو کـە گوایـە لاقم گوللە پێکاویەتی!! ئەو (ئیستەرەم) داوای دەکرد لاقە پێکراوەکەمی پێنیشان بـدەم!! نێخۆ دەرگام بۆ ناکەنەوە تا برینەکەم ببینێت، مەگەر وەکـو جومناسـتیك زانێـك بەسـەر هەردوو دەستمەوە رابووەستم و قاچەکانم لەنێو شیشی سەردەرگاکەوە پێنیشان بدەم، بەڵام باش بوو، کە سوێندم بۆ خوارد بڕوای کرد کۆڵیدا.

* * *

## (٨)

ئێستا من لەبەندیخانەی پۆلیسی شاری کفری بەند کراوم. تا ئەم ساتەش نازانم چی تۆمەتێکم دراوەتە پاڵ، یان بە چ گوناحێك تۆمەتبار دەکرێم؟ ئەو تاوانەی کە خۆم ددانم پیادا ناوە، تەنیا نەچوونمە بۆ خزمەتکردنی سەربازیی، ئەم حاڵەتەش، چونکە دەسگیرکراوم، لەوانەیە بمگەیەنێتە تیربارانکردن، لێرەش تا ئەمڕۆ دووجار لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا ئەنجامدراوە و هەردوو جارەکەش بە ئامادەبوونی ئەفەنییەکی پانتۆڵ لەپێی گرژ و مۆن، کە بە تەنیشت بەڕێوەبەری پۆلیسی شارەوە بە بێدەنگی دادەنیشت و گوێی رادەگرت، ئیفادەم لەدەم وەرگیراوە، هەردوو کەرەتیش بەڕێوەبەر، کە عەقیدی پۆلیس بوو، ئەو پرسیارانەی ئاڕاستەکردم، کە لە شێوەی پرسیارەکانی ئیستخباراتی لیواکەی بارق بوو، منیش هەوڵم دەدا بە (ئا) یا (نەو) یا (نازانم) وەڵامبدەمەوە، ئەو پرسیارانەش کە دەبوایە قسەی لەسەر بکەم هەوڵم ئەدا زۆر بەکورتی وەڵام بدەمەوە. پاش کۆتاییهاتنی دوالێکۆڵینەوە، کەچوومە ژوورەوە، یاوەر، ئەو کوڕە دڵپاك و عاشقە کێوییە، پاڵی بە دیوارەکەوە دابوو، قاچی راستی گورج کردبووەوە و قاچی چەپی لەسەر دانابوو، تەماشایەکی کردم، هەردوو پەنجەی شایەتمانی ئاخنییە کونی گوێچکەکانییەوە، تا لەدەنگی خۆی زیاتر، دەنگی کەس نەبیسێت، تێیچریکاند و هۆرە جافییەکەی دەس پێکرد: ئۆۆۆۆ، هۆهۆهۆ، یەژم کەنیشکە، من لە قولەکەی قەسرا ئۆ ۆۆۆ، گیریاگم وەدیل، تۆ کلاّوو زەڕەکەت کەومل گیان، بۆم بدە وە بەرتیل..

یاوەر لێنەبووبووەوە، پۆلیسە دەمشڕە یەع کەرەکە، بۆ تووڕەکردنی، دەستی کردە لاساییکردنەوەی و وەك گەماڵ لووراندی و وتی: ئووووووو، حە..حەوحەووو.. یاوەر کە چاوی بەئەو کابرایەدا هەڵنەدەهات، پەلاماریدا، ئەو لەسەر پشت کەوت و هەردوو دەست و هەردوو لاقی بەرز کردەوە، زۆڵانە بەدەم پێکەنینەوە وتی: وایەر وایەر، کاکە وایەر تۆ بەس لێم مەدە، ئەمە قوونی من و ئەوەش هینی تۆ.. یاوەر چوو دەستی گرت بەشیشی دەرگاکەوە و لە پەسا دەیوت: ئەی خوا دار و بەردت لێبوارێ، خوا من لەم دونیای رۆشنەدا چاوم وە عارەو و دارخورمادا هەڵنەهات، کەچی پێتپیشاندام، ئەوەتا هەرتکیان وان وە بەرچاومۆ.. دارخورما لە حەوشەکدا و عارەبەکەیش وە ژوور سەرمۆ، وەك دەڵەگ ئەلوورێنی، کە پڕیشی

ئەدەمیٚ، پاش ئەکەویٚ و تووشی میزە چڕکە تیٚ، خوا روو لە چ لایەك کەم، خوا چ گوناحێکم کرد وا تووشت کردم..

ئەو رۆژانەم لەبەندیخانەی کفری بە دوودڵییەکی قووڵ و پەژارەیەکی زۆرەوە گوزەراند، لە خزم و کەس و ناسیار، بێجگە لە دایکم، کە کەڵکی سەردانی بەندیخانەی نەبوو، کەسێك نەما سەردانیم نەکات. رۆژێك دەرگەوانەکە بانگی لە من و یاوەر کرد، دەرگاکەی کردەوە و بۆ ژوورێکی بچووکی بەرانبەر دامانیە پێش خۆی، کە گەیشتمە بەر دەرگاکە، روانیم دوو کەسی لێدانیشتووە، یەکێکیان (جەلال ئاغای هۆمەرمل)ە و ئەوی تریان پیاوێکی بالآبەرزی گەنم رەنگی بەویقار بوو، من نەمدەناسیی. سلاّوم لێکردن، پیاوە نەناسەکە گەرمتر وتی:

- عەلەیکومە سەلام دانیشە کوڕم..

جەلال ئاغا دەستی بۆ لای ئەو میوانەکەی تر راکێشا وتی: ئەوە مامەحەمە سەعید بەگی جافە..

کە دانیشتم هەواڵی تەندروستی پرسیم و وتی: خەفەت مەخۆ، بیر لە رابردوو مەکەرەوە، ئەوەی روویدا روویدا، گرنگ ئێستە ئازادکردنی تۆیە و تۆش خەمت نەبیٚ، هیچی وات لەسەر نییە مەترسی لێبکرێت، بەمزوانە بەرەڵلاّ دەکرێیت..

وتم: دیارە ئەوەش بە هەوڵ و ماندووبوونی جەنابتانە..

ئەو وتی: ئەو کوڕم تۆ خۆت خۆڕاگربوویتە و زانیوتە چۆن وەڵاّم دەدەیتەوە. دوێنیٚ چوومە لای بارِقی فەرماندەی لیواکەی کەلار و پرسیاری تۆم لێکرد، ئەو پێیوتم، کە لە لێکۆڵینەوەکەدا هیچ قسەیەکی زیانبەخشت دەرهەق بەخۆت نەکردووە، تاوانی تۆ تەنیا نەچوونتە بۆ سەربازیی، بەر لەوەی بێم بۆ لات سەردانی ئەفسەری تەجنیدیشم کرد، ئەویش دڵنیای کردمەوە، کە لەم رۆژانەدا رەوانەی یەکەیەکی سەربازیت دەکات و ئیتر خۆتیش دەبێت وریای خۆت بیت..

دڵدانەوەی ئەو رۆژەی گەورە بەگزادەی جاف، جۆرە ئاسوودەییەکی پێبەخشیم، ئاسوودەیی نەك بۆ خۆم، بەڵکو بۆ ئەوانیتر، چونکە دەمزانی هەر هیچ نەبێت مەترسی و پەژارەی کەسەکانم کەمێك دەڕەوێتەوە، بەلاّم بارسووکی بۆ خۆم لەناو یەك دونیا تاریکی و ئایندەیەکی نارۆشن و پڕ لەحەسرەت بەکۆڵێك زامی رۆحێکی شەکەتەوە مەحاڵە.. ئاخر مرۆڤێکی ئیرادە زەوتکراو و دووجار کۆسکەوتوو لەناو خێڵێك ئافرەتی رەشپۆش و منداڵی هەتیودا، ئەگەر ویژدانی نەمردبێت، چۆن هەست بە ئازادیی دەکات و ئاسوودە دەبێت؟ دە تۆ خۆت بخەرە

جێگای من و ڕۆژانی ڕابووردوویش بهێنەرەوە پێش چاو، بەمەرجێك بزانیت کە جگە لە قاسمی ئامۆزا، کە ئەویش برا و کۆڵەکەی بنەماڵەکە بوو، ئەوا دووهەمین برای دایـك و باوکیـت لـە ڕووداوێکی جگەر بڕدا و بەپێش چاوی خۆتەوە لەناو خوێنی خویدا بگەوزێنن و جـەلادەکانیش بە پـشتوێنەکەی خـۆت قۆڵبەسـتت بکـەن، ئەوسـاکە وەك گەلـەگورگ، بـە لمـۆز و کەڵپـەی خوێناوییانەوە بەرەو بێشەکانیان بتبەن و بلوورێنن و تۆی یەخسیریش، ڕێژنە جوێنی پـیس لـە ئەو ڕووخسارە دۆزەخییانەوە بە سەرسـەرتا داببارێـت و سـووکایەتی بـە کەرامـەتت بکـەن و ئینسانییەتت بەر شەق بدەن.. با ئازادیشت بکەن! ئاخر ئـەوە چ ئازادییـەکی پێـدەڵێن؟ مــن ئێستایش هەر بیرکردنەوەیـەکم لـەو ڕۆژە کارەسـاتاوییە، دەمباتـە نـاخی زەویـدا و دۆزەخـم پێنیشان دەداتەوە، بەڵام چارە چییە.. چبکەم؟ کورد واتەنی: ڕۆح لە شوێنێکی سـەختدایە و دەرناچێت.. کە ئەم خەیاڵ و لێکدانەوانەم بە مێشکمدا دەهـات، پەسـت دەبـووم و وردە وردە باری دەروونم قورستر دەبوو و کاتەکانم بە بێدەنگی بەسـەر دەبـرد، کـە بـیرم دەکـردەوە و بـە ڕابردوودا دەچوومەوە، ژیـانم وەك فلیمێکـی سـینەمایی لێوڕێـژ لـە ڕووداوی دڵتـەزێن و پـڕ تراژیدیا دەهاتە پێش چاو و بیرم لە زۆر شت دەکردەوە تا سنووری خۆکوشتن و دەربـازبوون لـە ئازاری ڕۆح و ویژدان..

من ئێستە بەئەم بارە قورسەی سەر شانمەوە، لە بەندیخانەی شارەکەی خۆمدام، کەچی هـیچ یەك لە بەرپرسەکانی ناناسم، بە هیچ یەك لەم پۆلیسە گرژ و مـۆن و ڕەزا قورسـانە ئاشـنا نـیم.. زۆرجار ساڵەکانی حەرەس قەومیم دەکەوێتەوە یاد.. پۆلیسـەکانی ئـەو سـەردەمە کـە هـەموویان خەڵکی شارەکەی خۆم بوون، ڕژێمی بەعسی ئەو سـەردەمە و تـرس و تۆقانـدنی خـەڵکی شـار و دەمبەستکردنی گوندنشینەکان بە ئابلۆقە خستنە سەر ئەو دەڤەرەم دەکەوێتەوە یاد.. هەرگیز وێنە و قەد و قیافەتی ئەو پۆلیسە کوردەم لە یاد ناچێتەوە، کە زەلالەتی هێنا بوو بـۆ خـەڵکی شـاری کفری و گوندنشینەکان.

ئەو پیاوێکی باڵا کەمێك بەرز و ڕەقەڵەی مل درێژی سوور و سپی بوو. قوڕقوڕاگەی بـە قـەد لوتی لە ژێر چەناکەیەوە بەرەو پێش دەرچووبوو. ئەم پۆلیسە ماڵیان لە گەڕەکی ئیسماعیل بەگ و نزیك بە ماڵی مامم بوو. ئەوەند تووڕە و چـڕپن و دەنگـەوەر بـوو ئەوەنـدەش لـە بەجێگەیانـدنی ئەرکەکەیدا، کە بۆی دەستنیـشان کرابـوو، سەرسـەخت و دەمڕاسـت بـوو، ئەرکەکەیـشی تـەنها ڕێگاگرتن بوو لە دەرچوونی خۆراك و پۆشاك بۆ ئاواییەکانی ئەو دەڤـەرە. ئـەو پۆلیـسە تەنانـەت چاوپۆشی لە هاوسێ و دۆستەکانی خۆیشی نەدەکرد!! بۆ ئەو مەبەستەش بە بێوچـان، لەئـەم سـەر

کۆلانەوە بۆ ئەو سەر کۆلان هەر لە بەیانییەوە تا ئێـوارە مـاخۆلانی بـوو بـەدەوری گەڕەکەکـەدا و دەسووڕایەوە. تەنانەت لەشوێنێکدا گەر بۆ پشوودانیش رابوەستایە، وەکـو میزراحێکـی تەتەڵـە نەکردوو، بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە و هەر چاوێکی دەکرد بە هـەزار چـاو، بۆیـە خـەڵکی شـار ناویان لێنابوو (مچە میزراح).. دەبا بۆتان بگێڕمەوە، مچە میزراح چۆن زەلالەتی بـۆ خەڵکەکـە هێنابوو و رۆژانە خەریکی چی بوو؟

بەیانی زوو هەروەکو ئەوەی بۆ مالی خـوای بکـات لـە خـەو رادەپـەڕیی، پانتۆڵـە ناونەفـەك فشەکەی لەبەر دەکرد، پوزەوانە خاکییەکەی توند لـەپاوپوزی شـەتەك دەدا و چـەکمە رەشـەکانی هەڵدەکێشایە پای، سیدارەکەی توند چەسپ دەکردە سەرییەوە و دارە گرنج گرنجەکەی دەگـرت بـە دەستییەوە، ئیتر لەم سەر کۆلانەوە بۆ ئەو سەرکۆلان دەهات و دەچوو، هەردەم لەپارێزدا بوو، ئـەو نەك تەنیا خەڵکی ئاواییەکانی دەهێنایە زەلالەت و لەهەر کـۆلان و لاڕێیەکـدا کـە دەیبیـنین وەك واشەی برسیی هەڵدەنیشتە سەر سەریانەوە، بەڵکو منداڵێکی شارستانیشی بـەدیی بکردایـە، کـە لەناو بازاڕەوە دەگەڕایەوە ماڵ و خوانەکەردان پریاسکەیەك یان کیـسەیەکی بـە دەسـەوە بدیبایـە تێیدەخوڕی و رای دەگرت، دەمی کیسەکەی هەڵدەپچڕی و ورد دەیپشکنیی، ئەگەر تەنیا چـارەکە کیلۆیەك شەکر یا دوو گوێل چای پێبگرتبایە دەستی دەگرت بەسەریدا و هەزار قـسەی ناشـرین و فەزیحەتی پێدەکرد. من خۆم جارێ بەردەستی کەوتم و نەختـە چـاکەی لێـسەندم. ئـیتر دوای ئـەو رووتکردنەوەم لەلایەن مچەی پۆلیسەوە، کە بەنەختێ شەکر و چای قاچاخەوە دەهاتمەوە بەرەو ماڵ لە دوورەوە، لەئەوسەر سەری کۆلانەکەوە چاوم بـۆ دوور هەڵدەخـست و دەمگێـڕا، کـە دەمبینـی یەکڕاست دەگەڕامەوە بۆ دووکان و بە مامم دەگوت: مـچە میـزراح سـەر کۆلانەکـەی گرتـووە و ناهێڵێ قوش دەربازبێت. ئەو تەنانەت چاوپۆشی لە هاوسێکانی خۆیشی نەدەکرد، هەموو رۆژێـك لە کاتی نیوەڕوان، یان ئێواران، کە دووکانەکانیان دادەخست و دەگەڕانەوە بۆ ماڵ، بێنەوەی کەمێ تەریق بێتەوە، رایدەگرتن و بەوردیی دەیپشکنین. جارێك کاك فەتاح کە هاوسـێی دەستەڕاسـتی خۆی بوو پشکنیبووی، ئەو بێماریفەتییەی کە نواندبووی کاك فەتاحی رووخۆش و لەفز هەنگوینی فرە بێزار کردبوو، بۆیە لە دڵی خۆیدا بڕیار ئەدات کەتنێکی پێدابدات، بیتەزێنێت، کەتنەکەش بەم شێوەیە بوو: مچەی پۆلیس ئەوەی دەزانی دووکاندارەکان کە لە بازاڕ دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ، لەترسـی ئەودا ناوێرن، ئەگەر پڕ باخەڵێکیش بێت، لە ناوچەی ژێـر دەسـەلاتی ئـەودا، کـە یـەك شـەقام و دووسێ کۆلانی تەسك و ترووسك بوو!! شتێکی یاساغ بهێننەوە و لەماڵـدا عـەمباری بکـەن تـا لەدەرفەتێکدا، کە حەرەس قەومییەکان بەسەر چەمی قوشەچاپانەوە نەدەمانەوە رەوانەی شارەکەی

ئەوبەریی بکەن، ناچار بەکۆلانێکی تردا درەنگوەخت، شتێکیان بەشتێك دەکرد یان دەبوایە دەمی یەکێك لە حەرەس قەومییەکانی شار چەور بکەن و بە نیوەرۆ، یان شەو درەنگوەخت بارەکانیان بگوازنەوە، ئەو سەردەمە دووکاندارەکان تا بەو شێوەیە تالۆوێریان دەکرد و نانیان پەیدا دەکرد، گوندنشینەکانیش بەو حالە پێداویستییەکانیان لە شار چنگ دەکەوت.

نیوەڕوانێك کاك فەتاحی داخ لەدڵ، لە بازاڕەوە بەرەو ماڵ دەگەڕێتەوە، لە دوورەوە تەماشا دەکات، دەبینێت مچە میزراح بەسەر کۆلانەکەوە راوەستاوە و بەهەر چوار دەوری خۆیدا سەری وەك رادار دەسووڕێنێت و دەڕوانێت، ئیتر ئەم بە فرسەتی دەزانێت و نایەوێت لەدەستی بدات، دەکەوێتە خۆی، کە نزیك دەبێتەوە خۆی کەمێك بە شپرزە دەنوێنێت و دەست دەبات بۆ باخەڵی کەواکەی و خۆی خەریك دەکات تا تەواو پۆلیس دەکەوێتە گومانەوە، لەناکاودا پۆلیسی گێل و خودا خراپ بۆ کردوو رووبەڕووی دەبێتەوە و بانگی دەکات:

- فەتاح.. فەتاح ، ئا بێرە بەرۆ با گیانت بپشکنم.. بەخوا وابزانم چتێکت لە گیرفانەکانتا شاردووەتەوە، فەتاح دەڵێت:

+ کاك مستەفا وەخوا هیچم پێنییە، بیکە لە ڕێی خوا و مەولووی پێغەمەرا، کاك مستەفا گێچەڵم پیامەکە، کوڕە تۆ عەیب ناکەیت لە خۆت؟ بۆ کەمێ شەرم ناتگرێ؟ ئاخر من و تۆ هاوسێی یەك نین؟ ئاخر چۆن شەرم لەخۆ ناکەی رێم لێنەگری؟ دە باشە ئەوە من هیچ، ئەی ناتوانی کەمێ چاوپۆشی لەو خەڵکە فەقیر و هەژارە بکەی؟ کوڕە خۆ ئەتوانی جارناجارێ چاوێك لە حەنای ئەو خەڵکە بەسە زوانە بنووقێنی و دڵی وەرزێرێکی دەس و پەنجە برژاو خۆشکەی، کوڕە ئەو خەڵکە گوناحە هەی خوا بتگرێ!!

کاتێك فەتاح بەو شێوە نەرمە قسە لەگەڵ مچە دەکات و قسەکانی کەمێك بۆنی پاڕانەوە و کوڕوزانەوەی لێدێ، ئەو پتر دەکەوێتە گومانەوە و زیاتر سوور دەبێت لە پشکنینی و دەڵێ:

- مادام وایلێهات، ئا دەس لەباخەڵت دەرکە، بەخوا ئەزانم چاییە یا شەکر، یا هەر هیچ نەوێ یەك دوو سەلکە ساونت لەباخەلا شاردۆتەوە، چتێکت هەر ها پێ.. خۆت شلکە فەتاح خۆت شلکە.. دەی دەی کوا با بزانم، دەی دەی عەزیەتم مەدە فەتاح عەزیەتم مەدە، ئا دەی دەست لە گیرفانەکانت دەرکە، دەی دەی.. مچە میزراح سینگ دەنێتە سینگی فەتاحەوە وەك ئەوەی هەنگوێنی لە کلۆری پیرە داردا دۆزیبێتەوە، ئەویش بۆ ئەوەی زیاتر شێتگیری بکات دەست لە باخەڵی دەرناهێنێت، بۆیە مچە بە ناچاریی مەچەکی توند دەگرێت و بای هەڵدەدا، ئینجا دەست

دەكاتە باخەڵی كەواكەیدا، كاك فەتاح نایكاتە نامەردیی و پیاوانـە (زەكـەری) بـە رەپـی دەنێتـە مشتی پۆلیس و پێیدەڵێت:

+ ئەو شتەی واها لە گیرفانما ناااااااانەوەتا.. دەبزانە وەكەلكت تێ؟!! دەی ها بیگرە و بیوە بۆ خۆت!! دە بیوە و بكە وە چاوتا!! دەك داوەشێی مچە، دەك داڕزێیت (مـزراح) دەبیـوە بـزانم چـی لێنەكەی!!

مچە میزراح وەك ئەوەی دەستی بەسەر سەری كوێرە مارێكدا كەوتبێت ئاوەها رادەچڵەكێت و پاشەوپاش دەكشێتە دواوە، ئیتر هەردووكیان دەدەن لەقاقای پێكەنین و

باوەش بەیەكدا دەكەن.

ئەم پۆلیسە تۆقێنەرە زۆرجار سوحبەتیشی لەگەڵ دۆستەكانیدا دەكرد و لەناخـەوە پێدەكـەنی. لەوانەیە لە ئەو رۆژگارەدا مستەفای پۆلیس، كە كەسانێك هەبوون بە كوردێكی نیشتمانپەروەریان دەدا لەقەڵەم، ناهەقی نەبووبێت، كە هار دەبووە گیان گوندنشین و هاوشارییەكانی، چونكە حەرەس قەومییەكان دەرهەق بە كەسی كورد و كوردپەروەر و ئەو كەسـانەش، كـە هاوسـۆزییان بـوون زۆر شڕەت و هاربوون و بێبەزەییانە رەفتاریان لەگەڵدا دەكردن، خۆ ئەگـەر ئـەو پۆلیسـە كـوردە، كـە ئەركی دەمبەستكردنی خەڵكی لادێكانی پێسپێردرابوو، پێانبزانیبایە كەمتەرخەمـە و چاوپۆشـی دەكات دوور نەبوو نانبڕاوی بكەن.

پۆلیسەكانی ئەو سەردەمە، بە حەرەس قەومییەكان و مچە میزراحیشەوە ئەوەنـدەی (عـەدە ئینزیبات)ی ئەمڕۆ بێشەرم و دڕ و تۆقێنەر و هـار نـەبوون. ئـەم پۆلیسـە بـە خـۆی و دارەكـەی دەستییەوە لەماوەیەكی زۆر كورتدا دەتوانێت هەموو نێری شـاری كفـری لەبـەر بـدات و راپێـچی پۆلیسخانە، یان دەزگای ئەمنیان بكات، بە بێئەوەی كەس بوێرێـت چـاو لەچـاوی ببڕێـت و فـزە بكات.



## (٩)

لەئەو بەندیخانە بیست رۆژ مامەوە، تا بەیانییەك ناوی مـن و عـەلییان خوێنـدەوە و داوایـان لێکردین خۆمان ئامادە بکەین. من دڵم داخورپا. عەلی مێردمنداڵ و زمانئەزان رەنگـی بـوو بـە توێکڵە لیمۆی زەرد! هەر لەوێدا ئەم پرسیارەم لا قوت بوویەوە: ئاخر نـاوی عـەلی بـۆ بـە منـەوە ببەستنەوە؟ هەر لەبەر ئەوەی نـاوی بـاوکی (حەمـە فـەرەج)ە؟ هەرچـۆنێك بـوو بـەدەم خـەیاڵ و خوتورەیەکی بێسەر و بەرەوە لەدەرگای حەوشەکە چوومە دەرەوە. لە پـشتی ئۆتـۆمبێلێکی سـەر داپۆشراو سواریان کردین و سەر بەرەو خوار کەوتەڕێ. مەقەڕی جەیش شەعبی کـە کـەوتبووە لای دەستە راستەوە تێپەڕاند بەرەو دێی کاریز و دیسان بـەلای راسـتدا لایـدا. پـاش نیـو سـەعاتێك گەیشتینە دووڕێیانی خورماتوو- کەرکوك، لەوێشەوە بەرەو بەغدا، بەلام کە نیوەی رێگای بەغدای بڕی و بەلای چەپدا وەرچەرخا، نیگەرانییەکەم قـوولتر بـووەوە!! چـونکە نەمـدەزانی بـەرەو کـوێ دەبرێین.. جا چار چییە؟ خۆ ئەگەر بۆ ملپەڕاندیش بێ نیتر دەبێت تۆ خۆت بدەیت بە دەسـت ئـەو واقیعەوە و چاوەڕوانی چارەنووسی خۆت بکەیت، چونکە لەگـەڵ مەرگێکـدا کـە ئـەو پەلکێـشت دەکات ململانێت پێناکرێت. ئۆتۆمبیلەکە ماوەیەکی تر رێگـای بـڕی و خـۆی کـردە نـاو شـاری باقووبـەدا. ئـەو رۆژە یەکـەم جـارم بـوو بەڕێوەبەرایـەتی پۆلیـسی ئـەو شـارە ببینـم.. دەرگـا سەرەکییەکەی سێ چوار مەترێك پان بوو، لەوێوە کردمانیان بەژووردا، دەرگەوانەکە رەشـتاڵەیەکی رەقەڵەی سمێڵ شۆڕی کورتەبنەی ناوچاو گـرژ و مـۆن بـوو، کلیلـەکانی، بـەزنجیرێك بەسـتبوو بـە نیتاقەکەیەوە، بە دەستی راستی گرتبوو، کێبلێکی رەشیـشی لـەبن قـۆڵی چـەپیدا بـوو. دەرگـا پۆلاینییەکەی کردەوە و ئێمە خۆمان کردە دالانە درێژەکەدا پاشان دووەمین دەرگای بۆ کردینـەوە و بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ، بە کێبڵەکەی دەستی هێمای چوونە ژوورەوەی بۆ کردین و خڕڕڕڕ دەرگاکـەی لەسەر داخستین.. بەدەم دەرگاکەوە بـەپێوە راوەسـتابووم عـەلی زۆر لەسـەرخۆ و بـە شـێوەیەکی منداڵانە و بە ئەوپەڕی پاکییەوە وتی: کاکە بەیانی کە لە بەندیخانـەی کفـری دەریـان کـردین زۆر ترسام، وامزانی دەمانبەن بۆ قاطع جیش شعبی و لەوێ گوللەبارانمان دەکەن.. بڕوات هـەبێ کاکـە ئەوەندە ترسام لە حەیبەتتدا جووتەی گوێم هەڵکشان و چوونە ناوسکمەوە دواییش باریکە ژانێکـی تیژ گرتمی، ژانێك، هەر وەخت بوو بمپروکێنێت و گیانم دەرچێت، بەلام کە ئۆتۆمبێلەکە لای نەدا بۆ قاطع لەوێدا ئافاقەیەکم بۆ هات و هەستم کرد گونەکانم شۆڕدەبنەوە بۆ ناو گەڵم!!

من لە دڵی خۆمدا وتم: ئەم مرۆڤە چ بوونەوەرێکی سەیر و سەمەرەیە، ئاخر مێـشك و دڵ و دەروون و ترس لەگەڵ ئەو ئەندامە کە بەرپرسە لە زیادبوونی رەگەز، چ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە هەیە؟

نەریتی بەندیخانە وایە، هەر زیندانییەك بۆ یەکەمین جار دەچێتە ژوورەوە لەبەر دەرگاکەدا، بە بێئەوەی یەك هەنگاو بهاوێت، رادەوەستێت و تەماشای سەرتاپای بەندیخانەکە دەکات، پاشان یەکەیەکە لە رووخساری بەندییەکان دەڕوانێت، ئەم رەفتارەش خۆی لە خۆیدا ئامادەکارییەکە بۆ هەڵسەنگاندن و خۆگونجاندن لەگەڵ ئەو بار و شوێنە نوێیەدا کە پێی تێدەنێت. لەوانەیە چاوگێڕانیش بێت بەدوای رووخسارێکی ناشنا، یان جێگایەکی چۆڵ بۆ حەسانەوە، بۆیە منیش وەك هەر زیندانییەکی تر، رێك وامکرد، بەلاّم بەندییەکان ئەوەندە زۆر بوون نەمپرژایە سەر هەموویان تا تێیانبڕوانم.. ئاخر ئەو زیندانە ئەوەندە بەندیی تێترنجابوو، دەرزیت هەڵبدایە نەدەکەوتە سەر زەوی!! ئەو قاوشە بەرفراوانە وەك شارە زەردەواڵەی ئاڵۆسکاو گرمەی دەهات و کەس لە قسە حاڵی نەدەبوو. دەرکیشم بەئەوە کرد، کە سێیەکی زیندانییەکان بێئاگابوون لەوەی دوو میوانیان بۆ زیاد کراوە. بەدەم دەرگاکەوە راوەستابووم و قاوشەکەم بەزیندانییەکانەوە دەپشکنی، لەپڕێکدا چاوم لەسەر رووخسارێك گیرسایەوە، کە وادیاربوو ئەو زووتر منی بەدیی کردبوو، بۆیە دەستی چەپی خستبووە لای دەمی و بانگی لێدەکردم، کەچی من لە زڵەزڵ و گرمەی ئەو هەموو دەنگەدا، کە تێکەڵ بەیەك دەبوون، نەمدەبیست، بەلاّم بە هێمای دەست تێیگەیاندم، کە جێگەمان لای ئەو دەبێتەوە..

عەلی گورج هەردوو دەستە پێخەفەکەی هەڵگرت و چووینە پێشەوە، بەلای راستی دیوارەکەوە کۆمەڵێك مرۆڤی کورد پاڵیان بەیەکەوە دابوو، تا ئێمە گەشتین (سەرتیپ) زۆر خەمخۆرانە درنی بە هاوەڵەکانی دابوو، جێگای ئێمەشیان کردەوە.

پاش چەند رۆژێك ئاشنایەتیم لەگەڵ ئەوەی کە مەبەستم بوو پەیداکرد و کەمیان ما نەیانناسمەوە، بەلاّم سەرتیپ دەربارەی بەندیخانەکە و بەندییەکان و زۆر شتی تر کە مەبەستم بوو بیزانم، سەرچاوەی سەرەکی زانیارییەکانم بوو، ئەو بۆی گێڕامەوە وتی: تا دوو هەفتە بەرلەئەمڕۆ رۆژانە کۆمەڵ کۆمەڵ زیندانییان لێرە دەردەکرد و لەناو ئەو باخاتی (خالّس)ەدا بە تۆمەتی جیاجیا گوللەبارانیان دەکردن، زۆرجار کەسی وای

بەردەکەوت، تەنها لە بازاڕدا سووکە شەڕێکی کردبوو، بەبێ لێپێچینەوە سەربازە هەڵهاتووەکان گوللەباران دەکران، بەڵام ئەمە چەند ڕۆژێکە ئەو دیاردەیە ڕاگیراوە..

من یەکێك بووم لەئەو بەندییانەی کە زۆربەی کات چاوم لەدەم دەرگاکەوە بوو دەمڕوانی تا بزانم کێ دێت و کێ دەردەکرێت. ڕۆژێك پیاوێکی تەمەن سەرووی پەنجا ساڵیان هێنایە ژوورەوە، کە زانیم کوردە، ئەو مافەم دایە خۆم، کە لە ریزی خۆماندا جێی بکەمەوە. ئەو ئەوەندە خەفەتبار و وەڕس بوو، جێگای بەخۆی نەدەگرت و نەیدەزانی دابنیشێت، بە پێوە ڕادەوەستا و لەدەرگاکەی دەڕوانی. دادەنیشتەوە و کروشکەی دەکرد و لەناو خەیاڵ و بیرکردنەوەدا نوقم دەبوو، لەسەر گازەرەی پشت ڕادەکشا و چاوی دەبڕییە بنمێچی قاوشەکە، دەتگوت وێنەی منداڵەکانی بە سەقفەکەوە هەڵواسراوە و ئەو دیقەتیان نەدات. لەناکاودا وەك بانگی لێبکەن و خەبەرێکیان بۆ هێنابێت ئاوا ڕادەپەڕی و بۆلای دەرگاکە رووی وەردەچەرخاند. مودەتێك لەئەو بارەدا دەمایەوە و چاوی بە دەرگاکەوە ئەبلەق دەبوو، پاشان کەمەکەمە خاو دەبووەوە و پاڵی دەدا بە دیوارەکەوە، ئەو ئەوەندە بێئۆقرە بوو دەتگوت ئاگاداریان کردووەتەوە لە هاتنی خێزانەکەی و نازانێت هۆی دواکەتنیان چییە. ئەم پیاوە زیاد لە سێ کاتژمێر ئەوە حاڵی بوو، لە بارێکدا ئارامی نەدەگرت، ڕادەکشا و ڕادەچەنی، چنچکی دەکرد و هەڵدەستایە سەرپێ، بڕێکی باش لە دەرگاکەی دەڕوانی و دادەنیشتەوە، هەناسەی قووڵی وای هەڵدەکێشا بۆنی زووخاوی لێدەهات، لەئەو ماوە ئازار بەخشەدا من وا تێکەڵ بووبووم لەگەڵ ڕۆحی ئەو مرۆڤە بێدەسەڵاتەدا، وام هەست دەکرد ئەو قاوشە گەورە و جەنجاڵە، جگە لە من و ئەو کەسی تری تیادا نییە. ئەو لەو هەڵچوون و داچوونەدا بوو من خستبوومە ژێر چاودێرییەوە، لەپڕێکدا قیژە و گریانی چەند منداڵێك کابرای ڕاپەڕاند و بەدەم هاوارکردنەوە بەرەو دەرگاکە ڕایکرد و منیش بەدوایدا، پێشتر کە هۆی دەسگیرکردنیم لێپرسیبوو، ئەو وتی: بەر لە چوار ڕۆژ پۆلیس دای بەسەر ماڵەکەمدا و بەتۆمەتی (تەبەعییەی ئێرانی) بە خاوخێزانەوە دەسگیریان کردین و منیان بۆئێرە هێنا، ئیتر نازانم منداڵەکانم ڕاپێچی کوێ کراون؟ نازانم چ بکەم هەر وەختە شێت دەبم!! بڕوات هەبێ مەرگی خۆم بە ئاوات دەخوازم..

ئەو پیاوە گڕتێبەربووە برووزی لێبڕابوو لە پەسا دەیگوت: ئەرێ وەڵا ئەوە ئەوانن، منداڵەکانی منن، گیان گیان بە قوربانتانبم.. کاتێکم زانی خێزانەکەیان بە ڕاڕەوەکەدا

بەپێش چاوی باوکەکەوە دالەبەر بۆ زیندانی ئافرەت و منداڵی ساوا، ئیتر پیاوەکە چاوی پێکەوتن هەردوو دەستی بە شیشی دەرگاکەوە گرت و پڕ بە گەرووی هاواری کرد: ئـەوە منیش لێرەم بە قوربانتانبم.. باوکە رۆڵۆ برا رۆڵۆ..

بە دەم باوکەڕۆوە سەری خۆی بەشیشەکاندا دەکێشا. مـن زۆر هەوڵمـدا بەدڵدانـەوە هێوری بکەمەوە، بەڵام بێفایدە بوو. ئەو بە پێوە راوەسـتابوو وەك برێـشکەی ناوسـکی ساج هەڵدەقرچا و بە کوڵ دەگریا، کە بە گریان خۆی خـاڵی کـردەوە بـەدەم دەرگاگـەوە دانیشت و لە دەرگای ژووری زیندانی خیزانی دەیڕوانی.

هەر ئەو شەوە کە ئەختێك باری دەروونی کابرای تەبەعیە!! خاوبووبووەوە و کەمێك خەمی سەرشانی سووك بووبوو، چونکە هیچ نەبێت نیـستە لەمنداڵەکانییـەوە نزیکـە و دەزانێت لەکوێن، ئەو شەوە بوو، کوڕە کـوردێکی خـەڵکی گونـدی (حـاجی عـەواد)ی دەشتی شاکەلی ئەو گەرمیانەیان هێنایە زیندانەکەوە، ئەو هەڵۆیەك بـوو لـە هێلانـەی سەخت و عاسی خۆیدا ببوو بە داوەوە و بەدوو چاوی رەشی پـڕ لـە تـرس و رووخـساری پەشۆکاوەوە لە بەندییەکانی دەڕوانی و هەر بە تەماشاکردنیش بـەدەم و چـاوەکان و بـە دیوارە چڵکنەکەی بەندیخانەکەی دەگوت: خۆم دەزانم لە خەتەردام و بەرەو مەرگ راپێچم دەکەن، بەڵام چارم نییە!!

بەیانی زوو بەرلە دەسبەکاربوونی مـەئموورەکانی ئـەو پۆلیـسخانەیە، دەرگەوانەکـە هات و گورگ ئاسا، چۆن قەپاڵ لە بەرخێك دەدات و لە گەلەمەڕ جیای دەکاتەوە، ئـاوا لە قۆڵی ئەوی و بەپەلە بۆ دەرەوە راپێچی کرد. زیندانییە کۆنەکان دەیـانزانی هێنـان و بردنی ناوەختی بەندی یانی چی؟ رۆژی چاوپێکەوتنی بەندییەکان بیستمان ئەو کوڕەیـان لە گوندەکەی خۆیاندا گوللەباران کردووە..



## (۱۱)

بەندیخانەی پۆلیسی باقووبە پانتایەکەی ۲۵۰- ۳۰۰ مەتر دووجا دەبوو. ئەوێ نموونەیەکی بچکۆلانە بوو لە کۆمەڵگای عیراقی. دز و جەردە، پیاوکوژ، سیاسی، سەربازی هەڵاتوو، پیاوی شەڕفرۆش و بکوژ، کاسبکار و عارەبی میسری و مرۆڤی کوردی غەدرلێکراو و جۆرەکانی تر لە چین و توێژە بەدبەختەکانی کۆمەڵگای گرتبووە خۆ، بەڵام زۆربەیان سەربازی هەڵهاتوو بوون.

ئەو چەند مانگەی لەوێ بەسەرم برد رۆژگارێکی هەتا بڵێیت سەخت و دژوار بوو. هەر رۆژێکم بە ساڵێك لێبەسەر دەچوو. تەنها ئەو کاتانە نەبێت، کە خولقی گوێگرتنم هەبوو، سەرتیب دەهاتە ناخافتن، دەیدایە تانی بێحەیاییدا و لە هەموو ناشێکی تێدەکرد. ئەو زۆرتر مەبەستی رەواندنەوەی خەم و پەژارەکانی من بوو، ئەگینا هەموو ساتێك بۆنی مەرگم دەکرد، ئەو هەوایەی هەڵمدەمژی بۆنی گۆڕەوشاری لێدەهات، ئەو نانەی دەمخوارد تامی خوێنی ئەدا، ئەو قومە ئاوەی دەمخواردەوە وامدەزانی دواقومی ئاوە بەر لەسێدارەدانم دەمدەنێ، بێنەوەی پێمبڵێن ئارەزووی چی دەکەیت، لەئەو زیندانەدا هەر رۆژەی بەزمێکم بەر چاو دەکەوت، کە مایەی تێڕامان بوو، شەڕ و بەگژدا چوون و یەکتر خوێناولکردن و جوێندانی پیس و تانە و تەشەری قێزەون کار و پیشەی رۆژانەی چەند کەسێکی دیاری بەندییەکان بوو. کاتی وا هەبوو بۆ کۆنترۆلکردنی ئالۆزیی ناو زیندانەکە دەرگاوانەکە بە خۆی و کێبڵە رشەکەیەوە خۆی بەژووردا دەکرد و دەهاتە ویزەی برێك لە ئاژاوەگێرەکاندا. یەکێك لەئەو بەندییە شەڕئەنگێزانە کوڕە عارەبێکی سەربازی هەڵهاتوو بوو، ئەو بۆ خۆدەربازکردن لە چەشتنی سزا، بە لەتە مووسێك بەردەبووە سینگ و سکی و خۆی خوێناوێ دەکرد. لە هەموو ئەو دیمەنە ناشیرینانەی کە لە یادمدا وێنە (ترا- میدی)یەکەی لەیادمدا ناسڕدرێتەوە، ئەم باسەیە کە دیگێڕمەوە:

رۆژێك سەربازێکی مێردمنداڵیان کردە ژوورەوە، ئەم سەربازە دەرکەوت بە زیندانییە کۆنەکان نامۆ نییە، یان لە خوێندنەوەی سیمایدا بۆیان دەرکەوت فرۆشیارە!! ئیتر کڕیارەکان کەوتنە خۆ و بەسەریانکردەوە، زۆری پێنەچوو جموجووڵ کەوتە ناو زیندانەکەوە، جموجوڵێکی وا زۆربەی بەندییەکان کەوتنە گومانەوە و گوێقولاخ بوون، پاش کەمێك سەرشۆرکەکە بەشێوەیەکی واجمەی دەهات بێناگاکانیش ئاگادار بوونەوە، لەهەمووی سەیر و سەرنجراکێشتر

رەفتـاری سـەربازە لووسـکەکە خـۆی بـوو، ئـەو کەوتـە نـاو زیندانییـەکان و داوای تویکلـە سابوونێکی دەکرد!! تەنیا یەك توێکڵە سابوون کارەکەی ئاسانتر دەکرد و زووتـر کڕیارەکـانی بەڕێدەخست!! بۆ ئەوەی کەس نۆرەبڕ لەکەس نەکات، لە ناوەڕاستی قاوشەکەوە بـۆ بـەردەرکی سەرشۆرکەکە، بەندییەکان سرەیان بەستبوو، ئەوەندە بەکپی و بێدەنگی راوەستابوون، ئەگـەر زیندان نەبوایە، ئەوا سوێندت بخواردایە، کـە سـرەیان بـۆ وەرگرتنـی هێلکـە، یـا دەرکردنـی تەسکەرەی نفووس گرتووە، سوێندت نەدەکەوت!!

(عـامر خانەقینی) و (مـەجە دۆم) وەك گا بوغە چـەپۆکانیان دەکـرد و دەیـان بۆڕانـد، بـە کەمێك چاو لێسوورکردنەوەی مـن کۆڵیانـدا و دامرکانـەوە.. مەجـە وەك نێرەکـەرێکی تێـر قەسیل ئێرەقی کردبوو دەیسەڕاند: کورە هەی کوڕی خوا لێمگـەڕێ بـا دەسـتێکی لێبپـەڕم و سفرە تلێشی بکەم.. ئـەو رووی دەمـی لـە مـن کردبـوو وای دەگـوت.. عـامر خانـەقینیش بێشەرمانەتر لە مەجە دەیگوت: خودا تو لە کورە ئەڕا من نازڵ بیت؟ وڵمکە بـا ئـەو داڵـك خیزە بگامەی..

بەلاّم عامر درۆی دەکرد، چونکە باشی دەزانی کڕیاری کوڕە لوسکەکە زۆرن و نۆرەی ئەو نایەت.. ئەو دەیویست پێمبڵێت: ئیتر پێممەیەژە لۆتی بەرەلاّ، ئەوە نییە منـیش گوێڕایـەڵم و بە قسەت دەکەم.. بەلاّم هەر بە بێوەی دانەنیـشت و لـە داخـی دڵـی خۆیـدا گێـچەڵێکی بـە (عومران خانەقینی) خزمی خۆیدا کرد، پەلاماری دا و دوو سێ مشتی سرەواندێ.. هەر ئـەو رۆژە هێـشتا عـامر کـەفوکوڵی دانـەمرکابووەوە، دەرگـای قاوشـەکە کرایـەوە و کـوڕێکی گریساویی و جلوبەرگ چەور و چڵکنیان پاڵپێوەنا و هاتە ژوورەوە، ئەو وەك کوڕێکی ئاشنا بـە سروشتی زیندان، بەدەم دەرگاکەوە راوەستا و فـسفس پاڵـەوان ئاسـا دەسـتی لەشیـشی سـەر دەرگاکە گیرکرد و مەچـەکە ئەسـتوور و دەماراوییـەکانی نمـایش کـرد.. عـامر رووی دەمـی تێکردم و وتی: خاڵوو بەمەلی؟

ئاخر من دەمزانی پرسـەکەی عـامر پرسـە خەسـوانەیە.. بۆیـە وتم: بـەلی.. هەرچـۆن تـۆ مزگێنی بە زیندانییەك بدەیت و هـەواڵی ئـازادکردنی پێبگەیـەنیت، عـامر گـەش بـووەوە و زەردەخەنەیەکی تەڕ زاییە سەر روومـەتی، چـاوەکانی چەشـنی دووچـاوی پڵنگێکـی راوچـی، گەشانەوە و دەستوبرد بەرەوە لای دەرگاکە، بە نێو زیندانییەکاندا، چـەند زیکزاکێکـی کـرد و خۆی گەیاندە شوێنی مەبەست، لەشێوەی کابرای فسفس پاڵەوان، پـشتی لەدەرگاکـە کـرد و شانی لەشانی توند کرد، کوڕە فیتەرەکە ئاوڕێکی لێدایەوە و خێسەیەکی لێکرد، بـەلاّم عـامر

بواری پێنەدا، تا هێز لـە مەچـەك و بازوویـدا هـەبوو گـوڕی خـواردەوە و مـشتێکی تونـدی سرەواندە بنا گوێیدا، هەر ئەو مشتە بوو، کابرا لاربووەوە و وەکو دارێـك رەشـەبا لـە ریـشە هەڵیکەنێت، ئاوەها دای لەزەوی!!

ئیتر عامر چاوەڕوانی هیچی تری نـەکرد. بەهـەمان زەردەخەنـەوە کـە لـە رووخـساریدا روابوو گەڕایە دواوە و بەچاوە گەشەکانی یەك یەك تەماشای هاوەڵـە کوردەکـانی کـرد. مـن دەمزانی ئەو پڵنگە بەندکراوە چاوەڕوانی چی دەکات بۆیە وتم: دەسخۆش عـامر.. دەسـخۆش، چاکت تێسرەواند، ئەمجا ئیسراحەتت کرد؟



شـەوانە درەنگوەخـت، کپـی و بێـدەنگی بـاڵی بەسـەر قاوشـەکەدا دەکێـشا و زۆربـەی بەندییەکان دەنووستن، ئەوکاتانە هەل بوو بۆ دەمەتەقێ و شەو بەسەربردن.

(عەگاب) کوڕە عارەبێکی هـێمن و خوێنـدەوار و لەسـەرخۆ بـوو. و خـۆی بـە سـەرتیب ناساندبوو. خۆیشی بۆی گێڕامەوە گوایە بەرلەئەوەی بکرێت بە سەرباز (بەڕێوەبـەری ناحیـە) بووە و بەقسەی خۆی لەهەڵچوونێکدا جوێنی بە بـەعس و سـەدام داوە و بـەهۆی دەسـەڵاتی عەشـایەریی باوکییـەوە، کـە لـە سـەردەمی دەسـەڵاتی عوسمانییەکانـدا نازنـاوی (پاشـا)ی پێبەخشراوە، سـزای قـورس نـەدراوە و تـەنها پلـەی بـەڕێوەبری لێوەرگیراوەتـەوە و رەوانـەی سەربازی کـراوە. پاشـان کـە چـووەتە سـەربازی (ئەفـسەری هـەواڵگریی) واتـا (ئەفـسەری ئیستخبارات)ی فەلاقە کردووە و دیسان جوێنی بە حیزبی بەعس داوە، بۆیە بەنـدکراوە. ئـەو لەلای من نکۆڵی لە تۆمەتەکەی نەدەکرد، بەڵام لە مەحکەمەدا دانی بە تاوانەکەیدا نەنابوو، درابووە دادگای سەربازی و دەیانهێنـا و دەیـانبرد.. ئـەو رۆژانـە کـە لـە زینـدانی باقووبـەدا دەمایەوە، سەرەڕای درێژدادڕییەکەی کە بە سروشتی خۆم رقم لە ئەو جۆرە کەسانە دەبێتـەوە، بۆ من ئافاقە بوو.

یەکەم جار سەرتیپ پێیناساندم، وتی: ئەگەرچی کەمێك فشەکەرە، یـا راسـتر بێـژم لـە جوانکاریی قسەوباس و گێڕانەوەی چیرۆکە خەیاڵییەکانیدا دەسـانێکی هەیـە و هونەرمەنـدە، ئەگەر پشووت درێژبێت و کەمێك سەری بـۆ بلـەقێنیت، بـە تایبـەتیی رۆژانـی هـەینی، کـە مواجەهەت دێت و مەنجەڵ و سەبەتەی پڕ لە خواردن کە بۆتی دەهێنن چـەور بێـت و گرتکـی

گۆشتی باشی تیادا بێت ئەوا لەپاڵ لوولدانی تیکەکانیدا زۆر لەفزشیرین و قسەخۆشترە و دڵـی خۆیت بۆ والا دەکات..

هەر وایشدەرچوو، یەکەم شەو ئەوەی من مەبەستم بوو و ئەو درکاندی و داخی دڵـی خـۆی بۆ هەڵڕشتم، ئەو شەوە تا دەمەوبەیان من جوولاندم و ئەو قسەی کرد، پاش ئەوەی شل و کول بوو، وتی با قسەیەکی خۆشت بۆ بکەم:

کاکە حەمەی پێشمەرگە دەسـگیرکرا و درایـە مەحکەمـەی سـەربازیی موسـڵ، لـە دوا دانیشتنی دادگادا بڕیاری لە سێدارەدانی هاوڕێکەی دەدرێت بۆیە هاوڕێکـەی لـەناو قەفەسـی تاوانباریدا هاوار دەکات و دەڵێت: ئێوە لەنەو کاتەدا کە پێشمەرگەیەك دەکوژن دەیان، بـەڵکو هەزاران پێشمەرگە لەدایکدەبێت، دار بەرروویەك دەسووتێنن دەیان خەڵقە بەروو بەسـەر کـۆترە سووتاوەکەیەوە چرۆ دەکەن و دەژێنەوە، بژی پێشمەرگە، بژی کورد، برووخێ بەعس..

کاکە حەمە کە گوێی لە دروشمە ئاگرینـەکانی هاوڕێکـەی دەبێـت ئـەویش دەڵێـت: بـژی پێشمەرگە، بژی کورد..

دوایی نۆرە دێتە سەر کاکە حەمە و دادگا بڕیاری سـێدارەی بەسـەردا دەدات، بـەڵام ئـەو چونکە باش عارەبی تێناگات بە هاوەڵەکەی دەڵێت: بـۆم بکـە بـەعارەبی.. ئـەویش دەڵێـت: بڕیاری لەسێدارەدانی بۆت دەرکرد!! کاکە حەمە رووی دەم دەکاتـە حـاکم و پێیـدەڵێت: باشـە حاکم تۆ بۆ ئەوەندە زاڵمیت! من لەپێشمەرگایەتی زیاتر هیچم کردووە؟ ئـاخر پێشـمەرگایەتی گوناحە؟ کفری خوایە؟ ئەی باشە تۆ برا عارەبەکانت لە فەلەستین پێشمەرگایەتی ناکەن؟ حاکم خوا غەزەب لە خۆت و سەدامیش دەگرێت، تۆ بۆ لەخوا ناترسیت حاکم؟ بژی پێشمەرگە بژی کورد..

شـەوانە کـە مـن و عـەگاب سـەرمان دەخـستە سـەر سـەرین و دەدوایـن (سـەرە) پیشیدەخواردەوە و هەر زوو بەتانییەکەی دەکێشایە بان سەریدا و بەئەمـدیو و ئـەودیودا پلـی دەخوارد و هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا.

شەوێك لەشەوەکان خێسەی زۆری لێکرد، ئەو پەڵە هەورێکی خەستی بێزاریی رووخساری داپۆشیبوو، رەش داگەڕابوو، بۆیە لام لێکردەوە و ویستم بیدوێنم، بەڵام ئەو بە دەنگێکی نزم و پڕ لەحەسرەت، پێیوتم: ئاخر من نازانم تۆ بۆ ئەوەندە بە زەوق و شەوقەوە گـوێ لەقـسەی ئـەو عارەبە وشترررر گێیە دەگریت؟ ئەی من بۆ ئەوەندە ئەحمەق بووم ئەم منجرەم بە تـۆ ناسـاند.. کورە عارەب هەرچی بێت و لەهەر کوێ بێت هـەر عارەبـە!! ئەمـە باسـی چـیت بـۆ ئـەکات

ئەوەندە بەتام و لەزەتەوە گـوێی بـۆ شـل دەکـەیت؟ خـۆ بـەیانی و دوو بـەیانی لێتـی دوور دەخەنەوە، تۆ کەی ئەوەندە تامەزرۆی پاشا و فشەکردنی کوڕی پاشا بوویتە؟ کە ملی شـکاند و ڕۆیشت ئەوساکە نەیەژیت نادەی سەرە دەی تەڕەماش قـسەیەکی خۆشمـان بـۆ بگێـڕەوە، دە شەرتبێ خەفـەتێکی وات بـدەمێ خـاڵۆژنم بەسـۆفی مێـردی نـەدابێت.. (مـن پێدەکـەنم).. پێمەکەنە دایکمت تەسەڕف کردبێت دەبێت داخت بکەم، خۆ ئەو کـابرا فـشەکەرەت لێـدوور دەکەوێتەوە.. ئەوساکە نەیەژیت نادەی سەرە (سەرتیب دەمی خۆی گێڕ دەکردەوە و هـەردوو چاوی دەکردە چەرپاز و خواروخێچ لێیدەڕوانیم و دەیگوت)، ئەوسا نەیەژیت سەرە سەرە گیان، دەی تـەڕەماش گیـان قـسەیەکی خۆشمـان بـۆ بکـە، دەبـا ئـەو خێـرەت کردبێـت و دایکـە بێوەژنەکەمت تەڕ کردبێتەوە (کورە هەی بێحورمەت)، من وادەڵـێم و ئـەو لەسـەر قـسەکانی خـۆی دەڕوات و دەڵێـت: دە شـەرتبێ خەفـەتێکی وات بـدەمێ خاڵۆژنـەم بەسـۆفی مێـردی نەدابێت، دەبێت داخت کەم دااااااخ.. (مـن پێدەکـەنم)، ئـەو دەڵێـت: پێمەکەنـە، دایکمـت تەسەڕوف کردبێت، ئەو دایکە بێوەژنەمت بەدڵ و بەداو هەڵشێلابێت، ئەو بێوەژنە چارەڕەشەی کە.. (من تووڕە دەبم)، ئەو کەمێك کپ دەبێتەوە و پاشان لەسەر قسەکانی دەڕوات.. خۆ ئەو عەگاڵە درۆزنەت هەر لێدوور دەکەوێتەوە!! من دەڵێم:

ئەی بێحورمەت هەر خۆت نەبوویت عەگابت پێناساندم؟ ئەی بۆ ئێـستە درۆزن دەرچـوو؟! درۆی چی دەکات؟ ئەو دەڵێت: تۆ بۆ ئەوەندە دڵساف و خۆشباوەڕیت؟ کێ یەژێت ئەم کابرایـە ئەمن و ئیستیخبارات نییە؟ خۆ کفرم نەکرد پێمناساندیت؟!

من دەمزانی سەرتیب خۆی پێڕاناگیرێت ئەگەر ددان بەخۆدا بگرم، ئەو ناچار دەبێت خـل و دەورم بدات تـا بیـدوێنم و بیهێنمـە قـسە، هـەرواش دەرچـوو، شـەو بـە کپـی دانیـشتبووم جارناجارێك بە تیلەی چـاو لێمـدەڕوانی و ئـەویش لـەژێرەوە بەچـاوە تینووەکـانی تەماشـای دەکردم، بەڵام من ددانم بەخۆدا گرت و خۆم بە هەڵدانەوەی لاپـەڕەکانی ژمارەیـەك لـەگۆڤاری (ئەلف با)وە خەریك کردبوو، ئەو کـە هیـچی لێنەبیـستم و تـەواو نائومێـد بـوو ئـیتر خـۆی پێڕانەگیرا و هەڵسا باوەشی کرد بەملمدا و وتی: خۆ خەریکە دڵم شەقدەبا براکەم، ئاخر لەئەو ڕۆژەوە تۆ هاتوویتە ئەم بەندیخانەوە تا ئەمڕۆ زیاد لە پەنجا جار ئەو گۆڤارەت خوێندۆتەوە، دە باشە تێرت لێنەخوارد؟! دە دەمی ئەلفباکەت داخە با قسەیەکت بـۆ بکـەم، پێمـوت: ئەگـەر باسی هێنانی سێیەم ژنی سۆفی خاڵۆتم بۆ دەکەیت ئـەوا بـاش گوێـدەگرم، ئـەگینا لەبابـەتی جیددی و ئایندە و چارەنووس زۆرمان باس کردووە و من تێرم خوارد، لێمگـەڕێ خـەوم دێ..

ئەو وتی: ئێیی تۆ وادەزانیت ئەو هەموو درۆ و دەلەسە و خۆفشکردنەوەی (عاقاپ)!! من قسەکەم پێبڕی وتم: ئاخر تۆ تا ئێستاش ناوی ئەو کابرا عارەبە نازانیت و بەهەڵە گۆی دەکەیت، ئەو ناوی "عاقاپ" نییە بەڵکو "عەگاب"ە "عەگاب" بەزمانی عارەبیی واتا هەڵۆ..)..

ئەو قسەکەی پێبڕیم و وتی: باشە باش، ئاخر لەسەر زاری من (عاقاپ) ئاسانترە، چونکە لەسەر وەزنی (قاپقاپ)ە.. دە تۆ ناوی بکە بە گەرووی ئاشا. بەهەرحاڵ دڵت ناشکێنم و باسی سێهەم خاڵۆژنی خۆمت بۆ دەکەم، خۆ دەزانم تۆ تەماشای سۆفی وەك پاڵەوانێکی نموونەیی و خۆشەویست ناکەیت، گەرچی ئەوەش قسە هەڵدەگرێت!! بەڵام لێرە مەبەستی من لە باسکردنی سۆفیدا خوێندنەوەی رشەخنەیی، نییە بەڵکو تەنها مەبەستم ئەوەیە تۆ کەم خۆت بخۆیتەوە، بۆیە خۆم دەکەمە مەیموون و وەك ئەکتەرێکی لێهاتوو رۆڵی سۆفی دەگێڕم و نمایش دەکەم تا لەم دەوروبەرە بۆگەنە دەرتبهێنم و بتبەم بۆ جیهانە سادەکەی سۆفی.. دەباشە باسی ئەوەشت بۆ دەکەم، گوێبگرە:

سۆفی مانگێك دەبوو زەلالەتی بوو بەدەست هەردوو ژنەکەیەوە، چونکە یاخی ببوون و لەگەڵیدا نەدەخەوتن. ئێوارەیەك درەنگوەخت خۆی کرد بەماڵدا، بەڵام سۆفییەکەی بەیانی نەبوو کە لە ماڵ دەرچوبوو، تەماشای سەروسەکوتیمان کرد، هەموومان تەنانەت خاڵۆژنە گەورەش، کە زۆرکەم پێدەکەنی دایەقاقای پێکەنین، جا ناهەقیشی نەبوو، سۆفی لەتۆزی لۆکەدا خەرق ببوو، کەواکەی بەروپشت لەبەرکردبوو، لەگازەرەی پشتیەوە تا دەرقاچەی دەرپێ سپییەکەی بەدەرەوە بوو، ئەو بەپێکەنینەکەمان زۆر ئاڵۆز و قەڵس بوو، هیچی نەوت، بەڵام لەگەڵ خاڵۆژنە گەورەدا گۆڵمەزێکی نایەوە. با باسی گۆڵمەزەکەت بۆ نەگێڕمەوە، چونکە غەدرێکی گەورە بوو لەو بەسەزمانەی کرد، بەهەرحاڵ سۆفی بۆ واشپرزە بووە؟ ئەوە گرنگە.. ئەمە تومەز لەگەڵ بێوەژنێکدا دۆستایەتی پەیدا کردووە و قرمی لێخۆش کردووە بیخوازێت. ئەو رۆژە بە خەیاڵی ئەو ژنەوە خۆی لەبیر دەکات و بەپێش دەزگای کارکردنەوە خەریکی دوورینی لێفەیەکە کە قەولی بە دەسگیران داوە زوو بۆی تەواو بکات، بە دڵ و بەداو لەگەڵ تەقەڵ هاوێشتندا بیری لەو رۆنە کردبووەوە، کە رۆژێك کولێرەیەکی گەرمی تێدەسوێ، کاتێك دەزانێت شەوی بەسەردا هاتووە و بەپەلە خۆی لەبەر دەکات، بەڵام ئەو خۆلەبەرکردنەی کە بۆم باسکردی.. ئاخری ئەو ئافرەتەشی هێنا و بوو بە سێهەمین خاڵۆژنی من!! جا خۆش شەوی زاوایەتی بوو، سێ رۆژ بەر لەگواستنەوەی بووك ژنە گەورەی رەوانەی ماڵی باوکی کرد و ژنە

بچکۆلەکەشی، کە بە کەین و بەینی زانی بۆ بەیانی تۆرا و رۆیشتەوە ماڵە باوانی.. ئیتر ماڵ بۆ خاڵۆی تازە زاوا چۆڵ بوو.

سێ مانگ زیاتر دەبوو هیچ یەك لەژنەکانی روویان نەدابوویە و لەگەڵیدا نەنووستبوون، بۆیە زۆر تینووی بوو، وەك گا بوغە لە حەیبەتدا چاوەکانی خوێنیان تێزابوو.. شەو بووکیان کردە پەردەوە و تەنیا خەمی سۆفی پاڵپێوەنانی میوانە رەزا قورسەکانی بوو، کە دایانکوتابوو هەڵنەدەستان.. ئەو هەر دە دەقە جارێك سەعاتەکەی لەبەر باخەڵی دەردەهێنا و تەماشایەکی دەکرد.. وەلێ بێفایدە بوو، ناچار وەك ئەکتەرێکی شارەزا چەند جارێك باوێشکی قووڵی دا، کەچی کەس لێیحاڵیی نەبوو هەڵنەسان! بۆیە پێی نایە جەرگی خۆیدا و وتی: ئەرێ شەو درەنگە ئێوە خەوتان نایەت؟ ئیتر میوانەکان لە فیکەی خۆیان تێگەیشتن و هەڵسان خواحافیزیان کرد، هەر ئەوەندە خۆش بوو ماڵ چۆڵ بوو..

سۆفی کراسێکی سپیی عارەبی لەبەردایە و بە بێنەوەی ئیشارەتێك، داوای رووخسەتێك لە (سەرتیپ)ی خوشکەزا و هاورێی بکات، وەك رێبوارێکی رێگای دوور و تینوو، بەسەر کانییەکدا کەوتبێت، ئاوا خۆی دەکات بەژووری بووکدا و بێ سەلام و عەلەیك و بێ بسمیلا، خۆیدەداتە بانیا، برێك ورتە و چپە لە ژوورەکەدا بەرز دەبێتەوە، نیخەنیخ و مرەمر، ژنە هاواری لێهەڵدەسێت: کورە پەلەمەکە، پەلەمەکە خۆ راناکەم، کورە پەلەمەکە.. سۆفی بەژێت کوردی دۆنەدیت، کورە سفرە تلیشت کرد، بیکە لە رێی خوادا ئەدرێت! ئاخر بەیانی چی بێژم؟

کپییەك باڵ بەسەر ژوورەکەدا دەکێشێت.. دەنگێك لە سووچی ئەوسەری زیندانەکە بەرز دەبێتەوە.. (مرد..مرد فریاکەون ئەم کابرایە مرد..) بەندییەکان لە دەوری گلێر دەبنەوە، کابرای نەخۆش پل دەخوات و دەناڵێنێت، کەف دەچەرێنێت و چاوەکانی بازوو دەبنەوە، دەرگای زیندان دەکرێتەوە و بە چوار دەستە هەڵیدەگرن و دەیبەنە دەرەوە، بۆ سبەی وتیان کابرای بەندیی خۆی دەرمان خوارد کردووە!! چۆن دەرمانی خۆکوشتنی دەس کەوت؟ هەرکەسەو چیرۆکێکی دەگێڕایەوە..



## (١٢)

پاش دوو مانگ گوزەراندن تەواو بە ئاو و هەوای بەندیخانە راهاتبووم. رۆژێك ناوی من و عەلی- یان بانگ کرد. ئەنجا بۆ کوێ؟ مەگەر خۆیان و خوای خۆیان بزانن بۆ کوێمان دەبەن.

کە خواحافیزیم کرد هاوەڵەکانم خەم دایگرتن، وتم: هیوادارم زوو بگەڕێمەوە لاتان.. ئەوکاتە کە خواحافیزیم کرد، سەرتیپ، بەپێوە راوەستابوو، کە تێمڕوانی رووخساری رەش داگەڕابوو، دەمزانی پڕپڕە لەداخ و خەفەت و دەزوویەك رۆشنایی! بۆیە لەپێشدا جورئەتم نەکرد بیدوێنم، بەلاّم خۆ هەر دەبوو شتێکی لەگەڵدا بڵێم، بۆیە چوومە پێشەوە و دەستم لەملی کرد، کەمێك نووساندم بە سینگمەوە و وتم: کاکە گیان من دڵنیام دەمانهێننەوە بۆ ئێرە، وابزانم لێکۆڵینەوەی زیاترم لەگەڵدا دەکەن، خۆ ئەمە قسەیەکیشە دەیکەم، ئەگەر هاتوو ئازاد کرام سوێند بەئەو هەموو پیرۆزییانەی کە هەردووکمان سەریان بۆ دادەنوێنین، هیچ کات درێغیی نەکەم لە سەردانیت، ئەگەر هیچ دەرفەتیشم نەبوو بەلێن بێت هەموو رۆژێکی مواجەهە کەسێك بنێرمە سەردانیت.

من بۆیە باسی ئەگەری ئازادبوونم بۆ کرد، ئەو خۆیشی ئاگای لەئەو هەوڵە بوو کە بۆیان دابووم، گوایە بە برێ بەرتیل ئازاد دەکرێم، ئەو تاڵە تیشکەش، کە دڵی سەرتیپی رۆشن دەکردەوە ئەو ئومێدە کزە بوو.

لە دەرگای قاوشەکەوە بەرەو دەرگای سەرەکی بەندیخانەکە، لەوێشەوە بەرەو دەرەوەی حەوشەکە و سواری ئۆتۆمبیلێکیان کردین. دیسان سەر بەرەوژوور، بەلاّم کام ژوور؟! خۆ هەتا دەگەیتە دوو رێیانەکەی دووز- کفری نازانی بۆ کەرکوك دەتبەن یان بۆ کفری؟ ئەگەر رێگای کەرکوك بگرێتە بەر ئەوا لەوێ (هەیئە) هەیە، خۆ ئەگەر لە کەرکوکیش لای نەدا ئەوا بۆ قەسابخانەکەی موسڵ دەڕۆین، ئەو قەسابخانەیە کە کەم کەس هەیە ناوی ئەو شوێنە بەدناوەی نەبیستبێت، ئەگەرچی دەمزانی هەیئە و موسڵ بۆ ئێمە کە هیچ تاوانێکمان لەسەر ساغ نەبووەتەوە دوو ئەگەری دوورن، بەلاّم چونکە دوو شوێنی بەدناو و تۆقێنەر بوون لەئەو کاتانەدا لە خەیاڵ و زەینی مندا سەریان هەڵدا، بەلاّم کە ئۆتۆمبیلەکە گەیشتە دوو رێیانەکە، بەرەو کفری بەدەستی راستدا لایدا و پاش نیو کاتژمێر خۆی کردە ناو شاردا و یەکڕاست رووی کردە بنکەی پۆلس و لەوێ کردینیان بە ژووردا.

ئەو شەوەم بەبیرکردنەوە گوزەراند، بەیانی کە رۆژ بووەوە من چاوەڕوانی دووبارە ئیفادە وەرگرتن و سین و جیمێکی تر بووم بەهیوای کارئاسانی و ئازادکردنم، کەچی بە جووتە بردینیان بۆ (تەجنید)ی شار، لەوێ کە چوومە ژوورەوە و ئەفسەرەکە چاوی پێمکەوت بەشێوەیەکی تەوساویی و سووکایەتیکردنەوە وتی:

- تۆ(سەعید)ی وا نییە؟ (حەمە سەعید بەگی جاف) واستەتە هاااا؟ من پێیموت؟

+ بەڵێ من سەعیدم بەڵام لە مەبەستت حاڵیی نابم، واسیتەی چی؟!

- بەڵێ..بەڵێ چاك دەزانی چی دەڵێم، بەڵام دڵنیام نازانی حکوومەت کەروێشك بە عارەبانە دەگرێ؟

هەر ئەوەندەی وت و داوای لە پۆلیسەکە کرد، کە لە دەرەوە رامگرێ. قسەکانی ئەو ئەفسەرە بۆنی خراپی لێدەهات، بۆیە لە دڵی خۆمدا وتم: ئەم هەویرە ئاوی زۆر دەکێشێ..

پاش نیو سەعات چاوەڕوانی، زەرفێکی بۆری داخراویان دایە دەستی مەئموورەکەوە و ئەویش دامانییە پێش خۆی بۆ بەندیخانە، کە بەرەو پۆلیسخانە دەچووین لە پۆلیسەکەم پرسی ئایە هیچ شتێك دەربارەی چارەنووسی من دەزانێ، ئەو مۆرەیەکی لێمکرد و هیچی نەوت. تفەنگەکەی لە شانی داگرت و گرتی بە دەستییەوە و زیاتر لێمدوور کەوتەوە. ئەوساکە بە روو گرژییەکەوە وتی: من چوزانم؟! جا راستیشی دەکرد، چونکە پرسیارەکەی من زۆر بێمانا بوو.. ئاخر پۆلیسێکی بەدبەخت لە بەجێگەیاندنی ئەو فەرمانەی کە پێیدەدرێت چیتر دەزانێت؟!

شەو کە سەرم نایە سەر سەرین، تاوتوێی ئەم گەرمیان و کوێستانەم کرد، کە پێمدەکەن، گواستنەوەم لەم زیندانەوە بۆ ئەو زیندان و بردنم بۆ باقووبە و هێنانەوەم بۆ کفری یانی چی؟ بە لێکدانەوەی خۆم گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە چارەنووسم ئەگەر خراپتر نەبێ ئەوا باشتر نابێ.. بەڵام نەمدەزانی ئەنجامەکەی چۆن کۆتایی دێت؟ بۆیە هەوڵمدا چیتر بیر لەئاییندە نەکەمەوە.. ئەو شەوە زۆر لە بیرەوەرییەکانی ساڵانی رابوردووم بە مێشکمدا هات و گوزەری کرد، تاڵی و سوێری، تەنگانە و دەرباز بوون، نومێدی سەرکەوتن و شکستی کوتوپڕ..

ساڵانی حەفتاکانم هاتەوەبیر، دواشەڕی هێزی پێشمەرگە و سوپای رژێم لە (چەمی خان)م بە خەیاڵ بەسەر کردەوە. ئەو رۆژانەی کە دێکەی ئێمە وەکو زۆربەی دێهاتەکانی تر چۆڵ کرا و خەڵکەکە ماڵ و منداڵیان لەئەو هەردەوهەڵەت و کەلۆزانەدا حەشار دا، ماوەی چەند رۆژێکیش شەڕ بەگەرمی درێژەی کێشا. ئەو پێشمەرگانەی کە لە شەڕەکەوە بۆ پشوودانێکی کورت دەگەڕانەوە، باسی تێهەڵچوون و کوشتاریان لە مەیدانی شەڕدا وەکو خۆی بۆ خەڵکەکە دەگێڕایەوە،

لەگەڵ ئەو باس و خواسەی دەروێش دەبینی و بۆ گوێگرەکانی خۆی باسی دەکرد، جیاوازییەکی زۆری هەبوو، دەروێش بەمشێوە باسی شتەکانی بۆ باوکم دەکرد، کە بە چاوی خۆی بینیبووی، ئەو شەوێك هاتە بن کەلۆزەکەی ئێمە و ئەم حیکایەتەی باس کرد:

کە تەیارە مێکەکە دێتە سەر شەڕەکە، باڵدارێکی چەرموو چەرموو، یەڕیی واشەیە و واشەیش نییە، کەمێ لە واشە گەورەترە، هەر ئەوەندەی بازێکە، بەلام پەڕوباڵی چەرموو، ئەوەندە چەرمووە خۆرەکە لە پەڕوباڵی ئەدا وەك کلۆی بەفر ئەبریسکێتەوە، کە تەیارەکە هات ئەویش وەك (تەیرەن ئەبابیل) تاین ئەوێ و وەدوای کلکیا باڵ ئەگرێتۆ، تەیارەکە بۆ حەوا هەڵئەکشێ ئەویش وەکو تیسکەی گوللە ئەکەوێتە دوای، تەیارەکە شۆڕ ئەوێتۆ مەلی تاین شوێنی ئەکەوێ و یەڕی ئێستە نا تاوێکی تر خۆی ئەکاتە ناو تەیارەکدا، ئیتر وا سەر لە سایەق تەیارەکە ئەشێوێنێ سایەقی خوا خراوبۆکردوو ناتوانێ نیشانە لە سەنگەری پێشمەرگەکان بگرێ، وە ناچاریی بۆ تاقی عاسمان بەرز ئەوێتۆ و دوورلاتراسکە ئەوەسێ، مەلە چەرمووەکە وەدوای ئەکەوێ و سەری لێنەشوێنێ کابرای سایەق تەیارە، کە زۆر وە زەحمەت خۆی پێنەگیرێتۆ، ئیزەن هەڵئەچەرخێتۆ سەر بەرەو خوار تێئەقووچێنێ، بازەو جارێ هەر وەختە خۆی بکێشێتە ئەو تەپۆڵکانەدا و لە ناو هەردەکەدا گڕی تێبەر بوێ.. دەی باشە کێ ئەزانێ ئەو مەلە چەرمووە رۆحی پاکی ئەولیایەك نییە؟ ناخر ئەگەر وانییە لالە تۆ پێمبێژە بۆ تائێستا پێشمەرگەیەك خوێن لە لووتی نەهات..

کە هەواڵی ئەم باڵندە سپییە کەوتە سەر زاری ئەم و ئەو ئیتر هەر واخەڵك بوو یەك یەك و دوو دوو دەیانکردە سەر یاڵ و گردە بەرزەکاندا و دەیانڕوانی، تا وایلێهات غەیری دەروێش، خەڵکی تریش لە ناوایدا باڵندە سپییەکەیان بینی کە بەتیژیی گوللە بەدوای فڕۆکە مێکەکەدا تیژ دەفڕیی، نەك تەنیا ئەم مەلە سپییە، کە یەکەم جار دەروێش بەدیی کرد. تەنانەت شەوێك پیاوێکی سپیپۆش دێتە خەوی و پێیدەڵێت: دەروێش هەر سبەی زوو ئاگاداری ئەو پێشمەرگانە بکەرەوە و پێیانبێژە، هەرکامیان پەڕێك لەپەڕی ئەو مەلە چەرمووەی بەردەس کەوت با بەکشتەکێکی سپییەوەی بکات و وەك بازووبەن بیکاتە مەچەکی لای راستی، ئیتر بەئیزنی خوا لەخۆی نەترسێت و قەت گوللە نایبڕێت..

پاشان دەروێش وتی: ئاخر چونکە کورد خوای خۆی وەهەق ئەناسێ و حوکمەت غەدری لێئەکا، بۆیە ئەو مەلە چەرمووەی نازلکردە گیانی تەیارەکە، ئەو مەلە سپییە تەیرن ئەبابیلەی کوردە!!

ئەو شەوە چەند جارێك باوکم وەکو خەیاڵ هاتە پێش چاوم و هەموو جارێکیش تێیدەخوڕیم و هەمان رستەی دووبارە دەکردەوە: سەعی کوڕم نەترسی پشت وەخوا نەجاتت ئەوێ..

باوکم لەپێش چاو وندەبوو، من دەچوومەوە بۆ چەمی خان و شەڕ لەچڵەپۆپەی گەرمیدابوو، دەروێش دیسان پەیدا بوو، لالە حەمەفەرەج ئەوە مەلە چەرمووەکە هیچ، خۆ دونیا وەچاوی خۆی دیی چۆن وەدوای تەیارەکەدا خۆی لوول ئەکا و ئەفڕێ، دواییش کە تەیارەکە دائەهاتۆ ئەویش خۆی قەمچ ئەکرد و شۆڕ ئەبوۆ، جا ئێسا گوێم بۆ شلکە لالەگیان، بەقورعانە ڕەشەکەی مەرقەو لالە درۆناکەم ئا وەم دوو چاوەی خۆم دیم، ئەمە سێ ئێوارەیە ئا وە ئەم دووچاوەی خۆم سەیرەکەم لەئەولای (خزنەکەی سپیسوار)ەوە بەرلە خۆرئاوابوون، هاها وەسی جزمی قورعان لالە گیان، وە مەرقەوەکەی شێ حەسەنی قەرەچێوار، هیمەت و بەرەکەتی حازروێ، کاورایەکی سەراپا چەرموو ئەوینم بڕنەوێکی درێژی دار شووشەی ناوەتە ئەرەی شانیوە، هێواش هێواش، یاپشە یاپشە ئەو هەردەوهەڵەتە ئەداتەبەر و روو ئەکاتە (کەڵۆزە میرخان) هاهاها..

(دەروێش دەستی بۆ توولە رێگاکەی ئەوبەری خۆی راکێشا)، ئالەو باریکە رێوە شۆڕ ئەوێتۆ ناوچەمەك و وەك تیکەیە نان قووتدەی، ئاوا ئەچێتە قووتاو نامێنێ، پیاو نازانێ عەرز قووتی ئەدا؟ عاسمان هەڵیئەکێشێ؟ نازانم.. دە تۆ ئاخر پێمبێژە لالە، ئەو پیاوە چەرموپۆشە کە کەس نازانێ لەکوێوە تێ و بۆ کوێ ئەچێ و تا ئێوارە دوور لە سەنگەری پێشمەرگەکان، سەنگەر لە ئەو جەیشە ئەگرێ و شەڕ ئەکا و عەسکەر ئەکوژێ، خۆ لەوانەیە ئەیشیانکوژێ، چونکە عەسکەریش گوناحە و ئەم حوکمەتە زاڵمە وەزۆر ئەیانگرێ و ئەیاننێرێت بۆ شەڕی ئێمە! ئا ئەو پیاوە موبارەکە، وەلییەك، ئیمامێك، یان پیاوچاکێکی وەکو پیری قەرەچێوار نەوێ، دە تۆ بێژە کێیە؟

باوکم بۆی سەلماند و وتی: کورد موسڵمانە و حوکمەت غەدری لێئەکا، ئێ خۆ پیاو چاکیش ئاگای لە دونیا هەر هەیە..

دەروێش قسەکەی لەدەم باوکم قۆستەوە وتی: هیچ دوور نییە لەوانەیە شێ حەسەنی قەرە چێوار وێ.. کێ یەژێ (حاجی کاك ئەحمەدی شێخ) یان (شێ عەلییە کۆسەی دۆڵە پەموو) نییە؟ رۆحم وە قوربانی یەکە وە یەکەیانوێ.. من باسی پیری قەرە چێوارتان بۆ ناکەم ئەوەکو بێژن هەر باسی شێخی خۆیەکا، ئەوە هیچ هیممەت و بەرەکەتی حازروێ، شێ حەسەن یەکێ بوو لە وەلییەکانی زەمانی خۆی، دە با باسی کەشف و کەراماتی کاك ئەحمەدی شێخ و شێ عەلییە کۆسەتان بۆ بکەم.. ئەو شێ عەلییە کۆسە، کە قۆزاخەی پەمووی کردە ئاڵتوون، ئەو شێخە وا وە دەسی خۆی و وە عارەقی ناوچاوانی خۆی نانی تەکییەکەی پەیا ئەکرد، ئەو قەت چاوەرێی دەسی دەروێش و موریدەکانی خۆی نەئەکرد،

رۆژێ لەو شارەزوورە خەریکی ئاودانی پەموو ئەوێت لە هەسێلکەوە ئاو هەڵئەگرێ و گوڵە پەمووەکان ئاوئەدا، وەختێ ئەزانێ ئاو وەدوای بێڵەکەیا نایە! پاشەوپاش ئەگەڕێتە دواوە و سەیر ئەکا یەك دوو هەنگاو لە داوێنی هەسێلکەوە گۆلەکە تەقییە و ئاوەکە شکیاوە، ئەڕوات و یەك دوو دەمەبێڵ خۆڵ هەڵئەگرێ و ئەیکاتە سەر شوێنە شکیاوەکە و خاس ئەیکوتێتۆ، ئێژن ئاوەکە بۆ ناو گۆلەکان ورروژم ئەکات، ئەو ئەکەوێتە بەر ئاوەکەوە ئەچێ بەر گۆلەکان بەربدا، وەختێك ئەزانێ دووبارە ئاو نەما، شێخ سەری سوڕ ئەمێنێ بۆیە ئا لەویا هەڵوێسەیەك ئەکا و هەمدیسان بەرەودوا ئەگەڕێتۆ، کە سەیر ئەکا گۆلە ئاو ئێژەن لە شۆێنەکەی هەوەڵجارا شکیاوەتۆ، عاجبایەتی لێتێ بۆیە لە شوێنەکەی خۆیا رائەوێسێ و کەمێك چاوەنووقێنێ و وەچاوی باتینی ئەڕوانێ.. دە ئێوە گوێبگرن بزانن مەسەلەکە چۆنە و چییە دواییش چی رووەدا؟ کاك ئەحمەدی شێخ لە مزگەوتەکەی خۆی لە سلێمانی دەرس وە چەن فەقێیەکی خۆی یەژێتۆ، کەوە چاوی باتینی ئەڕوانێ سەیر ئەکا ئەوا شێ عەلی وەسەر مەزراکەی خۆیەوە لە شارەزوور خەریکە ئاوی پەموو ئەدا ئەویش لە دڵی خۆیا یەژێ با تووڕەی کەم تا کەشف و کەراماتی خۆی بنوێنێ و پێشانی فەقێکانی بدا، کاك ئەحمەدی شێخ وە عەنقەس، وەبەر چاوی فەقێکانییەوە چوکڵێ هەڵئەگرێ و لەبەردەم خۆیا وەسەر عەرزەکەوە دوو سێ خەت وەسەر یەکا تێرێ، فەقێکان کە ئەم وەعزە ئەدوینن واقیان وڕەمێنێ و نازانن مامۆسایان خەریکی چییە و چی ئەکا، لێینەپرسن و یەژن: قوربان بۆ وازت لە دەرزوتنەوە هاورد و خەریکی وە زەوییەکەی بەردەم خۆتا ئەو چوکڵە تێریت و ئەوەیت؟ ئەویش پێیانیەژێ: ئەوە خەریکی شکانی ئاوەکەی شێ عەلییە کۆسەی دۆڵ پەمووم و تووڕەی ئەکەم، لەسەر سێەمین جارە، کاك ئەحمدی شێخ بزەێ ئەکا و وە فەقییەکانی ئێژێ: دەی کوڕینە وە پەلە کتێوەکانتان بپێچنۆ و راکەنە ژوورۆ.. تۆ سەیرکە بزانە چی ئەقەومێ؟

شێ عەلییە کۆسە وە چاوی باتنی، کە سەیر ئەکا، ئەڕوانێ کاك ئەحمەدی شێخە ئاوەکەی ئەشکێنێ، بۆیە تووڕە ئەوێ و ئالەو شارەزوورەوە دەمە بێڵێك قوڕ و لیتە هەڵئەگرێ و ئەیگرێتە مزگەوتەکەی شێخ لە سلێمانی، نیتر هەتا ئەم خۆی و فەقێکانی وە پەلەپروزە ئەتەپێنە حوجرەکەیانۆ قوڕی تاین تێتت..تێتت، وەعاسمانۆ وەك واشەی برسی چۆن بۆ چۆلەکە شۆڕ ئەوێتۆ ئاوا لولەخوات و شۆڕ ئەوێتۆ، تێتت..تێتت، (دەروێش دەستی راستی بە عاسمانەوە گرتبوو شۆڕی کردەوە بۆ بەردەم لوتی خۆی)،

کششپەی تێت، تۆپەڵە قوڕی تاین، شـلـپـپـپ.. ئەلکێتە بان قاپی حوجرەکەی کاك ئەحمەدی شێخۆ!!!

دە باشە لالە کوردی موسوڵمان وەلی وەك کاك ئەحمەدی شێخ و شێ عەلییە کزسە و شێ حەسەنی قەرەچێواری بویێ بۆ ئێستا نازانن حاڵ و وەعزی ئەم خەڵکە چییە؟

ئەو پیاوە چەرمەوو لەبەرە بویێ و نەویێ یەکێکە لە ئەو ئەولیایانە و نیمرۆ بۆ پشتگیری کورد و پێشمەرگە وە ئیزنی خوا تێن و هەر لە بەیانیوە تا ئێوارە وە بێ نان و ئاو شەر ئەکەن، بۆ نا؟ هیچ دوور نییە ئاخر تۆ بڕوانە لەناو ئەم ئاگرباران و بۆردمان و دەسەویەقەدا، تۆ سەیرکە بزانە یەك پێشمەرگە خوێن لە لوتی هات؟!



شەو داشکابوو، بەدەم بیرکردنەوە لەو ڕۆژانەی کە سەرکەوتنی پێشمەرگەمان لەشەڕێکی ناوچەی گەرمیاندا بەسەرکەوتنی شۆڕش دەزانی و بە رزگاربوونی یەکجاریی نیشتیمانمان لەقەڵەم ئەدا، مێشکم خاو بووەوە و خەوم لێکەوت.

دەمەو بەیانی، کە بەئاگا هاتمەوە، چۆلەکە بە سەر دارخورمای ناوحەوشەی پۆلیسخانەکەوە جریوەجریویان بۆ سەرەتای ڕۆژێکی نوێ دەدایە بای گوێی من و پاسەوانی بەندیخانەکەدا.

بەدەم جگەرەکێشان و بیر کردنەوەوە لەوەی چی چاوەڕوانم دەکات، یان من چاوەڕوانی چی دەکەم؟ ڕۆژم کردەوە. وردەوردە دەنگەدەنگ و جموجوڵ کەوتە ناو پۆلیسخانەکەوە. پاش پێکوتانە زەوی پۆلە پۆلیسی بەر دەرگای سەرەکی پۆلسخانەکە بۆ قودوومی بەڕێوەبەر، چاوەڕوانیم خەست و خۆڵ بووەوە، هەر ئەوەندەی پێچوو جەنابی بەڕێوەبەر چایەکی گەرم و ڕەش و شیرین بخواتەوە، دواییش کەمێك پشت بە کورسییەکەیەوە بدا و دووکەڵی جگەرەیەك بەبادا بدات، پۆلیسێك هاتە بەر دەرگای بەندیخانەکە، پارچە قاقەزێکی بە دەستەوە بوو، ناوی من و عەلیی خوێندەوە و داوای ئامادە باشی لێکردین. ئێمەش پێخەفەکانمان پێچایەوە و چاوەڕوان بووین ئەوەندەی تۆ جگەرەیەك دابگیرسێنیت و بیکێشی دەرگەوانەکە هات قوفڵی سەردەرگاکەی ترازاند و دەریان کردینە دەرەوە. سواری ئۆتۆمبیلێکیان کردین و لە شار دەرچوو، کە گەیشتینە دوو ڕێیانی (کارێز- دووز) بە دەستی چەپدا لایدا، عەلی چپاندییە گوێما:

+ کاکە ئەجارە بۆ کوێمان دەبەن؟

- ئەم ڕێگایە بۆ جەلەولا دەچێت. ددان بە خۆتـابگرە و پـشووت درێـژبێت، هـەموو شتێکمان بۆ روون دەبێتەوە.

لەڕاستیدا منیش سەرم لێشێوابوو، لەئەوکاتەدا نیگەرانییەکی وا دایگرتبـووم، هیـچم بۆ لێکنەدەدرایەوە.. ئاخر ئەم بێنە و بـەردە و سـەرەوژوور و سـەرەو خوارکردنەوەیـەمان بەبێنەوەی چارەنووسمان دیاری بکرێـت خـۆی لـە خۆیـدا خنکانـدنێکی لـە سـەر خۆبـوو، زۆرجاریش بە سزا و شەڕێکی دەروونی دەهاتە پێش چـاوم، بـەڵام بـۆ دەیکـەن؟ لەوانەیـە شتێکی لێبزانم..

ئۆتۆمبیلەکە گەیشتە ناو شارۆچکەی جەلەولا، لەوێدا خۆی کردە ناو سەربازگەیەکدا و لەبەر دەرگای ژوورێکدا راوەسـتا. مەئمورەکـە دابـەزی و چـووە ژوورەوە، کـەمتر لـە نیـو کاتژمێری پێچوو، هاتەوە و سـەربازێکی لەگەڵـدا بـوو، سـەربازەکە فـەرمانی دابـەزینی داینێ، ئێمەیش دابەزین و دامانییە پێش خۆی هەتا گەیاندینیـە بـەر دەرگـای ژوورێکـی پەرپووت و لاتـەریك. دەرگاکـەی لێکردینـەوە و چـووینە ژوورەوە. ژوورەکـە دەرگایـەکی ئاسنینی بێ پەنجەرە و بێ هەواکێش بوو. هەر بە چوونە ژوورەوەمان، بۆنی میـز و پیـسی کاسی کـردین. عـەلی واقـی وڕمـابوو، خـۆ ناهەقیـشی نـەبوو.. ئـاخر مێردمنـداڵێکی زمانەزانی بێگوناهی وەکو ئەو مرۆڤە، نەبێ لەناو ئەم گەلەگورگەدا بیر لە چی بکاتەوە؟ بۆیە رووی دەمم لێکرد و پێمگوت: عەلی گیـان خـەم مـەخۆ، بڕوامـوایـە زۆر لـەم ژوورە پیسەدا نامێنینەوە، چونکە وادیارە ئێرە بەندیخانە نییە، بۆیە دڵنیـام زوو دەمانگوێزنـەوە بۆ شوێنێکی تر..

لەگەڵ ئەم دڵنەواییکردنەی عەلیدا، بەدەم دەرگاکەوە راوەستابووم و بـەژێر پێڵاوەکـانم لابەلا کەوتمە گسکدانی زەوییەکە و جێگاکەم راخست و پاڵمدایەوە، ئیتر تۆ خـۆت لێکـی بدەرەوە و بزانە چی هەیە بیری لێبکەمەوە؟ بە بۆچوونی من مـردن زۆر لـەوە خۆشـترە تـا ژیان لە مزلەقدا بێت..

پاش نیوەڕۆ، دەنگی بووقێ لەسـەربازگەکەدا دەنگـی دایـەوە. پـاش کـەمێك تەپـەی پۆسـتاڵ و تەقەتـەقی قوسـعەم بـەر گـوێ کـەوت. گـوێم هەڵخـست تـابزانم کـەس لێماندەپرسێتەوە یا نا.. زۆری پێنەچوو دەرگای ژوورەکـەمان کرایـەوە، سـەربازێك داوای لێکردین یەکێکمان لەگەڵیدا بچین بۆ خواردن وەرگرتن! عەلی ئەو مەنجەڵە گـچکەیەی کـە لـەناو جانتاکەیـدا هـەڵگرتبوو، دەرکـرد و کەوتـە دوای سـەربازەکە، کـە گەڕایـەوە پـڕ

سوراحییەك ئاویشی بەدەستەوەبوو! ئەو بەرووخسارێکی گەشەوە هاتە ژوورەوە و سەربازەکە دەرگاکەی لێداخستین.

لەکاتی رۆیشتن و هاتنەوەیدا، عەلی بە عارەبییەکەی خۆی، سەربازەکەی دواندبوو، ئەویش پێیوتبوو، کە لەوانەیە هەر ئەمڕۆ یان سبەی لەئەم ژوورە بمانهێڵنەوە، سەرەنجام دەرمان دەکەن و هەر لەئەم یەکە سەربازییەدا خزمەت دەکەین!! من لەئەو باوەڕەدا بووم، کە لە مەترسی رزگارمان بوو، بەلاّم ئەوندەی عەلی دڵخۆش نەبووم بە قسەکانی ئەو سەربازە.

ئەو چوار رۆژەی لەئەو سەربازگەیەدا ماینەوە، من هەر بەجەستە لەو ژوورەدا بووم، ئەگینا بە رۆح ئازاد بووم و بە ئەوپەڕی سەربەستییەوە بیرم دەکردەوە و سەفەرم دەکرد.. ئاخر مرۆڤ لە زینداندا دەتوانێت بە خەیاڵ ئازاد بێت و بۆ خۆی بەبێ پاسپۆرت سەفەر بکات، بەلاّم سەفەرێك دوور لە واقیع و بە بێدەنگی.. سەفەرێك بێئەوەی کەس پێیبزانێت بەرەو کوێ دەچێت و دۆستایەتی لەگەڵ کێدا دەگرێت؟ ئەگینا ئەو خەیاڵ و سەفەرەش گومرگی خۆی هەیە!! بۆ نا؟ ئاخر کابرایەك خەونی گێڕابووەوە و وتبووی: لە خەونمدا بوومە بە سەرۆکی ولاّت.. کە دەسگای ئەمن بیستبووی فەرمانبەرێك خەونێکی لەو شێوەیەی بینیوە لێیانپێچابووەوە و پێیانگوتبوو: باشە ئەگەر تۆ تەماحی کودەتات بەسەر "سەرۆکی خۆشەویست"ت لە مێشکدا نەبووبێت چۆن خەونی وا دەبینیت؟! بۆیە دەدرێتە دادگا و وەکو تاوانبار زیندانی دەکرێت!!

من نەمدەتوانی بیرم لەناو ماڵ و منداڵمدا رابگرم، چونکە دەمزانی ئێستە ئەوێ جەهەنمێکە بۆ خۆی، بۆیە دەمویست خۆم لەئەو دۆزەخەی کە خودا، یان راستتر بڵێم سەدام بۆی داخستوون بە دوور بگرم، ناچار چوومەوە بۆ هەردە و کەلۆزەکانی ساڵانی ١٩٧٤ و شەڕی (چەمی خان).

تاقی بەیانی فڕۆکە مێکەکان چەند جارێك شەڕگەکە و لەخواریشەوە بۆ ژوور چەمی خانیان بۆردوومان کرد، ئیتر ئاسمانی دەڤەرەکەیان چۆڵکرد و بەدەر نەکەوتن. دەنگی تۆپە دوورهاوێژەکان و تانکەکانیش نەدەبیستران، کپی و بێدەنگی مەیدانی شەڕ، میزاجی خەڵکە هەڵهاتووەکەی تێکدا، خۆ ئەگەر ئەم بێدەنگییە دەرئەنجامی شکستی سوپای داگیرکەر بوایە، ئەوا پێشمەرگە زوو بەدەر دەکەوت و دەبوو بەجەژن و تەقەی خۆشیی و تەپڵی سەرکەوتن، چەم و ئەشکەوت و بەرد و بنچکی دەخستە هەلەکەسەما، بەلاّم

وادەرنەچوو.. پاش نیوەڕۆ هەواڵی شکستی هێزی پێشمەرگە لەئەم دۆڵەوە بۆ ئەو کەلۆز، تاکوتەرا دەبیسترا و دواییش هەموو قەلا قایەکانی ورەی خەلکەکەی رووخاند و هاڕی و دای بەبادا..

عەسرەکەی دەروێش لەناکاودا پەیدابوو، خۆی ترنجاندە بن کەلۆزەکەی ماڵی ئێمە. ئەو غەم و پەژارە و نیگەرانی لە رووخساری دەباری. باوکم هەواڵی ناخۆشی بیستبوو، کەچی لێیپرسی: دەروێش بۆ وا غەمباریت.. بێژە بزانم چیت بیستووە؟

ئەو دەروێشە ورە بەرزە، کە دوێنێ بە منداڵە ورتکەی کەلۆز و بە شوانەکانی دەوت: کوڕە لە تەیارە نەترسن، هەر وا بزانن قەلەڕەشە و وە بان سەرتانا ریقنە ئەکا، ئەگەر وەعاسمانۆ دیتان چنگی بۆ بکەنەوە و بێژن، ترە گەوڵ بابێ..

دەروێش بەکز و مەلوولی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بەبێ روخسەت وەرگرتن دەستی درێژکرد و کیسە توونتنەکەی باوکمی بۆ لای خۆی راکێشا.. بەدەم سیگار تێکردنەوە کەوتە قسەکردن و گوتی: لالە گیان دوێکە ئێوارە تفەنگچییە چەرموو پۆشەکەم دی، چەکەکەی سەربەرەو خوار کردووەتە شانا و سەر بەرەو ژوور ملی ناو رۆی، کە ئاوا ئەو پیاو چاکەم دی موچڕکەیەك وە لەشما هات و بەرچاوم تاریك بوو، وتم: خوایە وە چاکی بگێڕی، ئەم تاقی بەیانییەش زۆرچاوم گێڕا بۆ مەلە چەرمووەکە، تەیارەکان چەند جارێك هاتن و چوون و بۆردوومانیان کرد، بەلام باڵندە چەرمووەکە هەر دەرنەکەوت، دڵم داخورپا و وتم: خوایە وەخێری بگێڕی.. حەزیشم نەکرد بێم و پێتبێژم، حاڵ لەمەو حیکایەت لەوە.. لالە بەخوا نەترسم پێشمەرگە شکستی خواردوێ.. خوا دەخەیلتوم وەکو عارەب خوا ئەوەمان پێنەکەی وە زەلیلی نەمانخەیتە دەست دوژمن.. نووووو خوا وەك سەگی رەش لەبەر قاپییەکەتا ئەلوورێنم، خوا خراومان نیشان نەدەی، خوای گشت عالەمیان..

دەروێش چاوەکانی فرمێسکیان تێزا، وەك هەرزاڵە داباریەنە سەر ریشە ماش و برنجییەکەیدا و ئیتر خۆی پێڕانەگیرا. دایە پرمەی گریان و حاڵی لێهات. پاش برێك (حەی حەی) کوڵی دامرکایەوە. باوکم بەدەم مژلێدانی قووڵی جگەرەکەی دەمییەوە بە دەروێشی وت: دەی دەروێش بیری خراو مەکەرۆ.. خوا گەورەیە کوونی، نەمزانی ئەوەنە بێهووردەی، ئەی نازانی خوا کلاوی بۆ بەرووش کردووە؟ باوەڕت بەخوا قایموێ هااا بێقەزاویت دەروێش، خۆ ئەگەر پێشمەرگە لە چەمی خانیش شکستی خواردوێ دونیا کاول

ناویّ.. هەر وەختێکت زانی دوای چەن رۆژێکی تر لەلایەکی ترەوە سەر هەڵئەداتۆ، خوا کەریمە کوونی غیرەت بدەرە بەرخۆت، دەی هیزە شوکری خوا بکە، خوا موڵکی خۆی کاول ناکا..

ئەو رۆژە دەشتودەر، کشومات بوو، فشە کلاّونە تۆقیوەکان بن بەرد و بنچکەکانیان چۆلکرد و هەڵفڕین. هەواڵی کشانەوەی هێزی پێشمەرگە وەك زەل و ترکەی گڕ تێبەربوو دووکەڵی خەستی دۆڵ و کەلۆزی دەڤەرەکەی تەنییەوە، خۆر لەپشت چڕە دووکەڵەکەوە بە رەنگی زەرد و بێتینەوە، خەریکبوو ئاوا دەبوو، دەتگوت خەڵکە هەڵهاتووەکە خۆڵی گۆڕستانی بەسەردا بێژراوەتەوە، هەموو بەحەپەساویی و ترسەوە رادەوەستان و سەیری یەکتریان دەکرد و ورتە لەدەمیانەوە نەدەهاتە دەر. پاشان وردەوردە مقۆمقۆ پەیدابوو، گوندنشینەکان بەناو یەکدا دەهاتن و دەچوون، ئەو ترسەی لەدڵیاندا بوو درکاندیان.. ترس لەسەر و ماڵ، لە دەسگیرکردنی پیاو و گەنجەکانیان، لە تالاّن و بڕ.. ئاخر ناهەقیان نەبوو، تا ئەو کاتە ساڵی "حەرەس قەومی"یەکەیان لەبیر نەچوبووەوە، کە چۆن خانوو و خەلە و خەرمانیان سووتێنران، لەدێی (درۆزنە) دوو شوانیان بە مووس (ئوستەرە) سەربڕی. ئەو شتانەش بە کەڵك هات و چنگیان پێگەیشت، بە قەل و مریشکیشەوە تالاّنیان کردن..

***

## (١٣)

بەیانی زوو لەدەنگی ترازاندنی قفڵی دەرگای ژووری زیندانەکە بەئاگا هاتم. کە دەرگاکە خرایە سەر پشت، من بە چنچکەوە دانیشتبووم، دەستێك دوو سەموونی فڕێدایە ژوورەوە. سەموونەکان کە کێشایان بەزەوییەکەدا تەقتەقیان لێهەڵسا.. ئاخر سەموون نەبوون، خوا شایەتە کە دەستم بۆ بردن ئەوەنە رەق بوون، هەر دەتگوت دوو بەچکە کیسەڵی تۆپیو و وشکهەڵاتوون.. من لەئەو باوەڕەدا بووم بە چەکووش بتکێشایە بەسەریاندا بزیسکەی ئاگریان لێهەڵدەستا!!

عەلی هەر بە راکشاوی چاوەکانی کەمێ ولّی و کەوتە سەر چنچك، وەکو پیشەی هەمیشەیی خۆی، بە راست و چەپدا قرمەی لە پشتی خۆی هەڵساند و تەقاندی، دوایی بە تیلەی چاو تەماشایەکی پڕ مانای کردم، بەڵام من تەنیا بێزاریم تیادا خوێندەوە و هیچی تر.. دووبارە راکشایەوە، روانینەکانی ئەو کوڕە گلێری کردمەوە و سەرنجی بۆ لای خۆی راکێشام. لەزیندانی باقوبەدا، ئەگەر (عگاب) لەوێ نەبوایە زۆربەی کاتەکانم بە گوێگرتن لە حیکایەت و قسەخۆشەکانی (سەرتیپ) بەسەر دەبرد، ئەو خوێندەوارێکی باشبوو، لەپاڵ بەهرەی هونەری گێڕانەوە و رازاندنەوەی بەسەرهات و چیرۆکەکاندا، کوڕێکی باوەڕبەخۆ و رووخۆش و خۆشمەعشەر بوو، کە دەمدواند وام هەست دەکرد هەردووکمان دوانەین و کەمێك دوور لەیەك گەورە بووین، ئەوەندەی من چێژم لە قسە گاڵتەئامێزەکانی وەردەگرت و زوو لێیحاڵی دەبووم، ئەویش ئەوەندە خۆشحاڵ دەبوو بە گوێگرتنم، چونکە دەیزانی بە قسەخۆش و بەتامەکانی کەمێك خەمەکانم لە بیردەچێتەوە، کاتێکیش بەدەم زەردەخەنەوە باسی رۆژگارە ناخۆش و تاڵەکانی بۆ دەگێڕامەوە، کە بەسەری بردبوون، دەچوومە یەك و پەست دەبووم، ئەو دەیگوت: ئەی تڕحێو ئەفەنی، خۆ من ئەو بەسەرهاتانەت بۆ ئەوە بۆ ناگێڕمەوە، تا ناوچاو بدەیت بەیەکدا و خەم داتبگرێت، کابرا تۆ ئەوەندە بە عاتیفە بیر دەکەیتەوە، بە ئەقڵ بیرناکەیتەوە، یاخوا تووشی کارەساتی تر نەبیت، خۆ بەشی دووجاری تر ناکەیت!! ئێمەومانان لەناو کارەسات و کۆسکەوتندا گەورەبووینە و بەرگەمان گرتووە، ئەی ژیانی ئەم کوردە بەدبەختە هەر وانەهاتووە؟ ژیان خۆی تاڵ و شیرینییە، تاریکی و رووناکییە، سەرکەوتن و ژێرکەوتنە.. من نازانم تۆ بیر لەچی دەکەیتەوە؟ دەڵێیت ئاسمانت بەسەردا هەرڕژاوە، دەزانم خەمەکانت گەلێك قورسە، بەڵام ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە دەتپووکێنێتەوە، تۆ زیاد لەحەد عاتیفیت، ئاخر گەر کەمێك ئاقڵانە بیر نەکەیتەوە ئەوا عاتیفە دەتکوژێت و لووشت دەکات لووشش.. کاکی برا من ناڵێم بیر مەکەرەوە، ئەی

ئەیانوتووە: هەموو شتێك بە خوێ و خوێش بە مانـا.. ئـەی نەتبیـستووە کـە دەڵـێن: خەتەنـەکردن سوونەتە، نەك لەبنا بیبڕیت.. ئەم ڕۆژانەش تەواو دەبێت و ئازاد دەبین.. خۆ کەری قازیـان نـەگاوە، خۆ ئێمە بە تەنیا ئازار ناچێژین، تۆ سەیری ئەو عارەبانە بکە، کە بە درێـژایی مێـژوو بـەداگیرکردنی خاك و وڵاتی ئەم و ئەو لە سایەی ئیسلامدا دەوڵەتیان بۆ خۆ دروسـت کـرد، دونیایـان داگـیر کـرد، کەچی ئەوەتا ئەوەکانیان وەك ئێمە بەدەست دەسەلاتەوە دەناڵێنن! ئەوەتا تۆ تەماشای تورك و..

من قسەکەی پێدەبڕم و دەڵێم: سەرە.. تۆیش سەیریت، ئەوە چییە وا خـەریکیت سـواری کـۆڵم دەبیت..

- دەی باشە با برێ لە بیرکردنـەوەکانی تـری خـۆت پێبڵـێم.. تـۆ ئەوەنـد بـیر لـە کەسـوکارت دەکەیتەوە، بیر لە خۆت ناکەیتەوە، دەبا ڕاستییەکی ترت پێبڵێم، وا دەزانیت ئـەوان لـە دووریـی تـۆ دونیایان لێ ئاخر دەبێت!! ئەوەش وا نییە، تۆش تیا بچوایەیت دونیا هـەر وەك ئێـستا دەبـوو، شـەو باخەڵەکان زووتر بۆ خزمەکانت دەرەخسا و ئاوەڵادەبوو، زووتر منداڵێك بـەناوی شـەهید سـەعیدەوە ناو دەنرا.. من پێمگوت: ئەوانەی تۆ باست کردن بیرم لێکردوونەتەوە، وەلێ بەئەو خستییە نا..

- ئا دەزانم بیر لەچی دەکەیتەوە.. دەتەوێت کـە لـە زینـدان دەرچـوویت، جـاسمی ئیـستخبارات بکوژیت، وانییـە؟ دە بەئـەو خوایـە، کـە هـەردووکمان باشـی ناناسـین، پێتناکوژرێـت، ئـەوە هـەر ختوورەیەکە و دەیکەیت، وامزانی زۆر ئاقڵیت دە بخەوە دەی.

دەتگوت سەرتیپ لەناو دڵ و مێشکمدایە.. ئاگام لە خۆم بڕابوو..

ئەو تێیخوڕیم: بەس سـوێڵت بقرتێنـە، کـەم بیجـووە، شـێت بـووم بەدەسـتەوە، هـەی فەریکـە مارکسی..

پاش کەمێك بێدەنگیی هاتمەوە سەر خۆم و وتم:

- توخوا سەرە، لەئەم قسە زەرد و سوورانە گەڕێ، خەریکیت لێمدەبیتە کۆمەڵناس و دەروونـزان و فەیلەسووف..

+ دەی باشە جەناب، تۆش کەم پیش بخۆرەوە، تا منیش سـەرودڵت نـەگرم. ئـەرێ تـۆ دەزانیـت هەردووکمان بەیەك زمان دەدوێین، کەچی لێکیش حاڵی نابین!! یان چاك لێکحاڵی دەبین و خۆمان گێل دەکەین! من وای بۆ دەچم، ئەم بنیادەمە نیو مرۆڤە و تەنیا لەئەو نیوەکەی تری خۆی حاڵیدەبێت، ئەو نیوەکەی تری تا دەمرێت چاوی بۆ دەگێڕێت و بەدوایدا وێڵە، کەچی نایدۆزێتەوە!! ئەگـەر دۆزیـشیەوە ئەوجا بەهەردووکیان یەك مرۆڤ پێکدەهێنن، جا بەر لەوەی بکەونە بیرکردنەوە لە (بوون)، یا دەمـرن یا هەڵدەکشێن بۆ ئاسمان، چونکە ئیتر دەبن بە خوا و لە زەویدا جێگایان نابێتەوە.. من وای بۆ دەچم،

ئەو دوو نیوە گریمان یەکیان دۆزییەوە ئەوسا دەبن بەیەك مرۆڤی کامڵ و دەگەن بە حەقیقەتی رەها و گورج دەمرن، ئاخر بەهەڵە لێمتێنەگەیت، من مەبەستم دوو نێری سمێڵ گەورەی وەکو من و تۆ نییــە! ئەو دوو کەسە یەکێکیان نێر و ئەوی تریان مێیە!!

من پێیدەڵێم: سەرە منجڕ لەئەم فەلسەفاندنە گەڕێ، وا دیارە تۆ بۆیە ژن ناهێنیت بــەدووی ئــەو کەرتەکەی خۆتدا دەگەڕێیت؟ خەوم نایە قسەیەکی خۆشم بۆ بکە..

+ دەزانم حــەزت لــە بەســەرهاتی ســۆفی خــاڵۆم و ژنەکانییــەتی.. دەباشــە گــوێبگرە و سمێــل مەقرتێنە..

ماوەی زیاتر لەمانگێك دەبوو نێوان خۆی و هەردوو ژنەکەی تەواو گۆم بوو. شەوانە کە دەچــووە سەر جێگا هەر بۆڵەی دەهات و دەینرکاند، سبەینانیش بەدەم لێوکرۆشتنەوە لەماڵ دەردەچــوو، رووی لە بازاڕ دەکرد. بەیانییەك روانیم ئاگر لە ناوچاوانی دەبارێت، بۆیە پێموت: سۆفی وەزعت باش نییــە، بیر لەچی دەکەیتەوە، پێمبێژە؟.

ئاخر چونکە تەمەنمان لەیەکەوە نزیك بوو وەکو هاوڕێ وا بووین و قسەی لێمنەدەشاردەوە.. ئــەو دەستی برد بۆ نووك لووتی و وتی: هاهاااااا گەیشتووەتە ئێرەم لێمگەڕێ..

سەری بەرەو زەویی شۆڕ کردەوە، کەمێك بە بێدەنگی لەو حاڵەدا مایەوە و پاشان سەری هــەڵبڕی و وتی: دەی باشە، ئەگەر نامەرد نیت و دەس لە قوونت نەدراوە قەیرە کــچێکی شارســتانی زۆرزان و عەیارم بۆ بدۆزەوە، قەیناکات با بێوەژنیش بێت، هەر رازیم، دەی بەزات و سیفەتی خوا لە داخی ئەو دوو خاڵۆژنە بێکەڵك و تەمەڵانەتدا، لەرکی ئەو دوو بزنە بێشیر و سارد و سڕانەدا دەبێت بیهێنم.. دە تۆ ژنێکی تەڕ و مەکربازم بۆ بدۆزەوە، شەرتبێ سێ و دووی لێنەکــەم و ئــەو خــانووەی لەســەر تــاپۆ بکەم.

- لەسەر منی تاپۆ دەکەیت؟

+ چەڵتەچەڵت هەی خوێڕی بەردلا.. وا دەزانیت گاڵتــە دەکــەم؟ خــوام لــەبیر چــووەتەوە هــەتیو نەعووزوبیلا.. ئەم دوو شــەیتانە خواشــیان لــەبیر بردوومەتــەوە، ئــەم دوو شــەیتانە دەمبەنــە ســەر گوناحێکی کەبیرەدا، هەڵپەیەکم بۆ بکە با دار بدەمە رۆحی ئەم جووتە قەڵتاخە شڕەدا..

خاڵۆم دوا بڕیاری خۆی دا و دەستی برد، چمکی راســتی کەواکــەی گــرت و دوو ســێ جــار تونــد رایتەکاند.. من دەمزانی مەسەلەکە چییە، سۆفی دەیەوێت شەوبێری نــەکات و هــەردوو ژنەکەیــشی بێزارن لە شەویاخەڵ و هەر بەیەکجاریی پشتیان تێکردووە، بۆیە وەکو جاران پێکەنینم بــە قــسەکانی نەهات و بەکپی لە شوێنەکەی خۆمدا راوەستام، گەیشتە بەر دەرگای حەوشە و هەڵگەڕایەوە: کــوڕە

سەرە لێمحاڵی بوویت؟ هەڵپەیەکم بۆبکە، بەلاّم بۆ تاپۆکردنی خانووەکە پەلەی لێمەکە دوایی دووبەدوو قسەی لێدەکەین..

کە بینیم داواکەی دووپات کردەوە زانیم پاشگەز نابێتەوە، چونکە سەبری لێبڕاوە و هیچ چارەیەکی تریشی نییە، وەلێ بۆ مەسەلەی تاپۆکردنی خانووەکە، ئەگەر خۆیشی نەیوتبایە ئەوا دەمزانی لەجیاتی بێوەژنێك (شازادە دایانا)یش شووی پێبکات، ئەوا ئەو هەڵەی وا ناکات.. ئاخر رۆژێك قایشی ئاشە مەکینەکە بڕا، سۆفی وەك ئەوەی کۆسی کەوتبێت ئاوا کێشای بە تەوقی سەری خۆیدا و هەزارجار لەسەر یەك بە ئاشەوانەکەی گوت: دەك داوەشێیت، دەك داڕزێیت پیاو، توخوا هێستر بە هێستری خۆی ئەو قایشەی پێدەبڕێت؟ (خۆ من ئەمبڕی کاکە سۆفی، مەکینەکە بڕیی)..
من نازانم تۆ گوناحباریت! هەر ئەو رۆژە خەمی نەقاڕکردنی بەرداشەکەی لێهاتبوو، بۆیە لێیپرسیم: ئەرێ برام کاکە سەرتیپ گیان، ئەوە بەرد هیچ هەر ئەبێت نەقاڕ بکرێت، بەلاّم تۆ خوێنەوار و ژیریت بیرێکی لێبکەرەوە، چۆن قایشێکمان دەستکەوێت وا بە ئاسانی نەبڕێت؟! ئەی بەردێك بە دەست ناکەوێت لەئەو بەرداشەی ئێستا سەخت و قایمتر بێت و درەنگ بسوێت؟!

ئاخر ئەو ئاوا بیری دەکردەوە، بۆیە دەمزانی مەسەلەی تاپۆکردنی خانووەکە هەر زەللەیەك بوو کردی و بە دەمیدا هات، بەلاّم بۆ ژن هێنانەکە لێبڕاوانە هەوڵی بۆ ئەدات، بۆیە کە پشتی هەڵکرد و لە ماڵ دەرچوو، هەردوو ژنەکەیم بانگکرد و پێموتن:

- ئاخر ئێوە بۆ بە دەستی خۆتان ماڵی خۆتان دەشێوێنن؟ بۆ لە گەڵیدا ناخەون و رازی ناکەن؟

ژنە بچکۆلەکەی کەمێك شەرمی لێدەکردم، بۆیە سەری داخست و هیچی نەوت، بەلاّم خاڵۆ ژنە گەورە رووی دەمی تێکردم و وتی:

+ کوڕم خۆ تۆ دەزانی ئەو غەزەوە هەر کە لە ماڵ دەرچوو، ئیتر ئێمەی بەدبەخت لەو ژوورەدا هەتا ئێوارە خەریکی بژارکردنی لۆکەین، کە شەویش داهات خۆمان بە قونەوە ناگرین.. ئاخر تۆ پێمنایەژی ئیتر چۆن رازی بکەین؟ کوڕم هەلاج چۆن رازی ئەکرێ؟ تۆ بیستووتە هەلاج تێر خواردنی بۆ بووبێت و دڵی داکەوێ؟! دەغڵی مەکە با بچێت ژن بێرێت، وەڵڵاّ پڕ وە دڵ پێمخۆشە.. بەس نییە ئیتر شەوانە بۆ خۆم تێر ئەخەوم، بچۆ بۆی بدۆزۆ کوڕم، بچۆ رۆڵە گیان بۆی بێرە!! بەلاّم ورياوە ژنێکی وە حەیا و وە حورمەتوێت و دوارۆژ ئاورووومان نەوات..

من چوومە ژوورەوە بۆ خۆڵەبەرکردن، ئەوان بەجووتە خۆیان کردە ژووری لۆکەکەدا، لە کاتی دەرچوونمدا گوێم هەڵخست مشتومڕیان بوو، گەورەکە بە دەنگێکی بەرز و بە تۆنێکی کەمێك تووڕەوە بە گچکەکەی دەوت:

- کەنیشکە خوا بتگریٚ خۆ تۆ نەزانی من وە بەرمۆ نەماوە و تاقـەتی باوەشـپیاکردن و زەرمـە زلێی شەوانەی ئەو گاورەم نییە، دایکەکەم داوەشیام وەدەسـیوە، خـوا وە گونـاح لیٚمنـەگریٚ مـن وە دایکی ئەو ئەژمێرێم.. باوکم لەوەولاچیٚ و گۆڕوە گۆڕویٚ، کە مارەمی لیٚبڕی، ئەم سۆفییە خوانەناسە ئەوەنە منالٚ بوو هەر ئێوارە خەوی پیانەکەوت و وە باوەش نەمبردە سەر جیٚ!! تا ئەو بالغ بـوو مـن پۆیم لیٚیسپی بوو، کە ئەویش بووە پیاو من پەکم کەوت.. دایکەکەم تۆ جوانیت و وە هیٚز و توانـای، ئێواران دەسیٚ بێرە خۆتا و قژەکەتی بۆ شانەکە و میلـچەوکێك بێـرە چـاوتا، کەنیـشکە شـیرینەکەم شەرتویٚ لەمەودوا هەر عەسر ئیزنت بدەم و لە جاتی تۆیش لۆکە بژار بکەم، مەعز بۆ خوا سۆفیم لـە کۆلٚ کەرۆ، کەنیشکە دوایی نەیکاتە راس و ژن تێریٚ.

ژنە گچکەکە وتی: حەی حەی بۆ خۆت خراو نایەژی، ئیٚمە وە هەردووکمانۆ زەلالەتمانە وەدەسیۆ، جا بیٚ لەمەولا تۆ ئەو دەنکە رووەیشی نەدەیتیٚ و منـیش خـۆمی بـۆ برازێنمـۆ، ئـیٚ وە خـوا هـەر ئەمپڕوکێنیٚ!! ئەو خورمایشی گەرەگە و میٚوژیش، چۆن رازیـی ئـەویٚ لۆکـە بـژار نەکـەم!! نایکـەم دایکەکەم نایکەم با بۆ خۆی بچیٚ ژن بێریٚ..

- کەنیشکە وە قسەم بکە و با ئەم مالەمان لێنەشێویٚ..

+ بووڕیٚتۆ دایکەکەم بووڕیٚتۆ.. بەخوا سویٚی بویٚتۆ پێنانیٚتە ناو جیٚکەم..

ئەم مقۆمقۆ و بۆلەبۆلە، لەمالدا چەند رۆژ و شەویٚکی خایاند و خالۆ سۆفی تا دەهات ئـالۆزتر و تووڕەتر دەبوو، تاوای لیٚهات جێگای نووستنی گواسـتەوە بـۆ ژووری میـوان و بـە تەنیـشت منـەوە دەنووست.. شەوانە تـا خـەوی لیٚدەکـەوت هـەر هەناسـەی هەلدەکیٚـشا و شـەیتانی رەجـم دەکـرد. ئێوارەیەکیان پاش بانگی عیشا گەڕایەوە مالٚ، روانیم لەتەوقی سەرییەوە تا کەلـە مووسـی پەنجـەی پیٚی لە تۆز و گەردی شیکراوەی لۆکەدا غەرقە، هەر دەتوت شمشێرە بەردیٚکی ئەو بناری سوورێنەیە و زوقمی شەو سایەقەی وەرزی زستانی بەسەردا باریوە.. گەیشتە ناوحەوشە، وەك شێرە بەفرینە چەقی، کە روانیم کەواکەی بەرەوپشت لەبەر کردووە و پشتوێنەکەی لەسەر بەستووە!! ئەوە دووهـەمین جـاری بوو بەئەو حالەوە بگەڕێتەوە مالٚ، بۆیە ئەمجارە وەك جاری پێشوو پیٚکەنینم نەهات، بـەلکو سەرسـام بووم و بەرەوڕووی چووم گوتم: خالۆ ئەوە خێرتە؟ بۆ خۆتت نەتەکاندووە؟ ئەی کەواکەت بۆ بەرەوپـشت لەبەر کردووە؟

- لیٚمگەریٚ "سەرە" لیٚمگەریٚ.. هیلاکم زۆر هیلاکم، ئاخر بۆ خۆم بتەکێنم ها بۆ کیٚ؟ ئـا بـڕۆ ئەو کراسەم بۆ بێرە.

هەتا من هەڵگەڕامەوە خاڵۆژنە گەورە کراسەکەی بۆ ڕاگرتبوو. ئەو لە دەستی ڕاتەکاند و پێیوت: لاچۆ بەدفەساڵی بێفەڕ لاچۆۆۆۆ.. بۆ خۆپۆشتەکردنەوەم چەنێ نازایت؟

لەبەر هەیوانەکەدا بەدەسەسڕە گەورەکەی سەروگوێلاکی خۆی تەکاند. پاتە لاستیکەکانی، کە پاژنەی بڕیبوو، سێ چوار کوونی تێکردبوو، لەجیاتی نەعل کردییە نووکی پایەوە، چووە بەر بەلووعەکە و دەسنوێژی گرت، گەڕایەوە و نوێژی عیشای دابەست و پاش سەلامدانەوەی بەسەر بەرماڵەکەوە دانیشت و دەستی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە، من لە نزا و پاڕانەوەکانی هیچ حاڵی نەبووم، چونکە لەژێر لێوەوە دەیوت و دەیگلماند، کە لێبووەوە، خاڵۆژنم پڕ قاپێك نانەگوشەی تەماتە و بامییەی لەبەر دەستدا دانا.. جا چۆن تەماتە و بامیەیەك؟ قاپێکی فافۆنی گەورەی دوو نەفەریی تا لێو نانی تێکوشرابوو، ناوێکی تەرنگ، هەربەحاڵ سووری دەکردەوە و دوو سێ بامییەی پیری درێژکۆڵەی وەکو مارمێلکی تۆپیوی بەسەرەوە بوو. سۆفی تەماشایەکی چێشتەکەی کرد و بەهێمنی بە ژنەی گوت:

\+ ئافرەت دانیشە..

\- بەلێ سۆفی..

\+ توخوا ئەمە تەماتە و بامیەیە یا چلکاو و ژێر دەستەی ماڵە دەوڵەمەنەکانی ئەم شارەیە؟

\- بۆ سۆفی چییەتی؟

\+ چییەتی؟ ئەی ئەبوو چوار پێنج بامییە و دوو سێ تەماتەی تری تیا هەڵفلیقێنی؟

\- ئەی تۆ دایم نایەژی بامییە و تەماتە گرانە و میوانیشمان زۆرە، با هەر ناوی تەماتە و بامییە بێ؟

\+ باشە خۆ ئەم ئێوارە میوانمان نەبوو.. کوێراییت داهاتبوو؟ دەبێت دایم وەك کەر پێتانەوە بژەنم؟ هاااا؟

لەئەم مشتومڕەدا ژنە وەك منداڵێکی سادە و دڵساف لەبەردەم پیاوەکەیدا دانیشتبوو، کاتێکم زانی سۆفی قاپە چێشتی هەڵگرت و کردی بەسەر ئەو ژنە بەدبەختەدا.. (دەبڕۆ لەجیاتی من تۆ بیخۆ و هەڵیقووڕێنە، ئەوا من تێرم خوارد).

ژنە سەری هەڵبڕی و وتی: دەك خوا خراوت بۆ بکا سۆفی وا خراوی بۆت کردووە!

خاڵۆژنە گەورە بە دەم سەروگوێلاك تەکاندنەوە دایە پرمەی گریان و بەرەو بەلووعەی ناوەکە چوو..

من دەمزانی هۆی ئالۆزبوون و هەڵچوونی ئەو پیاوە چییە و خراپی نێوانیان بۆ چی دەگەڕێتەوە؟ ئاساییکردنەوەشیان ئاسان نییە..

ئاخر ئەو بۆیە دووەمین ژنی هێنا تا لە شەڕەشەوی نێوان خۆی و ژنەگەورەکەی رزگاری بێت و بەشکوو ئەمە خوایە ژنی دووەمی کوڕێکی بۆبهێنێت و وجاخی رۆشن بکاتەوە، کەچیی عوزر لە قەباحەت خراپتر، ژنی دووەم نەك هەر نەزۆك بوو بەڵکو دژە" هینیش" دەرچوو!!!!



ژووری میوان کەوتبووە نێوان ژووری هەردوو ژنەکەیەوە، بۆ چەند شەوێکیش دەچوو سۆفی لەژووری میواندا، بە تەنیشت منەوە دەنووست. ئەو شەوە هەر پێچی خوارد و وەك رەشمار فیشکاندی..( سەرە لێبڕاوم و ئیتر قەرارمداوە ژن بهێنم، ژنێکی ئاقڵ و ژیر و بێکەس و بە حورمەت، تاقیمکردووەتەوە..) وایگوت و دواجار لێفەکەی لوول دا و خستییە ناو گەڵییەوە و خەو بردییەوە

بەیانی لەبۆڵەبۆڵیدا بەئاگا هاتم. گوێم لێبوو وەك ئەوەی ورێنە بکات ئاوا قسەکانی دەبڕسکاند و خنەخنی بوو، کاتێکم زانی راپەڕی و دەستی کرد بە شەیتان رەجمکردن و لەپەسا دەیوت: لاحەولە وەلا قەوەتە ئیلا بیلا.. من یەژم یا شەیتان ژنە یا ژن شەیتانە!! ئاخر ئێستە بەم سەرمایە... دەك نەعلەت لە شەیتان، لەژن، ئاخر چ دین و مەزهەبێك ئەمە قبوول دەکات پیاو دوو ژن بە ئارەقەی ئاوچاوانی خۆی بە خێو بکات و لەگەڵ شەیتاندا جووت بێت؟! خودا شوکرم بە بەشت ئەم دوو شەیتانە وا خەریکن لەئەم شارەدا سووك و ریسوام دەکەن!!

دوایی وەك منداڵ کرووشکەی کرد و سەری خستە نێو هەردوو لەپی، ئینجا چاوەکانی کەمێك هەڵکلوفت و هەڵسایە سەر پێ، پرتاو لەماڵ دەرچوو، تا ئێوارە نەهاتەوە.

سۆفی خالۆم ئەو رۆژانە تەنیا یەك خەمی هەبوو، بەلام خەمێکی قورس و تاڵ، ئەو وەك هەرزەکارێکی تازە باڵغی عاشقی بەسەردا هاتبوو، کە لە دوو دڵیدا دەژێت، منیش خەمی ئەو و هەردوو خالۆژنم بوو. ئەو رۆژانە بیرم لەئەو ئاژاوەیە دەکردەوە، کە نەمدەزانی چەندی تر دەخایەنێت و کەی و چۆن تەواو دەبێت؟ لەئەوەش گەشتبووم کە گرفتەکەی نێوان ئەم پیاوە و هەردوو ژنەکەی گەیشتووەتە بنبەست و هیچ چارەیەکی نییە، خالۆشم ژن هەر دەهێنێت، سێیەمین ژنهێنانی ئەوە بوو، کە شەوی پێشوو باسم بۆ کردی..

من ویستم شەوی سێیەمین ژنهێنانی خالۆی دووبارە بکاتەوە بۆم، بۆیە وتم: هیچم لەبیر نییە خۆ تۆ بە تەواویی بۆت نەگێڕامەوە.. ئەوە چۆن بوو؟ توخوا سەرە گیان دووبارەی بکەرەوە بۆم..

ئەو وتی: ئای چەندێ حەزت لەئەو قسە قۆڕانەیە.. کورە چووزانم، ژنە هەر بەدەم دەستییەوە ئەو شەوە هاواری دەکرد و دەیوت: دڕا سۆفی کوڕە دڕیت.. کوڕە ئاخر حەیام نەچێت.. بەیانی هەر چۆن بیدوورمەوە پێوە دیارە و فەرقی پێدەکەن! ئەی بەیانی ئاڵێن ئەم ملیوانی کراسەت بۆ دڕاوە؟ بڵێم چی؟ بڵێم زاوا سەری پیاداکردووە؟

(سۆفی کە دەچێتە ژوورەوە لەدامێنەوە کراسی بووکە هەڵئەداتەوە، خۆی پیادا ئەکات و لەملیوانی کراسەکەیەوە سەر دەردێنێ).. ژنە لێی دەپاڕێتەوە و دەڵێت: پەلە مەکە پیاوەکە پەلەمەکە.. ئەی نەدەکرا مووسێکت بەرێشدا بهێنایە؟ ئەم گشت تووکە وە کەڵك چی دێت؟ خۆ بەرناگریت..

سۆفی سەر دەردەهێنێت و ڕووبەڕووی ژنە دادەنیشێت، دەڕوانێت ئافرەتێکی بالآبەرزی سوور و سپی چاوڕەش و گەردن شووشەیی بەرانبەری دانیشتووە، بەسەرسامییەوە تەماشایەکی دەکات و پێیدەلێت: دەك سۆفی بە قوربانی ئەو پاو پووز و کەفەڵە بێت.. ئافرەت کێ دەڵێت تۆ بێوەژنیت؟!

(ئەی برا ڕۆ)ی عەلی دەزوولەی خەیاڵی پچڕاندم و هاتمەوە سەرخۆ. ڕوانیم زۆر داماوانە پاڵی داوەتە دیوارەکەوە، باوەشی کردۆتە هەردوو ئەژنۆیدا و سەری بەسەر سینەیدا شۆڕکردۆتەوە، کە دیققەتم دایە، کزە لە جەرگمەوە هات، بۆیە ڕووی دەمم لێکرد و پرسیم: عەلی ئەوە چیتە؟ برا هیچ کوێت دێشێ؟ بۆ وا بێزاریت؟

+ نازانم کاکە.. توخوا ئەمە کەی ژیانە؟ بەخودا مردن بە ئاوات دەخوازم، ئەی تۆ بیر لەچی دەکەیتەوە؟

من هیچم پێنەوترا، یان ڕاستتر بڵێم، بەئەو کوتوپڕییە هیچم بۆ نەهات تا بیڵێم، بۆیە کەمێك بێدەنگ بووم و پاشان بۆم دەرکەوت، کە کپییەکەی منی بە خراپ لێکداوەتەوە، ناهەقیشی نەبوو، چونکە من هەست و سۆزی ئەو مرۆڤە بێگوناهەم فەرامۆش کردبوو، خۆمم زۆر بەگەورەتر زانیبوو، بۆیە بەخۆدا چوومەوە و لە خۆمم پرسی: باشە ئەگەر ئەم گەنجە کەم ئەزموون و نەخوێندەوارە لە زمانی تۆ حاڵی نابێت، ئەی تۆ کە خۆت بە ڕۆشنبیر و قسەزان و مرۆڤدۆست دەزانی، ناتوانی کەمێك دابەزیتە ئاستی ئەو و بە زمانی مرۆڤێکی سادە و ساکار لە گەڵیدا بدوێیت و کەمێك دڵنەوایی بکەیت؟

لەئەم بەخۆداچوونەوە و ڕەخنەگرتنەمدا هاوڕێی خاوەن هەڵوێست و خۆشەویستی خۆم (تەلعەت خدر)م کەوتەوەبیر، کە لەڕێکخستنە نهێنییەکانی ناو شاردا کارمان دەکرد و لەپڕێکدا هێڵەکەمان ئاشکرابوو.. ئەو کە یەکێك بوو لەئەو ئەندامە چالاکانەی کە دەسگیرکرا و لەزیندانی (هەینەی

کەرکوك)دا چاوەڕێی سزای قورسی بوو، کەچی منی لەیاد نەچوویبووەوە و بە (مامۆستا هۆشمەند هەورامی) زیندانی ئازادبوودا سلاوی بۆ ناردم و دڵنیای کردمەوە لەوەی کە لەژێر ئازار و ئەشکەنجەدا ددانی بە تاواندا نەناوە و گوتبووی: لەخۆم نەترسم، ئاخر ئەو کوڕە مەردە لەبارێکی نالەباردا و لەشوێنێکی تۆقێنەری وەك هەینەی کەرکوکدا، ئەو ڕۆژە سەختانەی بەسەر دەبرد، کەچی خەمی خۆی لەبیر کردبوو منی لەیاد نەکردبوو! ئەی باشە من بۆ ئەوەندە خۆپەرستبم؟ بۆ هەر هیچ نەبێت ناتوانم کەمێك دڵنەوایی ئەم کوڕە بکەم؟ بۆیە ڕووی دەمم تێکرد و گوتم:

- عەلی برا وا تێنەگەیت بێدەنگییەکەم بیرکردنەوە بێت لەچارەنووسی خراپ.. نەخەیر بروا بکە وانییە و بیر لەشتی خراپ هەرگیز ناکەمەوە..

ئەو گوتی: ئەی؟

من درێژەم بەقسەکەم دا و گوتم، بەخەیاڵ لەگەڵ سەرتیپ- دا بووم و قسەخۆشەکانی زیندانی باقوبەم دەکەوێتەوە بیر، ئەزانیت بۆ؟ تا پاش ئازادبوونمان لە زیندان یادداشتیان بکەم و بیاننووسمەوە.. ئەی شێتە من و تۆ برای یەك نین؟ ئەوە نییە ناوی باوکی هەردووکمان (حەمە فەرەج)ە؟

ئەوەش بزانە ئەم ڕۆژە سەخت و ناخۆشەش تەواو دەبێت و بەم زووانە ئازاد دەکرێین، ئەوسا بە جووتە عەسران دەچینە سەر ئاوی سیروان و پێکەوە دەخۆینەوە، پێك لەدوای پێك ئارەق هەڵدەدەین و وەکو یادگاریی ئەم ڕۆژانە دەگێڕینەوە.. جا کە مەست دەبیت باسی دەنکەکەتم بۆ دەکەیت، وا نییە هاااا؟ بۆم دەگێڕیتەوە چۆن و کەی دەگەنە یەك؟ چۆن باوەشی پیادا دەکەیت و ماچی دەکەیت؟ عەلی ئەوەی کە لەنامێزی دەگریت پێیدەڵێت بەقوربانت بم؟ دەك بەساقەت بم، ها وای پێدەڵێت؟

عەلی ئەژنۆکانی کە نووسابوون بەسینگییەوە لێکی کردنەوە و چوار مشقی دانیشت، هەر چۆن بنجێك ڕەشەرەیحانە لە تینوا سیس بوویێتەوە و گەڵاکانی بەرەو زەوی شۆڕبوویێتنەوە، تۆ بچیت سەتڵێك ئاوی سارد بکەیتە بنی و پاش تاوێك گەش بێتەوە، عەلی ئاوا گەشایەوە و چاوەڕەش و گەورەکانی کە دەتگوت دووچاوی شەهێنێکی ئاشقەراون تیشکیان دایەوە و لەناو کالانەکانیدا چەند جارێك بازنەی سووڕانەوە و، هەردوو گۆنای وردەوردە تەرپیان تێزا، پاشان زەردەخەنەیەکی شیرینی کرد و گوتی: پێش هەموو شتێك بەقووربانی ئەو قسە شیرینانەت بم کاکە گیان خۆ خەرێك بوو دڵم شەقی دەبرد، ئەوسا ماڵی باوکی سەرەم گرتەقوڕ، خوا دەکا ئازاد دەبین شەرتبێ داوەتێکی پاشایانەت بکەم و گون و گورچیلەی سێ ڕۆژ دووکانی قەسابییەکەمت بۆ بکەمە مەززە!! ئەو

گۆشتەش کە رۆژانە دەمدایە دەرخواردی ئەو ئیستخباراتە سەگبابە تا نەمداتە دەستەوە، ئیتر ئەبێ لەوسی لێنەدات و بۆتۆی دابنێم..

+ تۆ لە گون و گورچیلە گەڕێ، با پرسیارێکی ترت لێبکەم، بەلاّم شەرم مەکە و راستم وەلاّم بدەرەوە، بیری دایکت زۆر دەکەیت یا بیری دەنکەکەت؟

- راستت دەوێت بەزەیم بە دایکمدا دێتەوە.. ئاخر دایك گوناحە، بەلاّم کە بیر لە ئەو دەکەمەوە هەر وەختە گرێکرم.. کاکە تۆ بێژیت جارێکی تر چاوم پێیبکەوێتەوە؟

عەلی هۆشی هاتەوە بەر، بەلاّم ترازاندنی قفڵی دەرگای ژوورەکە و تێخوڕینی کوتوپڕی سەربازێك، کە گوتی: هێی هەتیوەکان.. (کاکە)کان گورجکەن ئامادەبن دەی.. قسەی پێبڕین، هەردووکمان بە جووتە گورج بووینەوە و فەرمانمان بەجێگەیاند..

هەڵسانە سەر پێ و خۆمان پێچایەوە. سەربازێکی ئەسمەر و فرە تۆخی لێو ئەستوری ددان شاش و واش دەرگاکەی کردەوە و داوای یەکی پێنج دیناری لێکردین! من یەکسەر دەستم کردە باخەڵمدا و دە دینارم دا بەدەستییەوە و بە بێقۆڵبەسکردن دامانییە پێش خۆی لەوێ، بەچکە کۆستەرێك راگیرابوو، سواری کردین. من چپاندمە گوێی عەلیدا: ئەم دەس نەبەستنەوە و ئۆتۆمبیلە ئەهلییە مانای چاك دەگەیەنێت.. ئەویش بەسەرلەقاندن بۆی سەلماندم.

ئۆتۆمبێلەکە سەر بەرەو خوار ملی رێگای گرت و شۆفێرەکە پێی لێداگرت. هەر وەکو ئەوەی بەخوایشتی خۆمان سەفەر بکەین ئاوا سوار بووین و بەبێترس لەدەشت و دەرمان دەڕوانی. دەشتێکی کرکای کرك خۆڵ و پووشەکەی بەدەم تینی هەتاوەکەوە هەر ئەوەندەی مابوو گڕ بگرێت و قرچەقرچیم دەبیست. لەناو ئەو ئۆتۆمبێلەدا تاچاو بڕ بکات تراویلکە بوو وەکو دەریا شەپۆلی ئەدا، جارجارێك لەئەمبەر و ئەوبەری جادەقیرەکەوە باخی میوەجات و دارخورما دەبینرا، دەماندایە لای ژنە عارەبی پێست مێوژیی چاوڕەش و دەم و لووت هەڵپێکراو و پیاوی دشداشە لەبەر و عەگاڵ لەسەر لەپشت پیکابی فەلاحییەوە دانیشتبوون، کە دەماندا بەلایاندا ئەوان تێیاندەڕوانین و ئیرەییان پێدەبردین..

لەئەم سەفەرەماندا پیچەوانەی جارانی تر، کە دەگوازرراینەوە هەستم بەمەترسی نەدەکرد و لەو باوەڕەدا بووم ئەو شوێنە بۆی دەچین دوا قۆناغە و لەوێوە چارەنووسمان دیاری دەکرێت. ئەو شوێنەش نزیکە، بە کەمتر لەکاتژمێرێك گەیشتینە سەربازگەیەك. ئۆتۆمبیلەکە لایدا و خۆی پێداکرد، بەناو ریزە خانوو و چەند قاوشێکدا تێپەڕی و لەپێش دەرگای ژوورێکدا راوەستا. مەئمورەکە دابەزی و زۆری پێنەچوو عەریفێك هاتە دەرەوە و داینەپێش خۆی. ئەم کابرایە ئەوەندە رووخۆش بوو زاتم کرد ناوی سەربازگەکەی لێبپرسم، ئەو وتی: أمن فیلق منصوریه الجبل!!

کە ئەو ناوە ترسناکەم بیست راچڵەکیم.. ئاخر ئەمنی فەیلەق، بۆ؟ ئەم یەکە سەربازییە لەچاو گەورەییەکەیدا بەندیخانەیەکی گچکە دەهاتە بەرچاو. کە پێمان نایە ناو حەوشەکە، یاوەرەکەمان لەدوورەوە بانگی (سەجان)ەکەی کرد و وتی: خەڵەف.. (پاشان دەستی بۆلای ئێمە راکێشا و بێنەوەی شتێك بڵێت خۆی گەرایە دواوە).

خەڵەف لە سێبەری دیواری بەندیخانەکەدا بەسەر قوسعەیەکەوە دانیشتبوو، هیچ خۆی تێك نەدا و بە لەپ خەریکی ماشینەوەی برنج و شلە تێکەڵەکەی بەردەمی بوو، کە لێبووەوە بە لێواری قوسعەکە ناو لەپی پاککردەوە، دواییش چاك بە زمان لستیەوە و لە پەنجە کەڵەیەوە تا تووتەی یەك لەدوای یەك، کردنی بەدەمیدا و مژینی، دۆلکە ئاوەکەی نا بە سەرییەوە، زیاد لەنیوەی لێخواردەوە و بەئەو نیوەکەی تری دەستی پشیلەشۆرکرد و لێمان نزیك بووەوە و مرێکی خواردەوە.

خەلەف، کورتە بنەیەکی پێست بۆری روومەت خڕ و ورگن بوو. قۆلی کراسە خاکییەکەی تا ئانیشکی هەڵکردبوو، وێنەی دووپشکێکی چزوو هەڵگەراوەی بۆ سەر پشت بەسەر نەرمی مەچەکی راستییەوە نەخشاندبوو، جووتە سمێڵە رەشەکەشی لە وێنەی نیوکەوان بەئەملا و ئەولای گۆنایدا شۆڕکردبووەوە.. بە چاوە جرج ئاساکانی کە دەتوت ترازوون و خێر و شەڕ دابەش دەکەن قیروقاج لێیدەڕوانین..

خەڵەف یەك دوو هەنگاوێك نزیك کەوتەوە، وەکو حەی حەی بکات ئاوا سۆندە رەشەکەی دەستی چەند جارێك راوەشاند و لابەلا وەك کەڵەشێرێکی شەڕانی چۆن باڵێکی بۆ زەوی شۆڕدەکاتەوە و شەڕ بە کەڵەشێرێکی تر دەفرۆشێت، ئاوا بازنەیی سووڕێکی بە دەورمدا خوارد و لە نووکی پەنجەی پێمەوە، تا تەوقی سەرمی بە چاو بێژا، بە هێمای بێزلێهاتنەوە، لووتی قرج کردەوە، لچی هەڵقرچاند و پیشی خواردەوە، من وێنەی خۆمم هێنایەوە پێش چاوم، ئەگەرچی ریشم هاتبوو، وەلێ خۆم ئەوەندە بە ناشیرین نەدەهاتە پێش چاو. قاتێك رانەك و چۆخەی نوێ و خاوێنم لەبەردا بوو، جووتێك کلاشی هەورامیشم چەککردبوو، کە لەوانەیە خەڵەف لەهەموو ژیانیدا پێڵاوی لەئەو شێوەیەی نەدیبێت.. وادیار بوو ئەوەی ئەو دڵی پێهەڵدەشێوا تەنیا کوردبوونم بوو!! بەدەم تەماشاکردنێکی تری دوژمنانەوە، وتی: تا ئێستا چەند سەربازت کوشتووە، وا ئەمڕۆ خۆت بەدەستەوە داوە؟

من لە دڵی خۆمدا وتم، جا توخوا ئەمە پرسیارە؟

لەئەو چرکە ساتەدا وەك بروسکە گەلەگورگەکەی بارق و لەخوێندا گەوزینی کەریمی برام هاتەوە بەرچاو، موچڕکێك لە تەوقی سەرمەوە هات و لە کەڵەمووسی پەنجەی پێمەوە دەرچوو، کە وەڵامی نەبیست لە کەللەی سەر قیڕاندی: هەتیو بۆ وەڵام نادەیتەوە؟

من وتم: تەنیا نەچوومەتە سەربازیی و دەسگیر کراوم..

دەرگای بەندیخانەکەی کردەوە و عەلی چووە ژوورەوە. منیش بەدوایدا پێم نایە ناو دەرگاکە و شلپە لەگازەرەی پشتمەوە هەلسا.. لابەلا لەسەر شانی راستمەوە تا کەمەری لای چەپمی گرتەوە. وا دیاربوو یەکەم دەسوەشاندنی تەسکینی دلی نەدابوو، بۆیە مشتێکی بەهێزیشی سرەواندە بناگوێمدا، بەلام چونکە من خۆم بۆ دووەم دەس لێوەشاندن ئامادەکردبوو، هەستم بە ئازاری زۆر نەکرد، لەگەل دووهەم دەسوەشاندنیدا وتی: کوڕی سەگ، بچۆ لەئەو ژوورەدا بگەنێ..

کە چوومە ژوورەوە هەستم بە دڵ گوشینێکی بە تەوەژم کرد، دوایی هێلنجم هات و پێش چاوم تاریک بوو. گورج پێخەفەکەم، کە بەدەستەوە بوو، فرێدایە سەر زەوییەکە و پالمدایە دیواری رێڕەوەکەوە..

عەلی بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی: کاکە وابزانم خراپی لێدایت؟

بەرچاوم تەمێکی خەست گرتبووی و سەرم گێژی دەخوارد، بۆیە هەر لەئەو شوێنەدا دانیشتم و هەردوو لەپم خستە سەر چاوم.. قەدەرێك بەئەو شێوەیە مامەوە، کە چاوم هەلبڕی، روانیم عەلی چاوەکانی پڕبووە لەفرمێسك و جگەرەیەکی داگیرساوی بە دەستەوەیە، بۆی راکێشام، جگەرەکەم لێوەرگرت و دووسێ مژم لێدا، بەلام مژ نەك گالتە، ئاگام لێبوو، ئاگری جگەرەکە وەك پشکۆی خەلوزی مەقالەی کەبابچییەکان گەش دەبێتەوە و چۆن چەوری شیشە کەبابەکان دەکەوێتە سەر ئاگرەکە و قرچەقرچ و دووکەلی لێبەرز دەبێتەوە، ئاوا ئاگری جگەرەکە قرچەی دەهات و هەناوی منیش چزەی لێهەلدەستا.. نازانم چەن مژم لە جگەرەکە دا، ئاگر گەیشتە سەر فلتەرەکە و کوژایەوە..

دیسان سەرم خستەوە ناو لەپم و توند گوشیم، لەئەو کاتەدا بیرم لەوەکردەوە هەلسمە سەر پێ و بە هەموو هێز و توانای خۆم سەر بکێشمە دیوارەکەدا و مێشکم بپژێنم، بەلام ئەو هێزەم شك نەبرد، بۆیە هەر بە دانیشتنەوە چەندجارێك پشت سەرم کێشایە دیوارەکەدا و کەمێك ئاقاقەم بۆ هات.. پاشان سەرم خستە سەر پێخەفەکەم و بەوڕوکاسیی گرمۆلە بووم، هەروەك ئەوەی لەخەودابم و خەو ببینم هەلسامە سەر پێ، بەلام زەلامێکی تر بووم، نەك پیاوە کەساسەکەی چەند ساتێك بەر لەئێستا، کە لە خۆمم روانی بینیم، بالام سێ جار بەقەد بالای خەلەف بەرزە..

بەرەو لای دەرگای زیندانەکە چووم، بە هەردوو دەستم شیشی سەر دەرگاکەم گرت و بە راست و چەپدا رامکێشان و لێکمترازاندن، دەستم درێژکرد قفلە گەورەکەم وا راتەکاند یەکسەر بەدەم دەستمەوە هات و دەرگاکەم والاکرد، بەلام دەفەی شان و سینگ و بەرۆکم ئەوەندە پانوپۆڕ بوون، دەرگاکە

نەیکێشام، بۆیە لەسەرلا دەرچوومە دەرەوە، کە خەڵەف چاوی پێمکەوت وەختبوو زارەتــرەك ببێــت، ئەو ئەوەندە گەنەڵە و کورتەبنە بوو سەری بە ئاستەم دەگەیشتە ئەژنۆم، روانیم قژی بە سەرەوە نییــە، بۆیە دەستم، کە بەقەد دەمی تیمساحێك دەبوو، برد و بۆقەتەی ملیم گرت، بە بەرزی بالآی خۆی پێم لەزەوی بڕی و تا هێز لە دەست و مەچەکمدا هەبوو، هەڵمبڕیی و کێشام بە دیوارەکەدا، مــن ئەوەنــدە رق و داخ لەدڵ بووم نەمزانی ئەو هەر زوو بەدەم دەستمەوە گیانی دەرچووە، ملم نــا بــەرەو دەرگــای سەرەکی حەوشەکە، جبەخانەکە لەپێــشمدابوو هەڵمکوتایــە ســەر پاســەوانەکان، لەچاوتروکانێکدا قۆڵبەستم کردن و خۆم کرد بــەژووردا، بــە بــیێ خۆخــەریککردن نــەویم لەدۆشــکەیەك و ســووك وەك کلاشینکۆفێکی پەڕەشووت بەدەستمەوە هات و دەرچوومەدەرەوە.. پێش هەموو شــت دەوروبــەری خۆم ئەوجا کەوتمە گوللە بارانکردنی سەربازگەکە، بە گوللەگڕ و سوتێنەری دۆشکە یەك لەدوای یــەك گڕم بەردایە سەرتاپای سەربازگەکە و بڵێسەی ئاگر و دووکەڵ رووی ئاسمانی داپۆشــی.. زیندانییــەکان دەرگایان لە کولۆم هەڵتەکاند و بەدوومدا هاتن. سەربازە بێزارەکانیش بە چەپڵەلێدان و دروشم وتنەوە لێمگرد بوونەوە، دەمدیت لەناو قرچەقرچی ئاگر و دووکەڵدا هەروا دەرەجەدار و ئەفسەرە پلەبــەرزەکان بوون بە پێی پەتی و سەری رووتەوە، بەرەو خوار هەڵدەهاتن. من کە لەجێ خۆمدا چەقی بووم هەستم کرد دووکەڵەکە پەنگی خواردەوە و بەرەو رووم هات.. لە بۆنی بۆکرووز و بۆسۆدا گێــژ بــووم و کۆخــە گرتمی.. لەسەر ئەوەش بەســەرکەوتنی خــۆم و هــەلاتنی ئەفــسەرە دڕنــدە و ترســنۆکەکان پێکــەنینم دەهات، پێکەنیم، بە دەنگی بەرز پێکەنیم، بەلآم سەرەڕای ئــەو ســەرکەوتنەش تــا دەهــات گێــژ و تەنگەنەفەس دەبووم.

کە بەئاگا هاتمەوە روانیم سەرم بە بان پێخەفەکەمەوە خواربووەتەوە و هەر لە ڕێڕەوەکــەدا گرمۆڵــە بوومە.. عەلیش بەسەر سەرمەوە کروشکەی کردووە، چاوم هــەڵبڕیی عــەلی پێیــوتم: کاکــە بەچــی پێدەکەنیت؟

هیچ کاکە هەڵسە پێخەوەکەت هەڵبگرە با بچینە پێشەوە..

بەلای راستدا شەش حەوت هەنگاوێك ڕۆیشتین. ڕێڕەوەکە بەلای چەپدا دەسووڕایەوە، دوو ســێ هەنگاوێکی تر، ئەوێ دەرگای ژوورێکی کــراوەی گــەورە بــوو، نووکــە پێیــەکم تێژەنــد و کرایــەوە، ژوورەکە لاکێشەییەکی پەنجا مەتر دووجا دەبوو، چەند بەندییەکی نیوە رووت لالۆپــاڵ لێیکــەوتبوون، هەردوو دەستە پێخەفەکــەمان بــە تەنیــشت یەکــەوە راخــست، دەرگــای سەرشــۆرکەکە کرابــووەوە، دەستوبرد و بێ خۆخەریککردن خۆم کرد بەژووردا.. تینی هەتاو لە تاوســانی ئــەو دەشــتە قرفەیــەدا ئاوەکەی کولآندبوو، تاقەتی مەلێکردنم نەبوو، تــەنیا ئــاوێکم کــردە ســەرمدا و لاق و گۆرەوییــەکانم

ششت و گەرامەوە شوێنەکەی خۆم و راکشام.. ئەو ... ... رێوی و تێهەڵدان و خەیاڵە دۆنکیشۆتانەی کە چەند چرکەیەك پێش ئێستا تیادا ژیام هەموویم وەك ... م هاتەوە یاد. هەستم کرد کەللەسەرم تەواو قورسە و وژەی دێت. دەتوت کتریەکی پڕئاوە و بەسەر پریمزێکی نەوتییەوەیە و دەکوڵێت.. کۆشام چاو لێکبنێم و بنوم، بەلام بیسوود بوو.. هۆشم گلێر کردەوە و گەرامە دواوە. لە زیندانە گچکەکەی جەلەولاوە پیادا هاتم، تا گەیشتمە حەوشەی ئەم زیندانە، شتەکان، جگە لەناوی (أمن فیلق) کە رایچەڵەکاندم، هەموو ئاسایی بوون و چاوەڕوانی نافاقەیەکم دەکرد، بەلام دڕندەییەکەی خەلەف گەشبینییەکەی لەلا تەلخ و تارێك کردم و ریسەکەی لێکردمەوە بە خوری. ئەوەش کە لام بوو بەپرسیار، ئەو رستەیە بوو، کە خەڵەف پێیگوتم: بڕۆ لەنەو ژوورەدا بگەنێ! کەوابوو ئێرە دوامەنزڵمە و لێرە دەکەنیم.. یان دەبێت چاوەڕوانی موعجیزەیەك بم تا رزگارم بکات.

جەستەم ماندوو و مێشکم هیلاکە و هیچی ترم بۆ لێکنادرێتەوە، بۆیە کورد واتەنی: دامە تان بیحەیاییدا و بە خۆم وت: لێیگەڕێ خۆی هەرزان دەبێت..



شەو دادێت و هەروا بەندییە و دەخزێنرێتە ژوورەوە. درەنگێك بۆم دەرکەوت هەموو بەندییەکان سەربازی هەڵهاتوون و ئێرە قۆناغی پشوودان و دابەشکردنەوەیانە بەسەر یەکە سەربازییەکانیاندا. زیاد لە هەفتەیەکی پێچوو ئەوەی لێینەدەپێچرایەوە تەنیا من و عەلی بووین، کە خەریکبوو بۆنی کەنیوی پۆستاڵ و پێ و پێلاو دەیخنکاندین، بەلام ئەوانی تر مەگەر رێکەوتی رۆژی هەینی بکردایە، ئەگینا تەنیا یەك شەو دەمانەوە و دەگوازرانەوە.

پاش چەند شەوێك، کە گەیشتینە ئەو بەندیخانەیە، دەرگایەکی بچووك لەناو ژوورەکەی ئێمەدا سەرنجی راکێشام. ئەو چەند جارەی کە دەکرایەوە، کوڕە لاوێکی ئەسمەری رووخۆش و پاك و پووختە سەری دەردەهێنا و لێیدەڕوانین، دیاربوو هەستی بەئەوە کردبوو، کە ئێمە ئیتر میوان نین و بووینەتە خانەخوێ..

رۆژێك عەلی وتی: ئەو دەرگایە دەرگای ژوورێکی ترە و سەر بەم بەندیخانەیە، ئەو کوڕە کە بازەجارێك سەر دەردەهێنێت، بەندییە و تەنها خۆی تیادایە، ئەمڕۆ بەعارەبییە شڕوشەقەکەی خۆم قسەم لەگەڵدا کرد و رووم لێنا تا لای خۆی جێگامان بکاتەوە، ئەگەر دەنگی نەبوو دووبارە رووی نێدەنێمەوە، ئاخر گەر وا بڕوات لەئەم ژوورە پیسەدا دەگەنێین.

بۆ سبەی بەندییەکە بەڕووخۆشییەوە داتە لامان و گواستمانییەوە ژوورەکەی خۆی. ئەوێ ژوورێکی ئەوەندە پاك و پووختە بوو، هەر دەتگوت ژووری ئۆتێلێکە، کە فەرمانبەرە نیفادکراوەکان

لە شاردا رووی تێدەکەن. دیمەنی ناوەوە سەرنجی راکێشام، ژوورەوە چراخانێك بوو بۆ خۆی. دیوارەکانی بە نایلۆنی گوڵدار داپۆشراو، شەوقیان دەدایەوە، لە ژوور سەرمانەوە و لە بەرانبەریشەوە چلاکی جل بەداراکردن داکوترابوو، ژوورێکی بچکۆلەش لە سووچی لای چەپەوە کرابوو بە سەرشۆرك و ناودەست. پاش کەمێك رامان و بیر کردنەوە، لە ژوور و خاوەن ژوور، خۆم کرد بە سەرشۆرکەکەدا، روانیم سەرشۆرکێکی تەواو خاوێنە و بۆنی سابوونی بۆندار و دیتۆڵی لێنیشتووە.

بۆ یەکەمین جاربوو لەماوەی نزیکەی چوار مانگ زیندانیمدا، هەستم کرد لەشوێنێکدام کەمێك لە مەسکەنی زیندانییەکی خاوەن ماف دەچێت!! بۆیە ژوور و خاوەن ژوور بوون بە جێگای پرسیار..

سەبارەت بە ئەم بەندییە بڕیارمدا بە وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەم، کە من لە سەرشۆرکەکە گەڕامەوە، عەلی خۆی کرد بە ژووردا و وەك مراوییەکی کێوی لەناو دابڕاو، چۆن بە ڕێکەوت تووشی گۆماوێك دێت و بێپەروا خۆی تێهەڵدەژەنێت، ئاوا دەستی کرد بە شڵپ و هوڕ و جلشۆردن.

کوڕە ئەسمەری عارەبیش هەر ناوی عەلی بوو. پاش چەند رۆژێك من بەهێمنی و کەمدوویی مامەوە و گوزەراندم، تا لە دەرفەتێکدا هۆی زیندانیکردن و کار و پیشەیم لێپرسی. ئێستا بۆم ئاشکرا بوو، کە ئەو خەڵکی شاری (بەسرا)یە و دەرچووی کۆلیژی کشتوکاڵە. پاش تەواوکردنی خوێندن کراوەتە ئەفسەری یەدەك و رەوانەی ئەم یەکە سەربازییە واتا (لە ئەمنی فەیلەقی مەنسوورییەی جەبەل) کراوە، ئیتر بەدڵخۆشییەوە، مادام بۆ بەرەی شەڕ نابردرێت، رووی تێدەکات، پاش بەسەربردنی چەند مانگێك رۆژ لەدوای رۆژ چۆن مۆرانە لەپیرەدار وەردەبێت و دەیخوات، ئاوا بێزاریی و پەشیمانیی کنە لە رۆحی دەکات و رۆژانی مۆڵەتیش، کە دەچێتەوە بۆ شارە جوانەکەی خۆی لێیتاڵ دەبێت، بۆیە چەند جارێك هەڵدێت و پاش حەسانەوە و پشوودانێکی باش سوود لەدەرفەتی لێبووردن وەردەگرێت و خۆی ئەدات بەدەستەوە، لە دواهەڵهاتنیدا مانگێك بەسەر دەبات، تا رۆژێك بەسەرخۆشی بە لێواری کۆڕنیشی شارەوە دەسگیر دەکرێت و دەخزێندرێتە زیندانەوە. ئەم کوڕە عارەبە هەر بەناو زیندان بوو، چونکە بە قسەی خۆی هاوڕێ ئەفسەرەکانی خۆشیان دەویست و ڕێزیان لێدەنا، بۆیە وەك بەندیی لێیان نەدەپێچایەوە. ئەم ژوورەش کە شەوانە لێیدەنوێت، تایبەت بە زیندانییەکانی سەر بەئەو یەکە سەربازییە.

وتم هەر بەناو زیندان بوو، شەو و رۆژ، هەر کاتێك حەزی لێبوایە، بە ئازادیی و بێئەوەی کەس لێیبپێچێتەوە بۆ تەماشاکردنی تەلەفزیۆن و کڕینی پێداویستییەکانی خۆی دەچووە حانووت. ئەو، گەرچی بە رواڵەت کوڕێکی هێمن و سەنگین و رووخۆش بوو، بەڵام جارناجارێك ڕەش دادەگەڕا و بەگرژ و مۆنی بەناو ژوورەکەدا دەهات و لەناکاودا وەك شێت رادەوەستا و لەسەر یەك هەزار جوێنی بە ئەرز و ئاسمان دەدا

و جانتا و سەرینەکەی خۆی دەدایە بەر شەق. جارێکیا بەر لەهێوربوونەوەی، وتی: ئەم گەوادە، ئەم باوك خۆنەناسە چی پێکردین؟!

من لێم پرسی مەبەستت لە کێیە؟ ئەو جوێنانە بە کێ ئەدەیت؟

- نازانیت لەگەڵ کێمە؟ لەگەڵ باوکی خۆمە، باوکم. ئێستا حاڵی بوویت لێم؟! باوکم، ژیانی لە گەواد و قەحپەکانی (عەفەج)یش تێکدا، ئەوەتا ئەو گەوادە دڵگەورە و شەریفانەش کە زۆرجار بێبەرانبەر لە باوەشی کچ و ژنەکانیاندا دەنووستین و رامانده‌بوارد، دەیانگرێت و دەیاننێرێتە بەرەی شەڕ، ئەو دەڵێت: کاولی- یش هاووڵاتی شەریفن و نیشتیمانپەروەرن، ئەوان پیاون و وڵاتی خۆیان خۆشدەوێت، بۆیە ئێستە ئامادەن لە نیشتمانەکەیان بەرگریی بکەن!!

ماوەی زیاد لە چل رۆژم لەئەو بەندیخانەیەدا بەسەر برد و کەسوکارم هەواڵیان نەدەزانیم. رۆژێك لەناو کۆمەڵێك زیندانیدا، ناسیاوێکی خۆمم بەرچاو کەوت و داوام لێکرد ئەگەر بۆی رەخسا هەواڵم بگەیەنێتە کەسوکارم، هەر ئەو رۆژانە بوو کەمەکەمە خۆم بە (عەلی عارەب) ناساند، چونکە بۆم دەرکەوت کوڕێکی هەست ناسك و مرۆڤدۆست و راستگۆیە. ئەو رۆژە کە باسی چۆنییەتی دەسگیرکردنی خۆمم و لیقەومانەکەم بۆ گێڕایەوە، هەموو لەشی کردبوو بە گوێ و چاکی دەبیستم، کە لێبوومەوە وەك تۆ غافڵگیرت کردبێت و کوتەکێکت کێشابێتە پشت سەریدا، ئاوا وڕوکاس بوو، چاوە رەشەکانی فرمێسکیان تێزا و سەری هاتە ئێش، پاشان ماوەیەکی باش خۆی دایە زەویدا و هیچی نەوت.

## (١٤)

رۆژانی هەینی دەرگای بەندیخانەکەیان لێدەکردینەوە و دەریاندەکردینە حەوشە گەورەکەوە، تا خۆمان بدەینە بەر خۆر. ئەفسەرە ئێشکگرەکانیش کە دەهاتن تەنیا چاویکیان دەگێرا بەناوماندا و دەگەڕانەوە. ئەو شەوە عەلی، کە لە حانووتی یەکە سەربازییەکە گەڕایەوە پێیوتم: سبەی هەینییە، ئەفسەرێکی پیری یەك ئەستێرە ئێشکگرە، ئەم کابرایە پیاوێکی زۆر کەللەشەق و رەوشت نزمی دەمپیس و نەخوێندەوارە، سبەی کە دەردەکرێینە ناو حەوشە ئەو دێت بۆ پشکنین، یان راستتر بڵێم دێت بۆ ساتێك رابواردن! تۆ ریشت پاك بتاشە، بەلام خۆت بە خاو و خلیچکی نیشان بدە و سەری خۆت کزکە، ئەو جلە کوردییەش لەبەر مەکە، من قاتێك جلی سەربازیت بۆ پەیدا دەکەم! با ئەوەشت پێبڵێم، ئەگەر هەواڵی پلەی خوێندنی لێتپرسی نەڵێیت خوێندنم تەواکردووە، چونکە ئەو کابرایە زۆر رقی لە کوردی خوێندەوار دەبێتەوە!! ئەمە کابرایەکی داخلەدڵ و دڕندەیە، نیمچە ئاژەڵێکە و ئەقڵی تا بەری پێی بڕ دەکات. لە ساڵی شەستەکاندا (دەنگی برێك گڕ کرد)، لە شیمال پێشمەرگەکانی بارزانی (مەبەستی عەلی پێشمەرگە بوو، بۆیە من بۆم راستکردەوە) کەچی ئەو گوتی: دەزانم (ئەو ئەحمەقە وادەڵێت، ئەی ئەوە نییە وەك ئەو سەگبابە قسە دەکەم) پێشمەرگە لە شەڕێکدا کلۆکیان پێکا و سەقەتیان کرد، بۆیە رقی لە کوردە..

بۆ سبەی دەریانکردینە بەر هەتاوەکە، روانیم نزیکەی ٢٠- ٢٥ زینندانی لەحەوشەکەدا، کە هەر هەموویان کورد بوون، لەبەر هەتاوەکە وەك رەوە سەگلاوییەك لەقوولایی دەریا دەربچێت و بەسەر لمی رۆخی ئاوەکەوە چۆن لاڵ و پاڵ لێی دەکەون و سەر دەخەنە سەر پشت و سکی یەکتر و دەنووزێنن، بەندییەکان لەحەوشەکەدا بەو شێوە خۆیان داببووە بەر هەتاوەکە، دوودوو سێ سێ سەریانکردبوو بەیەکدا و بە چپە دەدوان، کە خۆرەکەش تینی بۆ دەهێنان روویان لە سێبەری دیوارەکە دەکرد، وا دیار بوو عەریفی ئێشکگر، لەترسی ئەفسەرەکەدا بوو تێیدەخوڕین و هەڵیدەساندن بۆ بەر هەتاوەکە.

لەبەرهەتاوەکەدا لەسەر لا راکشام، ئانیشکم بەسەر دۆشەکە تەنکەکەوە چەقاند و لای چەپی روومەتیشم خستە سەر لەپم وەك راوچییەك پارێزی لەبەرازێکی یەکانە کرتبێت لەپارێزدا بووم و بە خەیاڵ وێنەی ئەفسەری ئێشکگرم دەکێشا.. ئێستە دێت، ئەو پیاوێکی

بسته بالای گۆشتنی چاو کەوردی سمێل شۆڕی قەبیح و شەلە.. ئاخر ئەفسەرە دەسکردەکانی سەدام زۆربەیان گەڕوگول و کورتەبالاَ و ناشیرین بوون، نەو..نەو، ئەو رەشتاڵەیەکی بالا مامناوەندی لەڕولاواز و ئێسك تالّی ئێسقان ئەستووری شەلە، ئەی کێ دەڵێت پیاوێکی سوور و سپی قەڵەم رێکی شەل نییە؟ من بە هەموو شێوەیەك، بە خەیاڵی هونەرمەندێکی دەسرەنگین و لێهاتوو وێنەی ئەو درندەیەم رەنگرێژ دەکرد و دەمخست بەلاوە، تا وایلێهات وێنەکان هەموو تێکچڕژانە ناو یەکدا و بەتەواویی لێمشێوا، بۆیە هەمووم درین و هەڵپلامەوە سەر ئەولام، جگەرەیەکم داگیرساند و بەدەم مژلێدانەوە بە نیازبووم دەم و لووت و چاوەکان جێگۆڕکێ پێبکەم و وێنەیەکی نوێم چنگ بکەوێت..

دەنگی عەریف رایچەڵەکاندم. عەریف فەرمانی هەڵسانی دا: هەڵسن..

لەگەڵ هەڵساندا روانیم ئەفسەری ئێشکگر لە دەرگاکە وەدەرکەوتووە و بەرەولای ئێمە دێت، بەلاّم سەیر لەئەوەدا بوو ئەو چەند وێنەیەی کە بۆم کێشابوو، بە وێنە سۆنتاژکراوەکەشەوە، جگە لە شەلییەکەی، کە لەدەمی عەلی بیستبووم، هیچی تۆسقاڵێك بەلای ئەودا نەچووبوو!!

ئەو کابرایەکی بالاّبەرزی گۆشتنی جۆڕەنگ و چەناکەپانی رێوی چاو بوو. دەتوت شەویلاکی بەچەقۆ بۆ ژێر دوو تاکە نەعل، کە گوێکانی بوون، هەڵدڕاوە و ناوچاوانی دوو سێ لۆچی کشتەك ئاسای تێکەوتووە، وەکو هیتلەر سمێلە ماش و برنجییەکەی بەقەد دوو دەنکە فاصولیا ئەملا و ئەولای کونە لووتە فشەکانی تێپەڕاندبوو بەلای راستدا کەمێك دەلەنگی، کە وردتر لە رووخساریم روانی، رووخساری بنیادەم نەبوو، بەڵکو خشتێکی لاکێشەی زیادسورەوە کراوەیە و بە دەستی نەزانێك چاو و دەم و لووتێکی ناقۆلاّی لەسەر نەخشێنراوە. کابرا میرغەزەبێك بوو بۆ خۆی، تا گەیشتە نزیك بەندییەکان دارە خەناوییە کرنج کرنجەکەی بە دەستی راستەوە هەڵدەدا و دەیگرتەوە. بە پێش ریزە بەندییەکەدا رۆیشت و لەپشتەوە هاتەوە، دووبارە لەسەرەوە گرتی و بەدەم پانکردنەوەیەکی قێزەونانەوە، یەك لەدوای یەك لێیپرسین: ناوت چییە؟ خەڵکی کوێیت؟ چەند رۆژە لێرەیت؟ کە وەلاّمی دەدرایەوە نووکی دارەکەی دەستی توند دەکوتایە سنگی بەندییەکە و شێتانە پێدەکەنی، کاتێك پێدەکەنی دەمی وەك دەمی مرۆڤ نەدەبینرا، بەڵکو دەبوو بە ئەشکەوتێکی گەوردی دەم دووکەڵکرتوو. ددانەکانی وەك برێك بەردی رەشهەڵکەراو بە زاری ئەشکەوتەکەوە دەبینران، کە نەبە.. ئەشە کریکەناوییە بووەوە، بە دەنگێکی کڕ و ناساز داوای لە خوێندەوارەکان کرد جیا ببنەوە. پێنج

کەس لەبەندییەکان جیابوونەوە. بە ریز رایگرتن و هەمان پرسیاری پێشووی یەك لەدوای یەك لێکردینەوە، هاوکات لەگەڵ وەڵام بیستنیاندا، بە پەنجە ئەستوور و زبر و درێژەکانی، لووتی بەندییەکەی دەگرت و بە هەموو هێزی خۆی رایدەتەکاند، وا رایدەتەکاند بەندییەکە بەدەم زەبری پەنجەکانییەوە دەنووشتایەوە، کە لێبووەوە شەقاوێك دووریان راوەستا و بەهەمان دەنگی گڕ و ناساز پرسی: ئێستە ئێوە دەرچووی کۆلیژن، وانییە؟

ئەوان هەموویان لووتیان سوور هەڵگەڕابوو، ئاو زابووە چاوەکانیان، کەسیان وەڵامیان نەدایەوە. هاتە پێشەوە لێیان و قیژاندی: سەگبابینە، بڵێن بەڵێ.. هەموو بەیەك دەنگ وتیان: بەڵێ. ئینجا کەمێك وەرچەرخا و لەپی دووسێ جار کوتایە بان قوونی خۆیدا و وتی: ئێوە خەریجن، وانییە؟ ئێوە خڕووجی ئاااا ئەم قوونەی منن.. و پێکەنینێکی هیستریایی بۆ کرد، هەڵگەڕایەوە بەرەو دەرگاکە و رۆیشت..

من بێزاریی وەك دێوەزمەیەك بە سەر سینگمەوە چۆکی دادابوو، ئەوەندە وەڕسببووم مەرگی خۆمم بە ئاوات دەخواست. بۆ شەوەکەی بە سێ قۆڵی دانیشتبووین، پرسیارەکانی شەوی پێشوو سەبارەت بە گەورەیی و بەرفراوانی سەربازگەکە و دوور و نزیکی زیندانەکە بۆ دەرەوە لە (عەلی عارب)م دووپات کردەوە.. دیار بوو ئەو تەواو لە مەبەستم حاڵی ببوو، بۆیە بە وردیی بەر چاومی روون کردەوە. پاش کەمێك بێدەنگی وتی: ئەگەر نیازی هەڵهاتنت هەیە دەتوانم رێگات بۆ خۆش بکەم و لە سەربازگەکە دوورت بخەمەوە، لەوێشەوە شەش حەوت کاتژمێرێك بە پێ بڕۆیت، دەگەیتە دێهاتە کوردنشینەکان.

ئەو دێهاتە کوردنشینانەی کە من مەبەستم بوو گوندی (نارێن و گەلابات)بوون، بەتایبەتی دێی نارێن، کە خزم و کەسی خۆمی لێبوو. عەلی ئاسانکاریکانیشی بۆ باس کردم، کە چەند رۆژێکی دەخایاند و رێیشی تێدەچوو خۆم دەربازکەم، پاشان وتی: ئەوەش دەزانم ئەم کارە، سەرچڵییەکە و بۆ هەردووکمانیش خەتەرناکە، سەرباری ئەوەش، ئامادەم ئەو سەرچڵییە بکەم، من پێمگوت: تۆ خەریکی کاری خۆت بە..

دوو شەو و رۆژ بە سەر ئەم را و تەکبیرەدا تێپەڕی و سێهەم شەو لە حانووت گەڕایەوە، کە دانیشت بە دەم زەردەخەنەیەکی شیرینەوە، کە سەرتاپای لەگەڵدا دەخەنی پێیوتم:

+ ها چیت وت؟

- بۆ چی؟

+ مەسەلەی هەڵهاتنەکەت!

بەکەمێك گومانەوە روانیمە رووخساری و لە ناکاودا و لە ناخەوە هەستێکی سەیرم لەلا پەیدابوو، کە هەقی خۆم بوو بەگومانەوە بڕوانمە ئەو بڕیارە ناوەختەوەی عەلی، ئاخر ورووژاندنی کوتوپڕی بابەتێکی وا هەستیار و چارەنووسساز بەئەو هەموو زەوق و شەوق و رووخۆشییەوە دەبوایە ببێت بە جێگەی گومانم.. تۆ بڵێی ئەم کابرا عارەبە ئەمنە تەڵەیەکی بۆ نەنابێتەمەوە؟ تا شەوێك بمدات بە قلپەیەکدا و وەکو دەسەگوڵێك لە ناو کلاوێکی تەپیودا پێشکەش بە بەرپرسەکەی خۆیم بکات؟ بۆیە پێموت:

- نا..نا، جارێك شتی وا لە بیری خۆت ببەرەوە..

+ بڕوات هەبێت بۆ دەربازبوونت رێگایەکی زۆر ئاسانتر لەوەی کە پێری شەو لەسەری رێککەوتین شك دەبەم، چۆن هەر ئێستا هەڵبسیت بچیتە ژووری سەر شۆرکەکە و بگەڕێیتەوە، ئاوا بە ئاسانی دەردەچیت و ئازاد دەبیت، خۆت ئامادەکە سبەی کاتژمێر دە بۆ دوانزەی نیوەڕۆ خواحافیزیت لێدەکەم!!

من گومانەکەم خەستتر بووەوە، نەك هەر خەستتر، بەڵکو گومانم نەما لەوەی کە گەمەیەکی بە دەستەوەیە، ئەگەر وریای خۆم نەبم زۆر بە ئاسانی ملم دەکات بە پەتەکەوە، بۆیە بەدەم هەڵچوونەوە پێموت:

- دەزانی تۆ قسەی پووچ و بێمانا دەکەیت؟ بڕوابکە گەر دەمی ئەم باسە دانەخەیت ژوورەکەت بە جێدەهێڵم و دەچمە قاوشەکە، هەلاتنی چی؟ من گاڵتەم لە گەڵتا کرد و تاقیتم کردەوە، بەسییەتی.

عەلی کە زانیی تەواو تەنگاوی کردووم بەدەم پێکەنینەوە باوەشی پیاکردم وتی:

+ کوڕە شێتە منیش دەڵێم هەلاتنی چی؟ بەر لەوەی بێمەوە ئەفسەری ئێشکگر پێیڕاگەیاندم و وتی: لێبووردنی گشتیمان بۆ دەرچووە!!

بۆ سبەی لەگەڵ خواحافیزیکردندا ئەو (مرۆڤە عارەبە) باوەشی پیاداکردم و گوشیمی بە سینگییەوە و بەدەم نەرمە پێکەنینێکەوە وتی:

+ ئەوەتا لە زیندان دەرچووی، بەڵام ئیتر سەرچڵی مەکە و لەبەر خاتری منداڵەکان و دایك و باوکت خۆت بپارێزە.

من پێموت: بەشبەحاڵی خۆم لە زیندانێکی گچکەوە دەگوازرێمەوە بۆ زیندانێکی گەورە و بەرفراوان، زیندانێك ناوی (عێراق)ە.

**تەواو**